# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە
ئەمیندارێتیی گشتیی رۆشنبیریو لاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

ژمارە 8 ئایاری 1983



لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ت : 20882

### چاوێکی تر لە ژێر ڕۆشنایی وتەکەی سەرۆکی فەرماندە «صدام حسین» دا دەربارەی ڕۆشنبیری کوردی :

# ئەو دەرسانەی کە دەبێ لە وتە

ئەوەی ئاشکرایەو روونە بۆ هەمووومان کاتێ سەرۆکی فەرماندە دەربارەی بارێك یا مەسەلەیەك دەدوێ ، بە تەواوی لە هەموو لایەکەوە لێی دەکۆڵێتەوەو بۆی دەچێ ، وەك شارەزایەك یا خود پسپۆرێك چارەسەر بۆ گیروگرفت دە

دۆزێتەوەو بە شێوەیەکي روون‌و سانا پەردە لە رووی راستی لا دەدات‌و لە ئەنجامدا دل دەرفێنێ‌و عەقل بە شێوەی چارەسەر کردنەکە دەسەلمێنێ . گەلێ جاریش سەرۆکی فەرماندە یەکەوسەر دەچێتە ناو کاکلەی باسەکەی بێ ئەوەی پشت بە پێشەکێیك یا سەرەتایەك ببەستێ کە چی سەرەڕای ئەوەش ئەنجام بە شێوەیەکی ئاسایی‌و لەروو بۆ گوێگر دەردەکەوێ وەك شتێکی ئاشنایی لە گەڵدا هەبێت .

سەرۆکی فەرماندە لە ئاخافتندا شێوەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بە قولایی تەفاعولی لە گەڵ گەلدا ، قولایی موعاناتی لە گەڵ ئێش‌و ئازارو داواکانی گەلدا لە قوناغ‌و باری جۆراو جۆر کە پێ ی تێپەڕ دەبێت ، بە هەموو ناکۆکی‌و ئالۆزی‌و ماندوو بوونیەوە «لە رۆژانی درێژیدا» .

بۆیە سەیر نی‌یە لە لامان کە سەرۆکی فەرماندە دەبینین چۆن ووشەکانی وەك ئاوێنە ویژدانی گەل پێشاندەدات لە کاتی خۆشی‌و ناخۆشی‌دا . چونکە بە درێژایی ژیانی خەباتکارانەی

درێژیدا لە گشت ئێش‌و ئازارو ئاواتی هەموو دەستەو چینەکانی گەل گەیشت‌و لە ئەنجامدا ئەو هەموو ئازارو ئاواتانەی لە ناو دڵە مەزنەکەی خۆی جێگیر کردو باوەشی بۆی کردەوەو کاتێ سەرکردایەتی حیزب و دەوڵەتی وەرگرت شارەزایانە دەستی کرد بە چارەسەرکردنی گیروگرفت .

کە سەرۆکی فەرماندە لە کاتی لێکۆڵینەوەی کارنامەی دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردیدا دەستی‌کرد بە قسەکردن ، لە ئاخافتنەکەی گەلێ راستی دەست نیشان‌کراو دەرسی یەکجار بە نرخمانی پێ بەخشی کە بە پێویستی دەزانین ئەو دەرسانە بکەین بە دەستووری کارکردن‌و بەرهەم هێنان‌و ئەو هەڵوێستانەی پێویستە لە سەرمان بینوێنین لە عیراقیەتیمان‌و لە تایبەتێتیماندا لە عیراقدا . لەو دەرسانە :

1 ـ نووسەری کورد کاتێ تایبەتیە نەتەوایەتیەکانی خۆی دەردەبڕێت مافێك لە مافە ڕەوا کانی خۆی دەخاتەکارو ئەرکێك لە ئەرکەکانی سەرشانی رادەپەڕێنێت . چونکە نەتەوەکەی بە ماف ڕەوای خۆی دەزانێ داوا لە هەموو رۆڵەکانی بکات بۆ ئەوەی بە تەواوی لە بنچینەکانی بوونی تێ بگەن‌و بگەنە رەگە مێژوویەکەی‌و کەلەپوورەکەی

ببووژێننەوە پاشان ئەبێ هەموو توانایەکیان ئامادە بکەن‌و بەکار بێنن بۆ پەرەپێدان‌و دەوڵەمەند کردنی بە شێوەیەکی راست‌و دروست‌و زانستیانە تا ئەو بنچینانە بناسرێن‌و روون ببنەوەو زیاتر رۆڵەکانی شانازی پێوە بکەن . ئەوسا

# بەنرخەکەوە فێری ببین

نووسەران ڕێگا بەرەو دووا ڕۆژێکی پڕ لە ئاوات و کامەرانی لە ناو دڵی هەموو کوردێك کە شانازی بە نەتەوەو کوردایەتی خۆیەوە دەکات ڕووناك دەکەنەوە ، بۆ ئەوەی زاڵ بن بەسەر گشت کۆسپ و تەگەرەیەك و خەباتێکی بێ ووچان بکەن بۆ هێنانەدی ژیانێکی خۆشتر .

2 ـ بۆ ئەوەی نووسەرانی کورد هەست بە ژیانێکی خۆش بکەن لە ژێر سایەی بارێکی ئاسایی و گونجاودا سەرکردایەتی ی سیاسی حیزب و شۆڕش لە عیراقدا بۆیانی جێبەجێ کردووەو تا بتوانن ئەرکەکانی سەر شانیان ڕاپەڕێنن و دەستکەوتی تر بهێننەدی ، پێویستە لە سەر کاربەدەست و لێپرسراوان هەموو هەڵوێست و کاریان

بگونجێنن لە گەڵ وتە بە نرخەکەی سەرۆکی فەرماندەو لەبەر ڕۆشنایی ئەو وتە گرنگەدا بجووڵێنەوە تا نووسەری کورد بۆی بلوێت چالاکانە کار بکات و تام و چێژ لە مافی خۆی لەم بارەیەوە وەربگرێت و . لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستی یەدا پێویستە کاربەدەست و لێپرسراوان دووبارە بەو یاساو فەرمانانەدا بچنەوەکە لە لایەن ڕێژێمەکانی پێشووەوە بۆ مامەڵە کردن لە گەڵ ووشەی کوردیدا

دانرابوون و بیانگۆڕن بە یاساو فەرمانی گونجاو لەگەڵ ئەو حاڵەتی بەربڵاوکردنەدا کە سەرۆکی فەرماندە داوای لە نووسەرانی کورد کرد مومارەسەو پەیڕەوی بکەن . چونکە ئەو کەسەی هەست بە قووڵی ی ڕەگ و ڕیشە

نەتەوەییەکەی خۆی نەکات ، ناتوانێ و بۆی ناکرێ بە هیچ جۆرێك هەست بە قووڵی ی ڕەگ و ڕیشە نیشتمانی یەکەی بکات . بۆیە خاوەن هەست و بیری نەتەوەیی لاواز بە هیچ جۆرێك نابنە بناغەیەکی قایم و چەسپاوی نیشتمانەکەیان . هەر وەها نابن بە هێزێکی کاریگەرو خزمەتێکی ئەوەتۆ پێشکەش بە نیشتمانە مەزنەکەیان ناکەن .

داوا کردن لە نووسەری کورد بۆ پەیڕەوکردنی حاڵەتی بەربڵاوکردن ڕوو بە ڕووی ڕێبازێکی بنیادنەری دەکاتەوە بەرامبەر بەو شتانەی دەری دەبڕێ و هەوڵی بۆ دەدات . بەڵێ لە سەر نووسەری کورد پێویستەو داوایشی

لێ دەکرێت وەك لێپرسراوێك خۆی بەرامبەر بە ووشەی کوردی بناسێت و دوورکەوێتەوە لە بەرەڵایی و هەڵوێستی چەوت و بیروڕای نالێپرسراوانەو لە ڕاستی و ڕاستگۆیی لانەدا .

3 ـ بەکارهێنانی دەربڕینی تایبەتێتی ی نەتەوەیی لە ئەدەب و هونەردا ئەبێ بە شێوەیەکی کراوەبێت . سەرۆکی فەرماندەش ئەم ڕاستی یەی درکاندو بە «نقوم بوون لە تایبەتێتیدا» ناوی برد ، چونکە نقوم بوون لە تایبەتێتیدا بە ناچاری دەبێتە هۆی شێوە وشك هەڵاتن و بە مۆمیا بوون و خۆ لە قاوغ نانێکی ئازار بەخشی بە ناو خودی خۆدا ، گرانترین نەخۆشیش کە تووشی کەسان و گەلان دەبێت ،

خۆ لە قاوغ نانو دووره پەرێزی‌یە کە بە تەواوی لە دوور بینیمان دەخاتو لەو گۆرانکاری‌یە خێرایانەمان دادەبڕێ کە لەم چەرخەدا بەسەر ئادەمیزادا دێن .

بەڵێ تایبەتێتی راست ئەو تایبەتێتی‌یەیە کە بیرو رای مرۆڤ بەند ناکات ، بەڵکو چەندین دەروازەی کراوە بەجێ دێڵێ بۆ بینینی جیهانێکی فراوانتر لە چوارچێوەی تایبەتیەت وەك چوارچێوە گشتیەکەی نیشتمانو هەموو دانیشتوانونیشتمان پەروەرانو تێکەیشتنی جۆری پەیوەندیو مامەلەکردن لە گەلیانا بە هەستێکی لێپرسراوانەوە کە هیچی کەمتر نەبێت لە کارکردن بە رێبازی تایبەتێتیدا .

4 ـ سەرۆکی فەرماندە دەرکی بەو راستی‌یە تاڵەش کردووە کە لە بارو دۆخی چەوتی سەردەمەکانی پێشووەوە بە میرات بۆمان مابوونەوە ، کاتێ باری نالەبار سەرانسەری کوردوستانی گرتبووەوەو گەلێ گیروگرفتو رووداوی ترسناکی لێ پەیدابووبوون لە ئەنجامی جۆری مامەلەکردنی چەوتدا لە لایەن دەولەتو کاربەدەستانی ئەو سەردەمەدا بەرامبەر بە شێوەی پەیوەندی نێوان هاوولاتیە کوردەکانو دەولەت ..

هەر ئەو جۆرە مامەلەکردنە چەوتە بەتوندی هانی هاوولاتیانی کوردی دەدا کە بە دەمارگرژی‌یەوە روو بکەنە تایبەتێتی‌ی نەتەوەیی . سەرۆکی فەرماندە ئیشارەتی بەم دیاردەیەشی داو ووتی : «کاتێ لە هاوولاتی‌یەك دەپرسم : خەڵکی کوێ‌ی ؟ . وەلام دەداتەوە : «گەورەم من کوردم» . منیش بەسنگێکی فراوانەوە وەلامەکەی وەردەگرم ، لە کاتێکدا هەمان وەلامدانەوە لە دانیشتوویەکی شاری بەسرە قەبوول ناکەم کە پێی بلێم : تۆ خەڵکی کوێی ؟ . وەلامم بداتەوە ! من عارەبم !» . لێرەدا زیرەکیو دوور بینی‌ی سەرۆکی فەرماندەمان بۆ دیار دەکەوێ کە چۆن باری سیاسی لە ژێر سایەی رژێمەکانی پێشوودا کارێکی سەلبی‌ی کردۆتە سەر دڵو دەروونی هاوولاتی‌ی کوردو هانی داوە بە پەرۆشەوە پێ لەسەر ناسنامە کوردی‌یەکەیو کوردێتی‌ی خۆی دابگرێ لەبەر دوژمنایەتیو بەربەرەکانی کردنی رژێمەکانی پێشوو دژ بە گەلی کورد .

بۆیە سەرۆکی فەرماندە داوای لابردنی هەموو ئەو دارو پەردووەی پێشووی کرد لەسەر بناغەی بەربلاوکردنێکی ئەوتۆ کە تایبەتێتی‌یەکە تێرو تەسەل بکا ، تا ئەو جۆرە زەللەکردنە لە ناواندا نەمێنێ کە سەرۆکی فەرماندە ئەو نموونەیەی وەك نوقومبوون لە تایبەتێتیدا لەسەر هێنایەوە .

5 ـ پێویستە لەسەر نووسەری کورد ، ئەو نووسەرەی چالاكو کاریگەرە لە بەرهەمەکانیدا هەوڵ بدات چارەسەرێك بۆ ئەو پاشماوە کەڵەکەبووانە بدۆزێتەوە بە مەرجێك لە گەل تایبەتێتی‌یە نەتەوایەتیەکەیدا بگونجێو عیراقیەتی کورد لە رووی مێژوویو کەلەپوورییەوە لە ئێستاو لە داهاتوودا دەر ببڕێت . چونکە گەلی کورد بە درێژایی سەدان ساڵ بە شێکی گرنگی گەلی عیراقی پێکهێناوە ، ئەو گەلەی کە لە قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا شارستانیەتێکی مەزنی دروستکرد ، جگە لەمەش کاریگەر بووە لە گشت رووەکانی ئەم شارستانیەتە ، وەك لایەنی رۆشنبیریو فیکریو ئەدەبیو هونەری .

ئا بەم جۆرە نووسەری کورد شان بە شانی گەلەکەی دەتوانێ بەردەوامبێت لە دروستکردنی شارستانیەتو دەولەمەند کردنی کەلەپوور بۆ ئەوەی کارەکەی ببێتە بابەتێك سەنگی خۆی هەبێت لە کاروانی عیراقی مەزندا بە گەلو سەرکردایەتیو بیرو باوەڕەکەی کە بەرەو شارستانیەتێکی فراوان دەچێ لە گشت عیراقدا .

6 ـ لەم روانگانەیشەوە رۆڵی نووسەری کوردی پێشکەوتنخوازمان بۆ دەردەکەوێ ، ئەو نووسەرەی رۆڵێکی پێشرەوانە لە نێو گەل دەنوێنێو وەك ئامێریکی هەستیار قازانجو زیان بە گەل لێك جیاواز دەکاتەوەو

هەروەها هەست بە ڕێڕەوی ناپاك و پیلانگێڕ دژ بە ریزی گەل دەكات كە چەند شەپۆلێك لە دوژمنانی گەل هەڵیدەگرێت و نەخشەی بۆ دەكێشن .

نووسەر وەك مرۆڤێكی پێشڕەو و ژیر و ئازا ڕۆڵێكی تایبەتی دەبینێ لە بەرزكردنەوەی شتی ڕاست و دروست بۆ پەیرەوكردنی و شتی خراپ و چەوت بۆ لابردنی و لەناوبردنی . ئەم ڕۆڵەش، تەنیا لە ڕێگای بەكارهێنانی ڕاستی و ڕاستگۆیی كە لە دوو ڕێگەی هاوتەریبەوە بەدی دەكرێن . یەكەمیان ! لە پەیرەوكردنی ئەو هەڵوێستانەی ئەبنە پاڵپشتی هەوڵ و تەقەلای میری بۆ پاراستنی وولات و نەخشەكانی بوژانەوە و پەرەپێدان لە چنگ ئەو دوژمنانەی كە چاویان تێ بریوە ، وە دیارترین نموونەیش جەنگە ڕەواكەمانە كە دژ بە ڕژێمی خومەینی ڕەگەز پەرستە دەكرێ ، ئەویش بە دەست نیشان كردنی كردەوە باش و چاكەكانی میری و ئەو دەسكەوتانەی بۆ گەلی عیراق بە تێكرایی و گەلی كورد بە تایبەتی هێراونەتە دی .

دووەمیشیان : دەستنیشان كردنی گیروگرفت و پەیرەوكردنی ڕەخنەی سوود بەخش بە شێوەیەكی وردو قوڵ و هێمنانە لە هەموو ئەو شوێنانەی كە هەست بە بوونی كەم و كورتی تیادا دەكرێ ، ئەویش بە دڵسۆزانە و مەوزوعیانە و لە ڕێگەی ئەو ڕیبازە ڕەوایانەی كە پەیوەندییان بە دەوڵەتەوە هەیە ، لە گەڵ پێشكەش كردنی پێشنیازی بەجێ و پڕ لە چارەسەری بۆ ئەو گرفتانەی كەوا ئەنجامی كرداری ڕەخنەگر تندا دەردەكەون و دەستنیشان دەكرێن .

مرۆڤی ڕاستگۆ ئەو كەسە نیە كە هەر تەنیا لە شتی چەوت و ناڕێك دەدوێ و دووبارەی دەكاتەوە و گەورەیان دەكات و لە ئەنجامدا لاوازی دەخاتە ڕیزی گەل و خواست و ئاواتە بنیات

نەرەكانی دەشلەژێنێ و ورە بە خەڵك بەردەدات و چەترێكی تاریك و ڕەش بۆ خەڵكە هەڵدەدات . هەموو شتە چاكەكانیش لە ژێر هەورێكی ئەستوورو ڕەشدا دەشارێتەوە بەمەبەستی ئەوەی ڕاستی لە خەڵكی بشارێتەوە و لەبەر چاویان بزری بكات ، بەم جۆرە دەتوانین بڵێین ئەو مرۆڤە ڕاستگۆیە دەبێتە دۆستێكی نزیكی دوژمنان و یارمەتی یان دەدات دژی نیشتمان و وڵاتەكەی بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بكات .

ئەمەو ئیمڕۆ ڕۆشنبیری كورد مەیدانێكی فراوانی لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی كە دەستكەوتەكانی شۆڕشی 17ی تەمووز بە چاكی بەدی بكات ، ئەو دەستكەوتانەی سەرانسەری عیراقی گلاتۆتەوە و گەلی كوردیش لێی بێ بەش نەبووە . نووسەری كورد بۆی هەیە بە سەربەستی قەڵەمەكەی وەكار بخات .

ژیاندنەوەی ڕۆشنبیریی كوردی و دەوڵەمەند كردنی لقەكانی تری ، بە تایبەتی دوا بەدوای بەیاننامەی «11»ی ئاداری ساڵی 1970 ، هێند زۆرو جۆراو جۆرن پێویست بە ئیشارەت و بەڵگە ناكات .

گەشەكردنی عیراق لە بواری سەربەخۆیی ئابووری و پیشەسازی و كشتوكاڵ و بازرگانی دا ، ڕادەی باری ژیان و گوزەرانی بە شێوەیەكی وا سەرسوڕهێنەرو لە كاتێكی كورت و تەسكدا بەرزكردەوە كە بەدەگمەن دەوڵەتانی جیهانی سێیەم پیدا تێپەڕیوون .

وە لە بواری زانیاری و فێركردنیشدا لە ماوەیەكی كورتدا ژمارە ی زانكۆیەكان و پەیمانگا بەرزەكان و پیشەییەكان و هەموو قوتابخانەكان یەكجار زۆر بوون .

ئەمە جگە لەوەی كە لەبواری هێزی بەرگریشدا هێزەكانمان بوونە جێی سەرسووڕمانی دۆست و دوژمنان لەكاتی سەركەوتن و خۆڕاگرتنیاندا لە جەنگی قادسیەی «صدام»دا ئەو جەنگەی خەریكە سێ ساڵ لە تەمەنی دا تەواو دەبێت ..

ئا ئەمەیە كە ئیمڕۆ مزگێنی گەورەو فراوان بە دوا ڕۆژێكی خۆشترو ئاواتێكی مەزنتر ڕادەگەیەنێ .

**«دەستەی نووسەران»**



# شێخ لەتیفی حەفید

نۆرخانی غالب

شێخ لەتیف کوڕی سەرکردەی بە ناوبانگی کورد شێخ مەحموودی نەمرو کوڕی شێخ سەعید کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ ، کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە کە یەکێك بووە لە زانا ئایینەکانی کوردستان .

شێخ لەتیف لە ساڵی 1917 ز ـ لە شاری قارەمانان و پڕشکۆی سلێمانی لە بنەماڵەیەکی بە ناوبانگی کورد پەروەرو دین دارو ئەدەب پەروەر هاتۆتە دنیاوە ، لە سەردەمێکی پڕ لە کارەسات و تەقینەوەی مێژوویی‌دا چاوی ژیانی هەڵهێناوە . خودا لێ خۆش بوو ئەحمەد تەقی ئەلێ : « ئەم خێزانە خانەدانەی شێخ مەحموود پتر لە (150) ساڵە لە کوردستاندا ناوبانگیان بڵاوەو جێگایەکی تایبەتیان هەیە . هەموو کوردستان و بە تایبەتی لە لادێکاندا بە چاوی رێزو پیرۆزەوە تەماشای هەموو وەچەیەکی شێخ مارفیان کردووە » . ناوبراو بەم جۆرە لە سەر باسەکەی دەڕواو دەنووسێ : « نەوەکانی شێخ مارف نەك هەر لە ناو کوردستاندا رێزیان ئەگیرا بەڵکو لە لایەن کاربەدەستانی عوسمانیشەوە حسابیان بۆ ئەکرا ، بە رادەیەکی وا کە سوڵتان عبدالحمید ی دووهەم شێخ سەعیدی حەفیدی بە میوانی بانگ کرد بۆ ئەستەموول شێخ مەحموودیش کە هێشتا منداڵ بوو لەم گەشتەدا بەشداری کرد .»[1]

هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سێ ساڵان ، دوای بە دیل گرتنی ( شێخ مەحموودی قارەمان ) بە خاوو خێزانەوە روویان کردە نیشتمانی ژووروو واتا : باکوری رۆژ هەلات لای سمکۆ ( ئیسماعیل ئاغای شکاك ) . شێخ لەتیف لە تەمەنی سیازدە ساڵی‌دا بوو لە ساڵی — 1930 — دا بەشداری بزووتنەوەی خەباتی چەکدارانەی شۆڕشی کوردی کردووە . لە ساڵی — 1942 — دا لە لایەن حکومەتی کۆنەویستی پاشایەتی گوێز کراوەوە بەلام دەستگیر نەکراو خۆی گەیاندە کوردستانی ئێران ، دوای ساڵێك گەڕایەوە .

بەڕاستی هەست و نەستی ئاوێنەیەکی بێگەرد بووە بەرانبەر وولاتەکەی ، بیروو باوەڕی نیشتمانی و کۆمەلایەتی بڵاودەکردەوە . ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر مشت و ماڵ کردنی ژیانی سیاسی کە بچێتە ناو بنج و بناوانی ژیانی کۆمەلی رەش و رووت و هەژاران .

تەمەنی (20) بیست ساڵان بوو پارتێکی رامیاری دامەزراند بە ناوی ( کۆمەلی برایەتی ) یەوە کە هەموو توانایەکیان بۆ رزگاری گەل تەرخان کردبوو دژی هەموو جۆرە چەوساندنەوەی نەتەوەیی . وە لە کاتی دامەزراندنی [ پارتی دیموکراتی کورد ] لە ساڵی 1946 دا بە جێگری یەکەمی سەرۆکی پارتی هەڵبژێردرا . بە هەموو توانایەکەوە لە دروست کردنی کۆماری جوانەمەرگی مەهابادا بەشداری کردووە .

گرتن و دەربەدەریی و راونان و دوور وولاتی زۆری چەشتووە ، گیراوەو لە شاری بەصرە خراوەتە بەندیخانەوە تاکو تەقینەوەی راپەرینەکەی 14ی تەمموزی 1958 ماوەتەوە . ئەم شیعرەی لە گرتوخانەی ناوبراودا وتوویە :

رۆژ لەبەر فرمێسکی چاوو شەو لەبەر ناڵانی دڵ
ئێشی چەند زۆرە برین و داخی خەمخوارانی دڵ
واپلوسکی بەستووە فرمێسك خوێناوی جگەر
سەیرە ئارایش ئەکەن بەو خوێنە خوێنخوارانی دڵ

ئێمه لێرەدا وەك شاعیرێك باس لە شێخ لەتیف دەکەین .
لە ژیانیا وەك نەختێ لەمەوبەر وتمان ئاوارەو دڵ پڕ زووخاو بووە ، هەمیشە خەم هاوڕێو ئەنیسی بوو ، ئەو کارەسات و ڕووداونەی کە لە ژیانی ڕۆژانەی‌دا ئەی دی کاری کردۆتە دیوی ناوەوەی دڵو دەروونی . شیعری (سکالا) باشترین نموونەی ئەم لایەنەیەتی و دەڵێ :

**هەمیشە لانە شێواوو دڵ شکاوم**
**ببینە ، ئەشکی حەسرەت دێت لە چاوم**

**هەناسەی ئاگرینی توێی دەروونم**
**نیشانە بۆ دڵو جەرگی سووتاوم**

**بەڕوو خۆشیم نەکەی بڕوا عەزیزم**
**وەرە سەیری دەروونی پڕ زووخاوم ل / 43**

لە بارەی شیعر هۆنینەوەو گەڕان بە شوێن ناوەڕۆك‌دا دەسەلاتێکی بەرزی شاعیرانەی پێوە دیارە . شاعیر دڵدارو دولبەرو عاشق بووە ، جوانی خۆش ویستوە ، بەلام عاشقێکی زەمینی ، دوور بووە لە ئاسمان و خەیالی سۆفیزمی ، لە مەیدانی شیعری دڵداری‌دا شوێنێکی گرنگی وەرگرتووە تەعبیرو وێنەکانی سەرکەوتووە وەك :-

**ئەو گرو کاڵەی کە ئێستە دڵ خەریکە فێر ئەبێ**
**وابزانم لێوی تۆ بمژێ تەواوی تێر ئەبێ**

**هەر بە سلوایی بە سێوی ئاڵەوە فێرە دەمی**
**بۆیە هەرکەس حەز بە ڕەنگی ئاڵە ، ئاخر خێر ئەبێ ل / 70**

ئەمەشیان وێنەی ئەو دڵداری‌یەیە کە شاعیر بۆ ئەو پەرییە دێوانە بووەو خۆشی گەرەکە .

**گەردنت مەرمەڕ وەکو کێلێك بشێ بۆ گۆڕەکەم**
**جەننەتچی ، وا ئەزانم مەیلی حۆری هەر نەکەم ل / 73**

بە بۆنەی کۆچی دوایی ( شێخ لەتیف ) ەوە خەم ئەوەندەی تیرێك لە دڵی دۆستێکی کاریگەر بوو ، دڵو دەروونی ئەم دۆستەی هەژاندو بە چاوی فرمێسکاوی‌یەوەو بەدڵی غەمگینەوە بە غەزەلێك شینی بۆ دەکات ئەمە تەواوی تێکستی شیعرەکەیە .

**بۆ بەقینی‌لێم ئەی فەلەك چیت لێم ئەوێ ؟!**
**دەستی جەورو نالەباریت لەحظەیەك بۆ نەسرەوێ ؟**

**کەی تەمەننام بوونی تۆیە ، نامەوێ قەت دێنت ،**
**چیت لە قەومی ئێمە داوە یارەبی کۆستت کەوێ**

غەدرە لای تۆ ئاوەدان‌بێ خانەی = ئەهلی وەفا = ؟
بابمێنێ = باوکی کاوە = دەك سەری بەرزت نەوێ .

بۆچ فراندت وابەزوویی ؟ کەی مروەت وا ئەبێ ؟
شەوکەت و شانت نەمێنێ ، نامرادی جێی کەوێ

ساخوایە ، ئەم نزایەی = دۆڵە چەوتی = وەگری
ڕەحم و عەطفی خۆت نصیبی شاهی ئێمەش بێ لەوێ ل / 76

دیسان هەر لە = دۆستێکەوە = لەبەشێکی تری دیوانەکەی‌دا ، ئەمجا دۆستەکەی هەر ئەو دۆستەی پێشوویەتی یا کەسێکی دی [3] بەداخەوە نازانین ، لایەنی ئیجابی ئەو کردەوانەی دەردەخا کەبیری تیژو ڕۆشنبیری قووڵ و هەڵوێست و باری ژیانی شاعیرمان بۆ دەگێڕێتەوە -

لە ئاوارەیی و دەست بەسەری‌دا
لە ووتەی ڕاستی کورد پەروەری‌دا

لە بەندیخانەو پێوەندو کۆتا
لە ژێر دەستەیی وولاتی خۆتا

لە قسەی خۆش و سوحبەت و باسا
لە گەڵ هەناسەی کەسی کەساسا

لە ووشەی ئاشتیو خۆشەویستیدا
لە تەنگانەدا ، لە پێویستیدا

لە ناو ژیانی دێهاتی کورددا
لە گەڵ زەبوونیو نەهاتی کورددا

لە ناو زانینو زاناو دلێردا
لە بەخشندەیی پیاوی چاوتێردا

لە خێر نەدیوی‌و جوانەمەردا
لە پادشاییو لەبێ بەرگیدا

وێنەی [ شێخ لەتیف ] زۆر جوان ئەبینی
تێ ئەگەی چۆن ژیا چۆن ڕابوورد ژینی ل / 80 — 81

ئـەم شیعرە سـووكو ساكـارەی لە ڕووی مەبـەستو ناوەڕۆکەوە بریتییە لە هاندانی ڕۆڵەی وڵاتەکەی بۆ پێشخستنی نیشتمانو چوونە ناو مەیدانی خەباتو زۆرانبازی لە نێوان ئەو دواکەوتوویی‌و پەیوەندییە نارێکانەی کە لەناو خۆدا هەن ، بە تایبەتی دوو دڵیو مەیخواردنەوە کە بە پەتـاو نەخـۆشییەکی پیسو کوشندەی هەرە نارەسـەنو ناهـەموارو نـاگوزووریو پـاشەکشـێی بـاری ژیـانی کـۆمـەڵی کـورد دادەنێ وەك لە سروودی ( ئەی کوردی فەقیر ) کە هەمووی ئامۆژگارییە . ئەوانەی بەلای شاعیـرەوە دەبێ کەسـانی شۆڕشگێـڕو چاو نەترس بنو مەرگی خۆیـان پێش مەرگی کـۆمەڵ بخـەن ، بۆ ئەمەیش بە یەکگرتنو دەست خستنە ناو دەستی یەکدییەوە میللەت پێش دەکەوێ کە هەموو مـرۆڤێکی پێشکەوتنخـوازی خەڵکی دونیا لەسەر ئەو باوەڕەن کە هیچ شتێك بەبێ هاوکارییو پێشکـەوتنو شارستـانیەت نـاکرێ ، شـارستانیـەت یەعنی هاوکارییو بەیەکەوە ژیان .

لە کۆپلەی یەکـەمو دووەمی شیعرەکـەدا دەنووسـیو دەڵێ :

**ئەی کوردی فەقیر بۆچی ئەسیری ؟**
**بۆچی گیرۆدەی بەندی زنجیری ؟**

**برا گەل بێنەوە بە یەکجار**
**بشکێنن تەوقی غەدار**

**کوردە وەرە بڕوانە**
**خاکمان هەموو وێرانە !**

**تاکەی دوو دڵی ؟ دڵ پیس لەگەڵ یەك**
**زڕەی فنجانی مەشروبات بە پێك**

**دەست بەنە دەست یەك ، ئێوەو خواتان**
**بۆ پێشکەوتنی خاکی نیشتمان**

**کوردە بڕوانە**
**خاکمان وێرانە ل / 31 .**

شێخ لەتیف لە ڕۆژگارێکی کەڵێ ئاڵۆزو تفتو تاڵی دواکەوتوویی کۆمـەڵی کوردا ڕابیواردووە ، ئەم نەهامەتیو بێ ئارامیو تەنگو چەڵەمەیە ڕەنگی لە ناوەڕۆکی نەژادی شیعرەکانیدا بەگشتی داوەتـەوە وەك ژیانی خـۆی لە شیعری ( تـەمـەنی ژین ) ە کەیدا بەیان کردووەو تیایدا گوتوویەتی :

**سەدو چوار جەژنە ، تەمەنی ژینم**
**جەژنێکم نەدی ، خۆشی ببینم**

**یان لە غەریبی ، یا بەندیخانە**
**یان دەربەدەر بووم ، لەم وولاتانە**

**ئێرانو عێراق ، هەتا باش قەڵا**
**وەك خێڵی قەرەج ، کەڕۆك تەوەلا**

**یان باوك ئەسیر ، یان خۆم فێرار بووم**
**بە دەست بەسەری ، خاوەن ئازار بووم**

**بەسزای دوژمن ، بێ وەفایی دۆست**
**ڕیشەی کەنجێتیم دەرهێنرا لە پۆست**

جەژنێکم نەدی ، بە درێژی ساڵ
لای باوکو دایکو عەشیرەتو ماڵ

هەر ڕۆژ لە شاخێ ، هەر ڕۆژ لە دێیە
هەر ڕۆژ وولاتێ ، ساتێ لە جێیە

چەند سەگی دێهات بەمن وەڕیوە
چەند سەرماو گەرما ، نەخۆشیم دیوە

دیداری خزمو ئەولادو منداڵ
بووەتە خەیالات شتێکی مەحاڵ ل / 22 — 23

ڕاستیـان فەرمـووە : = مزگـەوت ئـەروخێ ، بـەلام میحرابی ئەمێنێ = شێخی ئەمریش بەهۆی بیروو باوەڕی کوردایەتیو مرۆڤایەتیو ژیانی سیاسی نیشتمانپەروەرانەیو شیعرەکانییەوە توانیویتی ئەمری بۆ خۆی بستێنێو بۆ هەتا هەتایە دیمەنو ڕوخساری تایبەتی خۆی پێوە دیارەو مـۆرکی مرۆڤێکی ئەم گەلی کوردە ئەنوێنێ .

لەم دوو تاکە شیعرە دلگیرەی کە هەم ڕواڵەتی جوانەو هەم ناوەڕۆك . لەژێر وێنەکەیدا نووسراوە .

ئەگەرچی مردن لاشە ئەستێنێ
خاك = گۆشتو پێستو ئێسقان = ئەڕزێنێ

پیاوی مەزنو هونەرمەندی چاك
هەتا هەتایە ئەژیو ئەمێنێ .

شیعری شێخ لەتیف بەسەر ئەم بابەتانەی خوارەوەدا دابەش ئەکرێن .

1 — نیشتمـانپەروەرێتی 2 — کـۆمـەلایـەتی 3 — دلداری = ئەڤین = 4 — کۆمێدی . گاڵتەو گەپ ، بابەتی پێکەنیناوی .

هـەتا لە ژیـانا بـوو حەزی بـە بـلاوکـردنـەوەی شیعـرەکانی نـەکردووە ، لە سـالی — 1975 — دا کۆمـەلە شیعرێکی بە ناوی ( گوڵی وەریو ) لە بەرگێکی قەشەنگو لەسەر کاغەزێکی نایابو بە (82) لاپەڕەی قەوارەی بە تاڵەوە

چاپکراو لە چەند ڕۆژێکی کەم خایاندا لە بازاڕی چاپەمەنی کوردیدا نەماو خەلکی بە تاسوقەوە لە شوێنی دەگەڕان .

ئەوەی شایانی باسە ، لەو چەندانەدا بەشێکیتر لە بەرهەمی = داستانێکی بە هۆنراوە .. داینـاوە = بە نێوی = گیاکەلەی کۆمەلایەتی = بلاوکـراویەوە . کـە لە لایەن ئەدیبی ناسراو مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم پێشەکی بۆ نووسراوە .

خوالێ خۆشبـوو شێخ لەتیف لە ئێـوارەی ڕۆژی هەینی 12 ی مایسی 1972 لە نەخۆشخانەی (الراهبات) لە بەغدا لە تـەمەنی (55) پـەنجاو پێنـج سالیدا شـەربەتی شـەهـادەتی نـۆشیو دوایی بـە خـەزانی ژیـانی هـات . تەرمەکەی براوەتـەوە سلێمانیو لە لایـەن خەلکی ئـەو شارەوە بەو پەڕی ڕێزو حورمەتو بە دلی تەنگییـەوە لە مزگەوتی گەورە بە خاکیان سپارد .

هەزاران دروودی پیرۆز لە گیانی هەرگیـز نەمـری شێخو لە هەمـوو ئەو مـرۆڤە دلسـۆزانەی تـەنـگ بـە شـەوەزەنگی دەبـەنگی هـەلەچنو تیشکی ڕوونـاکی دەخەنە سەر ڕاستە شەقامی ژیان .

## پەراوێزو سەرچاوەکان :

1 — یاداشتەکانی ئەحمەرتەقی ، ڕێکخستنو ئامادەکردنی بۆ چاپ ، جەلال تەقی ، بەغدا ، چاپخانەی ( سلمان الاعظمي ) ، 1970 ، ل / 16 .

2 — شێخ لەتیف شێخ مەحموودی نەمر ، گوڵی وەریو ، سلێمـانی ، چاپخـانەی ڕاپەڕین ، 1975 ، ل / 74 .

3 — لەو چەندانەدا بەخت یاربوو ، لەبـەر ڕۆشنایی تیشکی وتـارێکی ژیکەلەی بێکەندو کۆسپەوە دەرکەوت ئەم دۆستەی شێخ لەتیف خـوالێخۆشبـوو شێخ مەلا ئەسعەدی مەحوی‌یە کە بەنامەو بە شیعر یەکتریان لاواندۆتەوە . ( بـروانە : سـۆران مەحـوی ، = ئاومنـدە ئـەدەبی‌یـەکی ئـالۆزو ژیـانی ئەدەبی‌مان ! = ، پاشیەنـدی کوردی عێـراق ، پێنج شـەممە ، ژمـارە (2) ، 21 ی / نیسانی 1977 ، ل / 13 ) .

هەر بە یارمەتی مامۆستا سۆران مەحوی بۆ وەدەست هێنانی وەرامێکی یەك لایی لە ئاست ئەم دۆستەوە دلنیای کـردین ئەو شیعـرانەی لە دیـوانی ، گولی وەریو ، دا هەن ، چ ئـەوانەی شێـخ لەتیف بۆ دۆستی خـۆی کوتـوون وەچ ئەوانەی لەدۆستی‌یەوە پێ‌ی‌دا هەلگوتراوە هەمووی لە میانی مامـۆستا مـەلا ئەسعەدی مەحوی‌دا بووە کە لە جوانترینو بەزرترین سەرچاوەی خۆشەویستی یانەوە - ڕێزو وەفاو عەهد . و دلتەنگیو بێزاری لە دلەوە بۆ یەکدی هەلدەڕێژن .. ئێرە جێ‌ی ئەوە نی‌یە بۆیە بەپێویستمان نەزانی نموونەو بەلگەی لەمە زیـاتر بنووسینەوە .

4 — ووشەی (پێك) لە گەلا( یەك) لە تای ترازوودا ئاوەستن .

# صالح هەژار

ئامادەکردنی : لیژنەی ڕۆشنبیری
لە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر
لە سولەیمانی

بە سەرپەرشتی لیژنەی ڕۆشنبیریی ، بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە شاری سولەیمانی ، لقی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە شاری هەڵەبجە ، سەر لە بەیانی ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی 1983/4/15 لە هۆڵی «بنکەی لاوان» ، بە بۆنەی تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر کۆچی دوایی مامۆستا (صالح هەژار) کۆڕێکی ماتەمیان سازدا . لە سلێمانییەوە بەڕێزان : [ئەحمەد هەردیو حەسیب قەرەداغیو محەمەد ئەمین پێنجوێنیو دڵشاد مەریوانیو ئازاد عبدالواحد] لە کۆڕەکە ئامادە بوون . سەرەتا چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز پێشکەش کرا . ئنجا لە پاشان کاك (عبد الکریم حسن) بەخێرهاتنی دانیشتوانی کردو کۆڕەکەی کردەوەو بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند کە کاك دڵشاد کۆڕەکە بەڕێوە دەبات . ئنجا کاك دڵشادیش لە ئاستی خۆیەوە جارێکی تر بەخێرهاتنی ئامادە بوانی کردو داوای لێکردن دەقیقەییەك بۆ گیانی پاکی مامۆستا (صالح هەژار) بوەستن . ئنجا وتی : [بەڕێزان لە شارە خنجیلەکەی کوردستانی خواروودا شیعری نوێی کوردی لە دایك بوو . بەلام بەگەلای دارگوێزەکانی هەورامان قومات کرا . بە شیری شیعرەکانی حەزرەتی ـ نالی ـ گۆش کراو بە سیاچەمانە چاوە گەشەکانی ڕێژرا ، سەربڵندی بە لوتکەی چیاکانەوەو نەبەردی لە مامزە کێوییە شاخییەکان فێربوو . شیعری نوێی کوردی لە کۆڵانەکانی هەڵەبجەدا تەراتێنی دەکرد] تاد .... (حسین عیساوی) بەم بۆنەیەوە ووتارێکی خوێندەوەو بەشداری پرسەی دانیشتوانی کرد ووتی : [مایەی بەختیاریمە ئەمڕۆکە لەگەڵ دانیشتوانی شاری هەڵەبجە ، بەشداری چلە کۆڕی مامۆستای ئەدیب (صالح هەژار) ئەکەم ئنجا هاتە سەر باسی ئەوەی کە چۆن (صالح هەژار) لە سەردەمی پادشایەتی بۆگەندا نەبەردانە چووەتە خۆپیشاندان و بە شیعری ئاگراوی گیانی شۆڕشگێرانەی لە لای لاوەکان جۆش داوە . هەروەها ووتی : [صالح هەژار شیعری کردبووە خەنجەرێك لەو کاتەی کە دەیزانی وولاتەکەی لە لایەن ئیمپریالیزم وە هەڕەشەی لێدەکرێ . لووتکەکانی کوردستان و شەقامەکانی بەغدا ئەو دیمەنەیان لە یاد ناچێ . کە لاوێکی خوێن گەرم بەزمانی کوردیو عەرەبی ، شیعری کردبووە ، چەکی ئازادی بە دەست هێنان و سەربەخۆیی وولاتەکەی] ئنجا نۆرە هاتە سەر ووتاری بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە شاری سلێمانیو مامۆستا (محەمەد ئەمین پێجوینی) بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری جەماوەر لە ووتارەکەیدا ووتی : [صالح هەژار مرۆڤێکی گەورەو خاوەن بیرو باوەڕێکی پێشکەوتنخوازو پیاوێکی خێر خواهو میللەت پەروەر بوو . صالح هەژار ڕۆڵەیێکی شاری هەڵەبجەی قارەمان و خۆشەویست و تێکۆشەر بوو . صالح هەژار حەزی بە چاکەو خزمەتگوزاریو خێرخواهیو پیاو چاکی دەکرد . ئێمە ناتوانین بە چەند ووشەیێك هەموو لاپەڕە گەشەکانی مێژووی ژیانی دەربخەین بۆیە پێویست بوو کۆڕو میهرەجان لەمە فراوانترو گەورەتری بۆ بکرایە ، بەلام بە داخەوە هەر ئەوەندەمان دەسەلات بوو کە ئەم چلەی ماتەمینی یەی بۆ بکەین] .

دوا بەدوای کاك (حەمە ئەمین) ووتاری پارتی شۆڕشگێڕی کوردوستان لە لایەن برایێکەوە خوێنرایەوەو تیایدا ووتی :

[سەرەخۆشی لە کەس و کاری هەژار ئەکەم ، بە بۆنەی چلەی مامۆستاو سوپاسی هاتنی بەشدارانی کرد . هەژار شایانی هەزار کۆڕی وەهایەو پێویستە هەموو ساڵێ کۆڕی بۆ ساز بدرێ و کۆچی دوایی ئازاری ناسۆری خستە ناو دڵی هەموو

کوردێکی دڵسۆز) . پەی دەرپەی مامۆستا (ئەمین) گەشتێکی بەناو ژیانی صالح هەژار کردو ووتی : [مامۆستا هەژار ، ناوی صالحەو کوڕی سەعیدی باپیر مەلەکە بەپێنج پشت دەچێتەوە سەر [ئەحمەد بەگی کۆماسی] باوکی خەلکی (باڵ دریوانی) خواروەوە . پیاوێکی تابڵۆی بەجەرگو لێهاتووو چالاك بووە . چووەتە دێی (تریفە) لە لای خزمەکانی دەمێنێتەوەو هەژار هەر لەو دێیە لەدایك بووە . دایکی یەکەم سەرچاوەی شاعیرێتی کاتێ لایە لایەی بۆکردووە . بەلام سێ ساڵ زیاتر لە کۆشی دایکی نەماوە ، ئنجا بە ماڵەوە دەچنەوە کەرکووك ، هەژاری و سەرگەردانی وای لێکرد نازناوی «هەژار» بۆ خۆی هەڵبژێرێ ، ئەگەرچی ورەشی هەر بەرز بوو ، چەند جارێك بەهۆی بەشداربوونی لە خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمەدا گیراوە ، لەوانە خۆپیشاندان دژی پەیمانی (پۆرتسموث) ، ئەندامی ئاشتیخوازان بووە ، ماوەیێك سەرۆکی کۆمەڵەی جوتیارانی هەڵەبجە بووە . تا لەگەڵ تەواوبوونی رۆمانی «پزیشك و پارە» لە بەرەبەیانی 1963/3/4دا دڵی لە لێدان کەوت و لە «گولان» نێژراوە .

لە بەرهەمە چاپکراوەکانی مامۆستا صالح هەژار :

1 - دەرەبەگی ساڵی 1959 .
2 - سۆرانی یان کرمانجی ، کە وەلامی (المسألة الطبقية للغة الكردية)ی د. عصمت شریف بوو . ساڵی 1960 دەرچووە .
3 - کۆکردنەوەو ئامادەکردن و لە چاپدانی دیوانی ناطیق ساڵی 1970 .
4 - شیعری کۆن و تازە یان بیری کۆن و نوێ ساڵی 1973 .

بەرهەمە چاپ نەکراوەکانیشی ئەمانەن :

1 - پزیشك و پارە (رۆمان)
2 - دیوانێکی گەورە کە بریتییە (150) هۆنراوە .
3 - شانۆگەری ژن کە دوا بەرهەمی شاعیرە .

ئنجا خاتوو خورشیدە بابان دوو پارچە شیعری خۆی خوێندەوە ، ئەگەرچی دوو پارچە شیعرەکە پەیوەندی بە کۆڕەکەوە نەبوو ، بەلام لەبەر ئەوەی کاتی خۆی کە خورشیدە خان ئەم دوو شیعرەی بۆ مامۆستا (هەژار) خوێندوەتەوە پەسەندی کردووەو بەدڵی بووە ، داوای ئەم دوو پارچە شیعرە لە چلەی ماتەمینی ئەودا بخوێنێتەوە . ئەویش وەسیەتەکەی هێنایە جێ . لەپاشان مامۆستا (حەسیب قەرەداخی) دۆستی شاعیر بە شیعرێك بەشداری کۆڕەکەی کردو تیایدا ووتی :

کێ پێی ووتی من دەتوانم شەوێکی وام بچێتە دڵ
کە تۆ بڕۆی خۆت و دەنگو خەونەکانت بخەنە گڵ
ئەی شاعیری شارەزووری هەژارانم کاکە هەژار
بۆ خەونێکت نەهاتە دی ؟ ، هەزار تفوو لە رووی رۆژگار

ئنجا (جەلال عازەبانی) ووتارێکی پێشکەش کردو ووتی : [شاعیری نەمر صالح هەژار ، یەکێکە لەو ئەستێرە گەشانەی ئاسمانی کوردەواریمان کە پەرەی ژیانی وەکو مرۆڤێکی راست و خاوەن هەست و ویژدانێکی پاك تۆمار کردووەو بەسەر بردووە . ئەم شاعیرە نەمرەش هەمیشە ژیانی بە چرایەك داناوە بۆ رووناك کردنەوەی ئەو تەمو مژانەی کە لە ژیاندا پەیدا دەبێ . هەژاری نەمرو بلیمەت هەمیشە خۆی لە ئازاری ویژدان پاراستووە . ئاشکرایە ئەگەر بێتو هەر یەکە لە ئێمە ئازاری ویژدانی خۆی بدات ، هەرگیزاو هەرگیز ناتوانێ ئاسوودەو سەربەست بژیت) . کۆمەڵێ شاعیری تازە نەمام لەم کۆڕەدا هەستی خۆیان دەربڕیو شیعریان بەم بۆنەیەوە خوێندەوە کە ئەمانە بوون :

[محەمەد خامۆش و جەمال محەمەد ئەمین و ئەمیر رەنجبەر] .

ئنجا کاك (جەمیل حاجی کەریم) ووتارێکی پێشکەش کردو ، لەبری خانەوادەی شاعیری کۆچکردوو صالح هەژار (ئەنجام)ی کوڕی ووتاری کۆتایی خوێندەوەو ووتی : [بەناوی خێزانی هەژارەوە سوپاسی ئامادەبووان دەکەم کە خامەی رەنگینتان خستە کارو ئەم چلەیەتان رازاندەوە] ئنجا گلەیی لە لقی یەکێتی نووسەرانی کوردی سلێمانی و کۆڕی زانیاری کورد کرد کە لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی نەخۆشییەکەی کەس بەسەری نەکردەوە نە بەسەردان و نە بەنامەو برووسکە . ئنجا کاك دلشاد بەم ووشانە کۆتایی بە کۆڕەکە هێنا : [کۆچ ، کۆچی ئینسانە ، ئینسانیش مەزنە ، خەمناکیش بوین و بەلام ئەو خەمناکییەمان کار نەکاتە سەر بزوتنمان ، بەڵکو پتەوترمان بکات بە رووی رۆژگاردا ، ئەو کۆچی کرد ، ئەو نەورۆزەی نەدی کە خۆی پێی دەگوت :

ئەورۆز یانی رۆژی نوێ
ئەو رۆژەی کەوا لە خوێنا هەڵدێ
بەلام با ئێمە ئەو رۆژە ببینین ...



# ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی

لەتیف بەرزنجی
هەولێر دێی قەتەوی

کاک ئەحمەد جگە لەوەی لە بنە ماڵەیەکی خانەدان‌و ناودار‌بوو ، خۆیشی پیاوێکی لێوەشاوەو پێشکەوتو خوازو نیشتمان پەروەرێکی زۆر جگەر سۆزبوو . هەر لە تەمەنی (18) ساڵانەوە خەریکی کوردایەتی‌و لایەنگری لیقەوماوان‌و نیشتمان پەروەران‌و ئاشتی خوازان‌بوو ، لەسەر هەڵوێستی ڕاست‌و بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕانەو تێکۆشانی چەند جارێك لە دەوری نوری سەعیدو (کریم قاسم) یش تووشی بەندیخانەو دوور خستنەوەو دەست بەسەری دەهات .

وە لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستان‌دا وەك تێکۆشەرێك مایەوە بێ کۆڵدان تاگەیشتە پلەی ئەندامەتی (کۆمیتەی ناوەندی) .

لە 1976/5/25 دالە شاری هەولێر لە پڕ دلێ لە لێدان وەستاو کۆچی دوایی کردو تەرمەکەی بردرایەوە دێی دووگرتکان کە دێی خۆیانەو هەر لە گۆڕستانی تایبەتی خۆیان لەوێ هەواری یەکجاری گرت .

جا بەو بۆنەیەوە هەر لەو ڕۆژەدا ئەو پارچە هەڵبەستەمان بۆ داناوە کە ئێستا لە (کارواندا) بە یادی ئەو ڕۆژەی کاك ئەحمەد کە لە تەمەنی (50) ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە ، بڵاوی دەکەینەوە .

### ئێوارە

ئێوارە کاتی خۆر ئاوا
بای ئەجەل هات لە ناکاوا
هەڵی وەران لە باخی ژین
گوڵی سەرچڵ لاوی شیرین
پێکای دڵی ڕۆڵەی دلێر
شیوەنی خستە ناو هەولێر

شیوەن بۆ شۆڕەسواری کورد
جگەرسۆزی نەبەزو ورد
گێژەڵووکەو هەوری ماتەم
ئەبارێنێ بارانی خەم

هەورێکی ڕەش لە دووگرتکان
لافاوی خەمی هەڵڕژان
بە سەر گۆڕو گۆڕستانا
بەسەر لاشەی خامۆشانا
بەسەر دەشت‌و بەسەر شارا
بەسەر مەڵبەندو هەوارا
فرمێسك‌و گڵ لافاوی ڕەش
قوڕە سوورێك هەوێنی هەش

خەنەو وەسمەی ئافرەتان بێ
ئەمڕۆکە هەر قوڕپێوان بێ

ماتەم لە جێگەی سەیران بێ
زەماوەن شین‌و گریان بێ
بەهار با گەڵاڕێزان بێ
گوڵی (سەرچڵ) بۆ خەزان بێ
بنکەی ڕەش‌پۆش دووگرتکان بێ
مەڵبەند لانەی خامۆشان بێ

لە کۆڕی گریان‌و شینا
لە ناو دەروونی غەمگینا
لەو سەرگردو گۆڕستانە
براڕۆو دەنگی گریانە
بەدەنگ‌و بانگەوازەوە
بە شیوەن‌و ئاوازەوە

ئەڵێن لاوی تێکۆشەر ڕۆ
برای ژیرو خەباتکەر ڕۆ
دڵسۆزەکەی نیشتمان ڕۆ
سەربازەکەی کوردستان ڕۆ
جگەر سۆزی هەژاران ڕۆ
پشتیوانی جوتیاران ڕۆ
کاکی ئازاو جەنگاوەر ڕۆ
(کاك ئەحمەدی) کۆڵ نەدەر ڕۆ

لێکۆلینەوە

# فەقیێ طەیران

ئەمینێ ئوسمان

گەلەك برادەرا لدور فەقیێ طەیران نڤیسیی ، من دیت یا فەرە لسەر من ژ ڤێ چەندێ دویر نەبم ژبەر من ژی هندەك بەرێ وی یێ نەبەلاڤکری یێ هەی پێدڤییە دانمە پێش چاڤێد برادەران .

بەری بیست سالا برادەرەکی بناڤێ میخائیل جبرائیل جەبری کەشکولەکێ بچویك بومن ئینا ، وەکو من خاندی من دیت هژمارەکا هوزانێد ، ئەحمەدێ جزیری ، فەقییێ طەیران ، مەلایێ باتەیی ، بەکر بەگێ ئەرزی ، و ئێکێ دی ناڤێ خو گەلەك جارا دبێژیت (سەعید) دویرنینە شێخ سەعیدێ پیران بیت هەرچەندە من نەزانینە هوزان ڤەهاندبن ئابەلێ چەند برادەرا گوت یێد هەین ، ژلایێ منڤە جهێ لدوی چونێیە .

لڤێرێ دێ بەحسێ سەرهاتییا فەقیێ طەیران کەم و پێشکێشی هەوە کەم . ئەڤ سەرهاتییە یا فولکلورییە و ئێکە ژ چیروك و بەیت و مەقام و گوتێد دی یێد فولکلوری مە یێ من خرکری .

سەرهاتی سەیدا مصطفا گویی یاگوتی ، هەرچەندە ناڤێ خو نەگوتییە ، بەلێ هندەك هوزان بدەنگێ وی من یێدهەین .. دڤێ سەرهاتێیدا گەلەك ڤیراندن دیارە بەلێ نرخا خویاهەی ، ئەڤ ڤیراندنە دناڤ گەلەك تورەیێ فولکلوری مەدا رویدایە وەکو بەیتا[1] سیسەبانێ ، زەمبیلفروش ، هەسپێ رەش .. هتد . ئەوژی ژبەر هندێیە کو مروڤێد بەحسێ وان هاتیە کرن د پایە بلندەن بەهرا پتر ژ لایێ دینی[2] ڤە و فەقیێ طەیران ئێك ژوانە .

سەرهاتی بو مە گەلەك تشتا روندکەت وەکو :

(1) فەقی بو دەمەکی ل هێشەتێ یێ ئاکنجی بووی .
(2) دویرنینە لوێرێ مربیت و هاتبیتە ڤەشارتن .
(3) ل هێشەتێ دەستکرەك ئان بەردلکەك هەبو .
(4) دبیت فەقی بەیتا «ئاف و ئاف» لبەر روبیبارێ (زێ) ڤەهاندبیت .
(5) ل (60)سالی یێ مری . (د سەرهاتیێدا فەقی ل پێیکێ شەشێ مر) مە ژبیرکر بێژین کو هێشەتێ جهێ سەرهاتییێیە بەلێ دڤێت بێژین کو دو جهـ بڤی ناڤی هەنە[3] .

(1) هێشەت ـ دکەڤیتە دویریا دەهـ دەقیقا ژ روژهەلاتا کەلا نێروە ، وارەکێ بەرفرەهە .

(2) گوندەکە لکوردستانا تورکیا ل ولایەتا هەکاری ژێری روژئاڤا جولەمێرگێ نێزیکە بو زێ بەهدینا .

هەروەکو دیار ژ ڤێراچونا سەرهاتیێ کو هێشەتا دوێ جهێ وێیە .

تێدا دو هوزانێد فەقیێ طەیران گوتن (ئاف و ئاف) و (ئیرو وەرن) هەردو ژی دکێم و لەنگن . یا ئێکێ سەیدا عبدولرەقیب یوسف بەلاڤکر و یا دوێ لنك من یا هەی ئەو ژی پێکهاتییە ژسیە و سێ مالکا چەندەك ژوان دتێکشێلاینە ، فەقی هو یا دەست پێ کری :

**دێ هون وەرن وەرن لێژم وەرن**

**جیران و خەلقێ هێشەتێ**

سەیدایێ خودێ ژێ رازی صادق بەهائولدین دکتێبا خودا (هوزانڤانێت کورد ـ بەرپەرێ 75 و 191ێ هوزانا (ئیرو وەرن) بەحسکرییە و هندەك مالك ژێ نڤیسینە ئەوان ژی جودای یا هەی لگەل یا لنك من . مخابن سەیدای هەمی نەدانا .

ئەڤ تورەیێ مە یێ بەرکەتی پێدڤی چاڤ پێدا کێشانو بەرهەڤکرنەکا هویرە ژبەرکو ئان ژ دەڤان هاتییە بهیستن و نڤیسین ئان ژ دەستنڤیسا ڤەگوهاستن ژبەرهندێ دڤێت مروڤ یێ هشیاربیت و هویربیت ل نڤیسینا وان نەخاسمە بەلاڤکرنێ ئەڤە کارەکێ دروستە ، بەلێ ئەگەر بدەست مروڤی نەکەڤن ؟

ئەز لگەل وێ باوەرێ مە کو هەر ئێکێ تشتەك هەی بەلاڤکەت ژبەرکو مروڤ نزانیت بدروستی کێ هەر ئەو هەیە برەنگەکێ دی دا مروڤ ئالیکاریێ بکەت ئان ژێ وەرگریت ئەگەر ئەو نڤیس نەبیت و وی بڤێت بەلاڤکەت . ببەلاڤکرنی دێ گەلەك وجێ ژێ بینین ، هەر ئێکێ هەبیت ژ لایێ خوڤە دێ خوینیت و بەرهەڤی وێ کەت یا لنك و بێژیت بابو ئەڤە وەنینە هویە بڤێ رێ دێ گەهینە یاراست وەکو مەمێ ئالان ، مەم و زین ، دمدم[4] ، بەیتا سیسەبانێ ، شێخی سەنعانی[5] وهەمی هوزانێد شاعرێد مە یێد کەڤن .

لدوماهیێ ، ئەڤە سەرهاتیا فەقیێ طەیران هیڤیدارم دیوان و بەیتێد وی ژی بهێنە چاپکرن .

دەهمەن

(1) دتورەیێ مەدا سەرهاتی و چیروك و مەقام و بەیت هەنە ،

ئەگەر من چی دی ژبیر نەکربیت . سەرهـاتي و چیروك هەمی دنیاسن بەلێ مەقـام بو وان چیـروکا دهێت یێـد ئاخفتن و ستران تێدا . مەقـام و ستران ژێـك جودانـە لڤێرێ . بەیت چیروکا (شعری‌یە) ئاخفتن وەکی مەقامی تێدا نینە دبێژنێ (داستان) دیسا بو هوزانا ژی دهێت .

(2)

(3) ل دور هێشـەتێ مام ئەدیب ئەفەندی یێ ئامێدی و شێخ بەشیرێ شێخ محمد طاهر ، و مەلا ئەحمەدێ دوطازەیی هەرسێیا ئـاخفتنا وان ئێکبـو لدیارکـرنا جهێـد هەردو هێشەنا ، ئەوبو یا منی گوتی . سەیدایێ رەحمەتی صادق بهاء الدین دکتێبا خـودا (هوزانڤـانێت کورد بـەرپەڕێ 191ێ) گوتی ، هێشـەت گوندەکە لناڤ بەرواری ژوریيا . ئەڤێ گوتنێ کەسێ پشتەڤانی لێ نەکر .

(4) بەیتا دمدم بدەنگ من یاهەي بەلێ یافەقیي طەیرا نینە . دکتێبا خالێ لەپ زێڕین (موسکو 1967ز)(دمدم) یا دکتور (ئوردیخانێ جاسمێ جەلیل‌دا بەیتـەکا فـەقیێ طەیران بدمدم گوتی یا تێدا هەي پێکهاتیيە ژ (136) مالکا . سەیدا عز الدین مصطفی رسول دکتێبا خودا (عەمەرێ جەلالی ، بەرپەڕێ 11) بـەحسێ کتێبا ئـوردیخان کـرییە و گـوتی بڕوسي هاتیە دانان نزانم بو چ ؟ ژبەر کو یاڕاست ئەوە بڕوسي و کوردییە .

سەیدا عبد الرقیب یوسف دکتێبا خودا (دیوانا کرمانجي سالا 1971ز ، بەرپەڕێ 130) بەحسێ بەیتا دمدم یافـەقیي طەیران کر بەلێ گوت ، (تو مێژوڤانەك (مؤرخ) نەنڤیسیە کـو فەقـە داستانـا (خانی دم دم) هـەیە و یـا لکودێ نڤیسی‌یە) دیارە چاڤێ سەیدای بکتێبا دکتور ئوردیخان نەکەتیە ونزانم بو چ گوت (مێژوڤان) بتنێ ، ما کەسێ دی نابیت ؟ .

## سەرهاتییا فەقیێ طەیران

دبێژن باژێرەك هەبي ناڤێ وی باژێـری هێشەتێ بي . مەلایەك لێ هەبي گەلەك عالمەکێ مەزن بي ، گەلەك فەقي ل بەر دەستێ وي ڕابیون و دەرسەکا تازە دکر . فەقییەك ل وێرێ بي ل بەر دەستێ دي سەیداي دگوتنێ فەقیێ طەیرا ، وي فەقی ل وێرێ ل ین دەستێ وی مەلاي دخواند . خودێ زەکاوەتەك دابو وي فەقي ل گەل حوسنەکێ تازە ، گەلەکێ ژێهاتی بي ، پانێ فەقی بي ، ماشولێ فەقییا چ یە ؟ ل سەر ڕاتبا ئەهلێ باژێری ئان گوندییە ، ڤێ مالێ و مالاهە ژخودان خێرا . فەقي ب نوبە دچونە ڕاتبا . جارەکێ نوبا فەقیێ طەیرا کەتە مالا حاکمێ بـاژێری هێشەتێ کو بچت وێرێ و زادی ژ وێرێ بینت . حاکمێ باژێری کچەك یا هەي ، خودێ حوسنەکێ گەلەك ژێهاتي وێ دایێ ، کا چەوا حوسنەکێ تازە دایە فەقي وەسا یادایە وێ کچکێ ژی دسەر حەوالاڕا چاڤێ کچا حاکمي ب فەقی کەت دەمێ قەستا مالا وان دکر . ئەو جارا ئێکێ بو فەقي دچیتـە وێرێ ، نـە ژ دلەکی ژ هزار دلا دلێ کچا حاکمی کەتە فەقي ، ئێنا ددەرەجکادا هاتەخوارێ بەر دەری گوتێ : فەقي تە خێربت ؟

گوت : ئەزبەنی ئەزێ هاتیم ڕاتبا خو . کچا حاکمی ڕابی دەنگ ل خداما کرکا چ مریشك چ عەلوك هەبي سەرژێکر وفەقي هەر مژویلکر هەتا برنجەکا تازە چێکر و ئەو گوشت دەینـاندە سەر برنجێ وکەفیکا خو ژ سەرێ خو ڤەکر و ب سەر زادی دادا و گوتێ کەرمکە فەقي . فەقي چو ئەو گوشت و برنج دانا بەر فەقییا . پانێ فەقي بین ، مریێد زکێ خوە بین گەلەك کەیفا وان هات ب وی گوشت و برنجی . بەری هینگێ هەچی فەقیێ چوبا مالا حاکمی هەما هەیاللا نیسك‌با ، ماش‌با ، ساڤاربا ، دا وێ دەنە وان ، دەمێ فەقیێ طەیرا دچو مالا حاکمی ، وێ ڕوژێ خارنا فەقییا یا خوش بو .

**فەقییا هـزرێد خـو کرن گـوتن خودێ وەکیلە ئـەم دخەلەتین گوتنە فەقێ طەیرا مالا حاکمی خەما تە ب تنێ و باژێڕ هەمی خەما مە بەسی تو هەڕە گوشت و برنجێ بومە بینە یێ دي هەمی خەما مە ، فەقی گوت بلا .**

هەر ڕوژ فەقی دا چت مالا حاکمی ، نە ڕوژەك و نە دو و نە دەهـ ، ئێنا کچکێ گوتێ : ئەرێ فەقی تو بو چ من بو خو نا خوازی ؟ فەقێ بەرێ خودا حوسن وجەمالا وێ وگوتێ : پانێ فلان کەس ب شریعەتێ خودێ تەعالا من ژي تو دڤێ بەلێ ما ئەز دێ چ کەم ؟ کچکێ گوتێ : دێ وەرە من ژ بابێ من بخوازە . گوتێ : پا هەکە تو نەداي ؟ گوت : نەءدێ من دەت . گوت : پا باشە .

فەقی زڤڕیڤە گوتە سەیدای خو سـەیدا . گـو : بەلێ گوتێ : ئەز حەز دکم تو بو من کچا حاکمي بخوازی . سەیداي گوتێ : فەقي کچا حاکمي نە شولا تەیە ، تە قروشەك نینە ،

حاكمي نەخت دڤێت و تو فەقي و ئەو حاكمە . فەقي گـوتی : سويدا جەما ئەم دێ چين هەكە دا ، دا ، هەكە نەدا ، نەدا .

فەقی و سەيدا هەردو ڕابين چون قـەستا مـالا حاكمی كرن ، پانێ مەجلسا حاكمی هەمي وەختا يا گرتی بي . خولامێ حاكمی بەرێ خو دايێ سەيدايێ بازێڕی هات ، پێشڤە چو و گوتێ : سەيدا تو دێ چييە تك حـاكمی ب سەرەدان ئـان تە خلمەتەك پێ هەيە ؟ سەيدای گـوتێ : بو چ تـو ڤێ پسيارێ دكەي ؟ خولامی گوت : ئەزبەنی پانێ خەلك گەلەك يێ ل نك هەين ، ئەگەر تە خلمەت هەبت دێ ڤەمينيت . گوتێ : نەخێر من خلمەتا پێ هەي . خولامي گوت : پا دێ كەرەمكە ئاليێ مالێ نەچە كوچكێ ئەز دێ خەبەری دەمێ ئـەو بهێتە دەڤ تـە . سەيدای گوتێ : خوش تشتە .

سەيدا چو ئالێ مالێ و خولام چو گوتە حاكمی . حاكمی خوشبيت ، سەيدا يێ هاتيە نك تە . گوتێ : كانێ ؟ گوت : وێهە ل ئالێ مالێ . حاكم ڕابی مەجلس خو هێلا و قەستا سەيدای كر ، سەلامو عەليكوم ، عەليكومەلسەلام . كـەرەمكە ، ڕوينشتنـە خوارێ . ها چای ، ها قـەهوە ، حـاكمی گوت : سـەيدا تـە خێربت ؟ گوتێ : حاكمی خوشبتن ، ئـەز وێ هاتيم كچـا بو فەقيێ خوە . وەختێ وەگوتی ، حاكم پيچەكێ تێنەگـەهشتی بی ، ڕەها نافچاڤيد وی لێك سوياربين ، تازە نەهاتێ ، گوتێ : ئەز نادەم .

حاكمی ژنەكا هەي خودێ مەعريفەتەكا تازە وا دايێ و گەلەكا ب عەقل بی ، ئينا چاڤێ خو ل حاكمی خواركر وێڤە بر و گوتێ : ئەرێ تو بو چ هندە ی بێ مەعريفەتی ؟ ئەڤە سەيدایێ بازێرييە ، تو بو چ وەسا ل گەل دئاخڤی ؟ دلێ وی نەهێلە بێژی من كچا خو داتە و من پێشكێش فەقیێ تە كر ، بەلێ من شەرت پێد هەين . مەعيەنە ئەو شەرت ژێ نامين ، ئەڤە تە دلێ وان ژی نەهێلا و كچا مە ژی ما دجهدا . حاكمی گوتێ : چـاوا فلان كەس ؟ ژنا وی گوت : شەرتێ ئێكێ بێژی بەلێ هـەلێ هەكـە ڕاست هون ئەهلێ علمی‌نە و خودێ تەعالا حەز ژ وە دكت . هون شەتێ ئاڤا هێشەتێ بو من ڕاوەستينن . هەكەر وە سكناند ئەڤە شەرتەك ، پشتی هينگێ من دو وێد هەين . هەكەر هەوە هەرسێ شەرت ڕاكرن كچا من ب طایێ كەزيێ دێ پێشكێش فەقی كەم . ئينا حاكمی گوت ب خودێ ئەڤە خوش تشتە .

**(دبێژن بازێڕی هێشەتێ وەکو زاخو بی هندەك ل ڤی ڕەخی و هندەك ل وی ڕەخی و ئاڤ و شەتێ هیشەتێ دنیڤا بازێڕیڕا دچو-سەرهاتی بێژ)**

حاكم جارەك دي زڤڕی نك سەيداي گوتێ : يا سەيدا . تو قوسيريا من عەفوكە ، هەمی وەختا عەقلێ مروڤي ل سەرێ مروڤی نينە ، بەلكي ئەز خەلەت بيم ، من كچا خـو پێشكێش فەقیێ تە كر ب طایێ كەزيا بەلێ من سێ شـەرت پێد هـەين . گوتێ : شەرتێد تە چ نە يا حاكم ؟ گوتی : شەرتێ من يێ ئێكێ ئەڤەيە كو هون ئەگەر ئەهلێ علمی‌نە و خودێ تەعالا حەژ وە دكەتن ، ئەڤ بازێڕی هێشەتێ شەت يێ دنيڤێدا دبوريت ، من دڤێت هوين وی شەتی بو من بسەكنينن . سـەيدای گـوت : وەللاهي ئەڤە تشتەكێ ژ من زێدەيە ، ئەڤە ژ من ناهێت . فەقی گوت : ئەز دێ سەكنينم ب ئانەها خودێ . سەيدای گوتێ : كوڕۆ فەقي تو نەشێی . فەقی گوت : نەشولێ تەيە سـەيدا : هەرسێ پێكهاتن كو ڕوژا دوشەمبی خەلكێ بازێـڕێ هێشەتێ خڕكەن .

ڕوژا دوشەمبی دەنگ ل بازێری گێڕا ، جحێلا و پيرا و بچوكا خڕ ل رەخێد شەتی سەكنين . فەقی هاتە بـەر شەتێ هێشەتێ دەستنڤێژا خو شويشت ، دو ركعەتێد سوننەت كرن و دوعا بو خو ژ خودێ كرن . يا خـودێ تو علمێ خـو ڕەزيل نەكي ، ئەڤ علمێ تە دايە عەبدێ خو ، و تو من ناجح بكی ، ئەزێ ب ناڤێ تە ڤی تشتی كم . فەقي ل بەر ئاڤێ سەكنی و بەندەك هاڤێتە بەر و گوت :

هەی ئاڤ و ئاڤ هەی ئاڤ و ئاڤ<br>
مەوجا ددی پێلا بەلاڤ<br>
شەڤێ و ڕوژێ تە خەو نايێ<br>
ڤی طاعەتی ژكێڕا دكي

**ئاڤێ گو :فەقی وەبی صەدجار وەبی**<br>
**پێغەمبەرا رەسولە ل نك مە نەبی**<br>
**تو عەبدالی ئەڤ سالە ل م پەيدابي**<br>
**ئاڤێ وەبی صەدجار وەبي**<br>
**پێغەمبەرا ئاقل هەبی**<br>
**هەوجەيي پسيارێ نەبي**

فەقی ل ڤێرێ گوتە خەلكێ بازێڕی مانێ هوين شاهدن كو ئاڤێ ل گەل من ئاخفت ؟ هەميا گوت : بەلێ ئەم شاهدين كو ئاڤێ ل گەل تە ئاخفت .

**گو :هەرێ ئاڤێ ئاڤا شەتێ**
**تو ب قەدرێ ڕەبێ عززەتێ**
**تو ب سەكنی نیڤ سەعەتێ**
**هەرێ ئاڤێ ئاڤا بوری**
**تو ب قەدرێ ڕەبێ ل ژوری**
**تو بسەكنی پاشي بیوری**

وێ گاڤێ (رب العالمین) دوعا فەقی قەبولكر و گازی جیرائیلی كر و ئەمر لێكر . جبرائیلی ركاب دانانە دنیڤا ئاڤێدا ، ئاڤا بنی چو و یا سەری هەر بەنگاند ماسیا دبەستێدا خو هلاڤێت .

فەقی گوتی : گەلی خەلكێ باژێڕێ هیشەتێ ئاڤ سەكنی ئان نە ؟ هەمیا گوتن : سەكنی . سەیداێ فەقی وێ گاڤێ پەشیمان بو و گوتە خو : بابو دێ بلا هینگێ من یا كێم داگێڕابا بلا من گوتبا بلانەكێ .

گوتنێ حاكم ئەڤە شەرتەكێ تە ب جە هات ، شەرتێ تە یێ دی چیـیە ؟ حاكم ما گوهشي ژبەركو نەشێت بئاخڤیت ئللا پسیارا كابانییا خو بكت ، ژنا حاكمی گوتێ : بێژێ شەرتێ من یێ دوێ ئەوە كو تدارەكا كچا من ژ كلوڤاندكا سەری هەتا شمكێ و بنێ پیا هەمی دقودیا جگارادا بتن ژ مەقعەدێ صدقی بو من بینت . ئەڤە مەعنا وێ نەدانە . فەقی لێ زڤڕی و گوتی (ان لله و انا الیه راجعون) ئەڤە ئرادا خودێیە بلانەكێ ، ئەز دزانم ب منڤە چێنابت بەلێ بەلكی (رب العالمین) ئانەهێ بدت ، ئەڤە ئەژی دێ چم .

فەقی ڕابو دو نان بو خو هاڤێتنە دجانتكێ خودا و هاڤێتە ملێخو . فەقی هەیامەكێ چو پاشی هاتە بەر لێڤا ئاڤێ دا دەربازبت ، بەلێ دێ كیڤە چت ؟ ئەو ژی نزانت (رب العالمین) ئەمر ل جبرائیلی كر ، جبرائیل خو ئینا شكلێ صوفییەكی و ئەو تشتێد حاكمی ڤیاین ژ شمكێ حەتا گومتكێ د قودیكەكا جگارادا ل نك جبرائیلی حازربون ، و جبرائیل چو وی جهێ خودێ ئەمركری بچتێ ل سەر لێڤا ئاڤێ بەرەكێ هەي یێ هویە هویە هویە ، دو زێڕا دانە سەر وی بەری فەقی دێ ل وێرێ دەربازبت هەردو زێڕا بینیت ، هەڕە پێشیا وی پسیارێ ژێ بكە دێ بێژتە تە ئەزێ ل فلان تشتی دگەڕییم ، ئەوێ قودیكێ بدێ و وان دو زێڕا ژێ وەرگرە و هەرە ناڤ وەرزێ زەبەشا ، فلانە صوفی یێ ل وێرێ وان هەردو زێڕا بدێ .

فەقی هات دەربازبو ژ دوبرڤە دیت صوفییەك یێ ل وێرێ ب پێلاڤا خوڤە مژویلە هەروەكو ئەو ژی ژ وی رەخێ ئاڤێ هاتی دەربازبوی . وەكو فەقی دەربازبوی نێزیكی بەری بو . بەرێ خو داێ دو زێڕ یێ ل سەر ، دەستداێ هەردو زێڕ كرنە دبنێ بەرویكا خودا . فەقی پێلاڤا خو كرە پێ خو ، صوفي هات قەستكرێ و سلاڤ لێكر و دەستدا چنگلێ وی و گوتێ : هینگێ ئەز تە بەرددم هەتا بێژیە من كانێ جبرائیل ل كیڤەیە ؟ فەقی گوتی : ئەز بەختێ تەدا صوفی ئەز چ زانم جبرائیل ل كیڤەیە ؟ هندی فەقی هاتێ ، فەقی خو ژلەپا نەئینا دەرێ . فەقی سەرێ خو سەرنشیڤكر و هزرا خو كر و سەرێ ڕاكر ، ئینا گوتێ صوفی . گوتێ : بەلێ .. گوتێ : ئەز ب عززەتا خودێ كم من عەردەك نەهێلا ، ئەز ل عەرو و عەسمانا گەڕیام من جبرائیل نەدیت ، ئەڤجارە ئان ئەزم ئان تویي ، ب خودێ یامن هەر ئەز نینم هەما تویي .. هینگێ جبرائیلی ئەنیا فەقی ماچیكر و گوتێ دێ هەڕە ئەی بێ مراد . ڕاستی ژی ئەوبو كو دویماهییا فەقی بێمرادی بو نەگەهشتە مرادا خو .

فەقی ڕیا خو گرت و زڤڕی قەستا باژێڕی هێشەتێ كر ، وەكي گەهشتی بەڕێ خو ددتێ ماشاللا قیاممەتە ل باژێڕی چ سوحبەتە نزانیت ، هندەك بچوكا بو خو یاری دكرن ، فەقی قەستا وان كر و گوتی : ها گەلي بچوكا ئەڤە چ قەلەبالغە ل باژێری چ بوویە ؟ چ شین و تازییە ل باژێڕی ؟ ئێكی گوتێ : ما تو ترانی ؟ گوت : نە ب خودێ . گوتێ : ئەڤە كچا حاكمی دەسنگرتییا فەقیێ طەیرا ئەمرێ خودێ كر ، فەقی ژی یێ چووي بو وێ جلكا بینیت . ئینا فەقی گوت : (انا لله و انا الیه راجعون) های نەنە ، ڕاستە ئەڤا هوین دبێژن ئەڤە كچا حاكمی مرییە یا فەقیێ طەیرا بو چوویە تشتا ؟ گوتن : بەلێ وەیە .

فەقی ڕییا خو گرت و چو دیت كو كچك یا ل بەر شوورارێ یێ طەرمێ وێ دشون و ل سەر قەبرستانێ یێ قەبرەكی دكولن و خەلكی یێ خو ڕەش و شین كری قیامەتە ، پانێ كچا حاكمییە . فەقی نێزیكبو و گازیكر كانێ بابو كچكێ ژ سەر شووارێ ڕاكەن . خەلكی گوتێ فەقی مال خراب كچك یا مری ما دێ بو چ ژ سەر شووارێ ڕاكەن ؟ كو گازی بكەتێ بلا ژ سەر زیارەتا بێنەڤە و كچكێ ژ سەر شووارێ ڕاكەن و كەسەك ژی بلا ل ڤێرێ نەمینیت ژ بلی دایك و بابێد وێ و سەیداێ من و ئەز .

خەلك ژ سەر قەبرا هاتنەڤە و ژ دور ڤەرەڤین ، فەقي

دەستدایێ قودیکا جلکا ڤەکر ژ گومتکێ هەتا شمکێ کرنە بەر کچکێ و برنە دقەسرێڤە و بەرقبلە دانان و گوتە بابێ وێ تو ل پشت سەرێ روینە و گوتە دەیکا وێ تو روینە بن پێد وێ ، گوتە سـەیدای ژی تـو روینـە بـەرسینگی ، فـەقي ژی روینشتـە بەرپشتێ و دەستێ خو دانا بن گوهێ خو و گوت :

**ئیرو وەرن عالەم وەرن**
**عالەم و خەلقێد هێشەتێ**
**هون رایەکێ ل من بکەن**
**ئیرو ڤەوی کریا م تێ**
**ئیرو قەوی ل م تێ گری**
**سوسن ل مێرگا غەبیری**
**مە حەیفا لیڤێد شەکری**
**ئێدی ڤەناخوت شەربەتێ**
(هینگێ روح هاتە کچکێ هەتا چوکا .)
**ئەو لیڤێد لەعل و شەکر**
**صەد ئەفغان و ئاهـو کەسر**
**حەیفە دلو چون هجرەتێ**
(کچکێ روح هاتە نافطەنگێ)
**حەیفە دولا ژێك بین جودا**
**شین و گري کیسو تەدا**
**ئەم رازینە ب ئەمرێ خودا**
**هەجیا ژ دەرگاهێ تەتێ**
(روح هاتە کچکێ هەتا سطووی)
**هەجیا دکت ئەللاهـ دکت**
**قەلبێ عەبدانە سەحدکت**
**برینێد کول ئەو ساخدکت**
**حەکیمي من عیسا بتن**
**لوقمان ژ قەبرا رابتن**
**دەردێ دلا ساخنابتن**
**هوینێ بینن ڤێ قودرەتێ**

ل گەل ڤێ قەسێ بێهنژکەك هاتە کچکێ ، داخو رابوڤە . وەختێ رابویەڤە دەیکا وێ و بابێ وێ خو هاڤێتێ ، ئینا فەقی گوتێ : نەء ، ئێـدی گەرا منـە ، کچکێ و فەقی خـو هاڤێتـە ئێکودو . چارێك سەعەتێ ، نیف سەعەتێ مان ب بیاریاڤـە ، فەقی ل سەیدای زڤری گوتێ : دەستبدە دەورێ . سەیدای گوتێ : چ یە ؟ فەقی گوتێ : ما تە دیتیە مری رابنەڤە ؟ بەلێ بابێ وێ دو شەرت دانابونە بەر من بلا ئەڤە شەرتێ سێ بتن ، ئرادا خودێیە و ئەمرێ خودێ تمامبو دەستبـدە دەورێ ب زوری خلاسکەي .

دایێ گو هەوارە ، بابێ گو هەوارە ، فەقی گوت ، هەوارە نە هەوارە نینە ، ئەڤە ئرادا خودێ پێ تمامبي ، ما مري دزڤرنە مالا خو ، مریێ مر ساخنابت ، دێ سەیدا دەورێ بخـوینە . سەیداي دەستهاڤێتە دەورێ هەتا خلاسکری ، (رب العالمین) ئێمانەتێ خو برەڤە . فەقی گوت : وێ ب ڤێ تدارەکێڤە بکەنە د قەبریدا . رابون ب وان جلکاڤە کرنە دقـەبرێ وێـدا . هەر کەسەك چو مالا خو و ل سەر کارێ خو .

فەقی چو مزگەفتا خو ب دلێ کـوڤانڤـە ، ما قـەهر بـو کەنگیە . روژ بورین چ دو چ سێ ، فەقی هەرێ دامايیە . شەڤەکێ سەیدای وی دڤیا فەقییێ خو ژبیرڤەکەت گـوتێ هلو هەرە بانگێ عەیشا بـدە . فەقی رابـو دا بچت بانـگ بدت . پێسترکا بانێ مزگەفتێ دوازدە پێ بین . فەقی پێ خو هاڤێت ، ئەڤە ئێك دو ، سێ ، چار ، پێنـج ، شەش ، وەکی گـەهشتە پێپکێ شەشێ ئزرائیـل هاتـە سەر پێپکێ حـەفتێ راوەستا ، گوتێ : فەقی .. گوتێ : بەلێ .. گوتێ : ئەزب عززەتا رەبێ خو کەم ، نە تو پێپکەکی تێیە سلال نە دچیە خوارێ ، سەر پێپکێ شەشێ دێ روحا تە سطینم . هندی فەقی لاڤلاڤکر ، بو خاترا خودێ ئان بێمە سلال ئان بچمە خـوارێ ، ئزرائیـلی گوتێ : نەخێر ئەز دێ ل ڤێرێ روحـا تە سـطینم . فەقی گـوتێ : یا مساعەدا من بکە دو دەقیقا .. گوتێ : بلا .. قـەقی دەستدا بەرویکا خو قەلەمەك و کاغەزەك ئینانەدەر نفیسي ئەي گـەلی بازێرێ هێشەتی ، هوین نەبێژن دیارە هندی مروڤەکی خراب بی دپێسترکێدا کـەت مر ، ئـەز تێدا نـەکەتیمـە ، پێسترکـا مزگەفتێ دوازدە پێپکن ئەزێ هاتیمە سەر پێپکێ شەشێ ئزرائیل یێ هاتیە سەر یێ هەفتێ ، نەهێلا نە ئەز بچمە سلال و نە بێمە خوارێ ل سەر پێپکێ شەشێ روحا دسەر مندا چووی ژ نوی ئەزێ کەتیمە عەردی ، وەنینە کول سەر عەردی روح یا دسەر مندا چووی ، نەء ، ل سەر پێپکێ شەشێ روح یا دسـەر من چووی . کاغەز کرە دبەرویکا چاکێتێ خودا و لێڤا وێ ئینادەرڤە دا خەلك ببینیت و بینتە دەر بخوینت .

عبدالرزاق بیمار

# شێخ ڕەزای

## کۆمیدی و سالووك

**1 ـ لایەنی کۆمیدی شیعری شێخ ڕەزا :**

بایەخی شیعری شێخ ڕەزا ، جگە لە لایەنە زمانییەکەی کە تابلۆی بە زمانێکی ڕەوانو سادەو خەست شیعری داڕشتووە . لە کێشدا سوارو لە دەربڕیندا لاوچاکو لە ئامانج پێکاندا تەڕ دەستەو وەلام لە مستە ، جگە لە شاعیریەتێکی هەلقولیوو بێ گرێ . . جگە لە مانە بە بڕوای من بایەخی شیعری شێخ ڕەزا لە مەڕ ئەو گیانی ڕەزا سووکیو قسە خۆشانەیە کە دوو بالی ئاوریشمینیان بە شیعرەکان داوەو هەموو دەرگاو پەنجەرەیەکیان لە بەردەم کراوەتەوەو بە بێ دەستوور خواستن دەچنە ژوور دلەوە .

ئیتر سەرکێشیی ناحەزانو نە خواستنی لۆمەکارانو ڕەخنەگران سوودی نەبووە . لەمپەرێك یان دیوارێکیان لە بەردەم ناوو دەنگو بەرزفڕیی ئەم شیعرانەدا دروست نەکردوە . واتا دەمەوێ بلێم لایەنی کۆمیدی لە شیعرەکاندا بووەتە پاسپۆرت بۆ تێپەڕبوون بە سەر هەموو سنوورێکدا . کۆنەویستانو ئەوانەی لەبەر شەرمی هەندێ داڕشتن سل دەکەنەوە . یان ئەوانەی هەندێ دیمەنی سەیر دایان دەچلەکێنێو بە جنێوبازیو قسەی بازاڕیو سەراسایانەی دەزانن . ئەمانە هەر سەیری دیوی دەرەوەی هەندێ لەو شیعرانە دەکەنو هیچی تر . .

بەلام ئەگەر پەردە لەسەر ڕووە دیارەکە لابدەینو زیاتر لێی بچینە ژوور . ئەوسا بە دنیای درامانووسێك دەگەین کە هونەرمەندێکی شارەزا دروستی کردووە . کەوا کەسایەتیی خۆی تێدا نواندووە.دراماش دوو جۆرە:تراجیدیو کۆمیدی. وەنەبێ هەر ئەمڕۆ . گەلان لە کۆنەوە بایەخی گەورەیان بە هەر دوولا داوە . قەت وانەبووە درامای تراجیدی هەلبژێرن چونکە باسی پاشاهانو پالەوانانو گەورەپیاوان دەکاتو چونکە مەرگەساتو شەڕو شۆڕ پیشان دەدات . وە بێن کۆمیدی بەلاوە بنێن چونکە باسی ڕەمەکی مەردوم دەکاتو گالتەو پێکەنین دەگێڕێتەوە .

بە نموونە لە سەردەمی گەشانەوەی یۆنانیدا . سەیر دەکەی کۆمیدیا لقێکی هەرە بەرزە لە داری ئەدەبدا . ئەرەستۆشو ئەفلاتونیش گەلێ بەسەریدا هاتوونو لێی دوواونو لەگەل تراجیدیادا بەراووردیان پێ کردووە . گەلێ نووسەری کۆمیدیا نووسی وەکو ئەرستۆفان تائەمڕۆش ئەمر ماونەتەوە .

مامۆستا محمد مندور لە کتێبی ( هونەری شیعر ) دا زۆر باش ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی لایەنگیری ئەدەبی کۆمیدییە . لەوەوە تێ دەگەین کە ئەگەر تراجیدیا ئەدەبی تایبەتی چینێك بووبێت . کۆمیدیا هی زۆربەی گەل بووە . ئەگەر تراجیدیا تەلارو قەلاتو مەیدانی شەڕو بارەگاکان بووبێت ئەوا کۆمیدی چوارچێوەکەی ناو بازاڕو ناو شارو دێهاتو شوێنە گەلییەکانە . گەل بە خۆیانو بە گیرو گرفتو خەمو ئازاریانەوە.

**فەقی ئەمرێ خودێ کر و دنگ ب بنێ پێسترکێ کەت . (انا لله و انا الیه راجعون) . سەیدا و فەقێید دی هەر مانە ژ هویڤیا بانگی ، نەهەرێ دەنگێ فەقێ طەیرا و بانگی نەهات ، فەقییەك دەرکەت دیت کو فەقیێ طەیرا یێ کەتی و ڕوح یا دسەردا چویي ، کرە هەوار و گوت : ب خودێ یێ مری . .**

**فەقی ڕاکرن چاردەست برنە دمزگەفتێڤە ، سەیدای دیت لێڤا کاغەزەکێ یا ژ بەرویکا وی دەرکەتییە ، وەکی بەرێ خو دایێ گوت : بابو وەلییەکێ (رب العالمین) فەقیێ طەیرا بی . ڕابون شویشتن و کفن کرن و ل ڕەخ دەستگرتییا وی ڤەشارتن .**

بە شێوەیەك كە ئەگەر تراجیدیا وێنەی لایەكی ژیان بێت ئەوا كۆمیدیا هەموو ژیانە . هونەرمەند دەتوانێ لە رێگەی كۆمیدیاوە ئێجگار نزیكترو روونو رەوانتر گیرو گرفتەكانی كۆمەڵ شی بكاتەوەو هونەرێكی رەسەن بەدەست بخات .

شێخ رەزا دەڵێ :

**پابەندی خەلایق نی‌یە تەبعم وەكو خەلكی**
**بێ كولفەتمو رەندمو سەییاحمو سالووك**
**من خواجەیی ئەحرارمو ئامێزشی دنیا**
**هێشتاكە ئەمی كردووەتە بەندەیی مەملووك**
**وەك لامعی شاعیر نی‌یە ئێستێ لە جیهاندا ،**
**شیرین سوخەنو قابیلو خۆش تەبعو رەزا سووك**

وا دەردەكەوێ هەر شێخ رەزا خۆی ئامادەیی‌یەكی شەخسی سروشتی تێدابووە بۆ گرتنی ئەم لایەنە . تەنانەت ئەگەر دێتە سەر باسی شەڕو شۆڕو بابەتەكانی نا كۆمیدی . ە وێشەوە پرشنگی زەردە خەندەیەكی هەر پێوە دیارە . ئەگەر هەردووكی تێكەڵ یەك نەكردبێت . لە شەڕی تالەبانیدا باسی جرتو فرتی ئاغاو چەكمە زەردبوونی كوێخاو شەڕی مام رێویو كەمتیارو كەرگەس دەكات . لە ستایشی كاك ئەحمەدی شێخدا . دوا دێڕی شیعرەكەی دێتەوە سەر دیمەنی خۆیو بەراوورد لە نێوان پەرێشانی حالیو شیعری شادی بەخشی خۆی :

**بەم حالە پەریشانەوە ، باز ئەشهەدو بیللا**
**شیعرت تەرەب ئەنگێزە ( رەزا ) شاعیری چاكی**

ئنجا ڕوانینە شیعری شێخ رەزا بەو چاوە كە هەر داشۆڕینەو شەڕە جوێن و قسەی ناشیرین یان لكێكی دەچێتەوە سەر داوێن پیسیو دەگمەنی لە پەیوەندیی نێرو مێدا .. ئەم روانینە پشتكردنە لە هەلو مەرجی شیعری كۆمیدی لای شێخ رەزاو نەزانینی ئەو دەوروبەرو مەڵبەندی ژیانەیە كە شاعیری تێدا ژیاوەو شیعرەكانی تێدا پەروەردە بووە . دەنا چۆن یا بەو شوێنی شێخو بنە مالەو دەولەتێكی ئیسلامیو دەورو بەرێكی كۆنە خوازی تەنگەبەر ئەمانە نەبوونەتە دیوارێك لە پێش پێشكەوتنی شێخ لە ژیانداو نەبوونەتە هۆی ئافەرۆزو خوێری كردنو دەرهێنانی لەو بازنە كۆمەلایەتی‌یە دا كە تێیدا ژیاوە ؟ ئەی چۆن دەگەیی‌یە پاشاو میرو سەرلەشكرو والیو زاناو شێخو ناودارانو بەم جۆرە شیعرانە پایەی خۆی دەنوواند ؟



ئەگەر نا چۆن لە تەك ئەم جۆرە شیعرانەدا شیعری خواناسیو سیاسەتبازیو مەزهەبو تایفە پەروەرەریو شیعری شانازی دەنووسیو دەیتوانی لە نێوان دوو جۆرە هەڵسو كەوتو دەروونو بەرهەمدا تەرازوو رابگرێ !

تۆ بلێی دامەنی شیعرەكانی بەشتی هاودژو دژ بە گیانو دڵو دەروونی پیس بكات كە خۆی گوتوویەتی :

**زبدەی مەتاعی حیكمەتە ئەم شیعری كوردی‌یە**
**هەرزانە بێ موبالەغە حەرفی بەگەو هەرێ**
**جامەی حەیاتی عاریەت كورتە زینهار**
**ئالوودە دامەنی مەكە بۆ پێچی مێزەرێ**

گومانیش لەوە دانی‌یە لەم ( شیعرە كوردی‌یە ) مەبەسی هەموو شیعرەكانی‌یەتی بەبێ هەڵبواردن . هەروەكو چۆن زانیویەتی دنیا چی‌یەو ژیان لە چ ناكۆكی‌یەكو ناتەبایی‌یەك دایە هەر بەم جۆرە زانیویەتی چی نووسیوەو ئەمەتا گرتوویەتی :

**من آن قلندر ، آزاده مەشرەبەم کە قەلەم**
**کشیدە بەر ( بە دو نیك )ی جیهانی بوقلەموون**

لێرەدا دەگەڕێینەوە سەر گیانی شێخو شیکردنەوەی ئەو دەورو بەرەی ژیانی تێدا بردوەتە سەر . کە لە ئەنجامدا دوو ڕێباز دەستنیشان دەکەینو هەوڵ دەدەین لێیان بکۆڵینەوە :

**یەکەم : دەوری پێکەنین بازیو گاڵتە جاڕی کە ئێمە بە بەزمەسات ناوی دەبەین .**
**دووەم : دەوری سەعلووکی کە خۆی بە ڕەندیو قەلەندەریشی ناو دەبات .**

بەزمەسات بریتییە لە گاڵتە پێکردنو تەوسو گەپو مەتەڵۆكو نوقورچو کاریکاتۆرو قسەی بەتوێکڵو پلارو فشەو پێڕابواردن ئەوەی بەزم دەگێڕێ پێویستە زۆر زیرەكو بە هەستو شعور تیژو چەژگە ناسك بێ ، هەروەها وەڵام لە مستبێو لە کاتی پێویست دانەمێنێو بتوانێ لە زماندا ڕەگەزو هاو واتاو هاو چەشنی ووشە بدۆزێتەوەو لە هەڵگێڕو داگێڕکردنی ووشەدا بەزمێك بێنێتە کایە . .

ئەم کەسانە ، ئەم قسە خۆشو ڕەزا سووکانە چرای مەجلیسو دیوەخانەکان بوونو شەوانی دوورو درێژیان دەکردە چراخان ، لە کۆڕو دانیشتنەکاندا دەبوونە خوێی چێشتو ڕێزو پایەشیان دەزانرا .

لە ئەدەبیشدا بەزمەسات دەورێکی گەورە دەگێڕێو نەبوونی ئەم جۆرە ئەدەبە ووشکیو دووره پەرێزیو نیوەگیانی ئەدەبی نەتەوە دەگەیێنێ .

جا شێخ ڕەزا وەکو دەردەکەوێ مامۆستای ئەم مەیدانەیەو هەموو چەشنەکانی بەزمو گاڵتە لە شیعری ئەودا هەیە . جارێ لە لایەن گاڵتە پێکردنەوە ( سخریە ) سەبارەت بە زیرەکیو چاپوك دەستیو ووریاییەوە زۆر باش لە هەقی هاتووە . وەکو سیاسەت کارێك بۆ هێرش بردنە سەر دوژمنی سیاسیو بۆ شکاندنی مەزهەبو عەشیرەتو پیاوانی کاربەدەست بەکاری هێناوە.جاری وابووە بە سووكو ئاسانی لە دەستی دەرچوون. جاری واش تۆخی کردووەو گاڵتە پێکردنەکە سەری لە مەیدانی هەجوو ئەتك کردن دەرکردووە .

هەندێ بەزمی ئەو بریتییە لە خۆ هەڵەکردن لە مانای ووشەیەكو هێنانەوەی ( تەورییەیەك )، هەندێ جار گێڕانەوەی مەتەڵو بەسەرهاتێكو هەندێ جار تێکەڵ کردنی مەبەست بە پێکەنینو فشەو بەکار هێنانی قسەی مەبەست لە کاتی یاریو گاڵتەدا .

بە نموونە لەو دوو دێڕە شیعرەدا وەسفێکی چاکی جەنگی دوو کەس دەکا . بە تایبەتی کە مەیدانی شەڕەکەیان (شێروانە) بووە هەلێکی باشی دەست کەوتووە کە لەو مەدحو سامی ڕاستییە دابە زێتە زەوی‌ی گاڵتەو بەزمی خۆی . ئیتر سوودی لە ووشەکەی شێروانە دیوە کاتێك دەڵێ شێر وانەبوو . شێر وەکو ئەو نەبوو . دوایی خەتمی دەکاتو ئۆباڵ دەخاتە ئەستۆی ئەو قاسیدەی بۆی گێڕاوەتەوەو هەرچی لە مەدحی جەنگو جەنگاوەران هەڵی چنیبوو ، هەمووی تێك هەڵدەوەشێنێو دەڵێ شێر . وانەبوو . وەك کابرا بە جرتێکەوە کۆتایی پێ هێنابێ :

**جەنگ گاهی جوکلو محمود بەگ شێروانەبوو**
**ئافەرین محمود بەگ لەم جەنگەدا شێروانەبوو**
**وەختێ قاسید هاتو لێم پرسی چلۆن بوو ئەم شەڕە**
**وردە وردە بۆی بەیانکردم کەچی شێر وانەبوو .**

یان لە باسی ( شوکری ) و ( جەمیل )ی شاعیردا ناوی هەردووکیان بە ناوی ژن دەزانێ وەکو لە کوردەواریدا باوە . ئیتر وا لە خوێنەران دەکا کە وابزانن ئەمانە ژنن . هەر بەو پووره شوکریش بانگی یەکێکیان دەکا ! بەڵام لە هەموو گاڵتەو بەزمەساتەکانی شێخ ڕەزا بەلای من کاریگەرتر وێنە کاریکاتورییەکانێتی . هونەرمەندانە وێنەی ناحەزانی خۆی بە هەقو بە ناهەق تێك هەڵ شێلاوەو شتێکی ئەوەندە سەیری لێ دروست کردوون کە خاوەنەکەی خۆی بێتە پێکەنین چ لە داخانو چ لە سەیرو سەفادا . ئەم کاریکاتێرەش کە ئەمڕۆ لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوەو لەم دوو چەرخەی دوایییەدا لە ئەوروپا سەری هەڵداو بە ئێمە گەیشت کە بریتییە لە بەزمێك بە بێ قسەو پێ هەڵکوتن ، وێنەکێش کەلێنێك لە قاڵبی یەکێکدا دەگرێت وەکو لووتو لچو لێوو چەناگەو ورگو .. تاد دێ خەوشێك لە خەوشەکانی ئەندامێکی لەش گەورە دەکاتو کە دیتت هەرچەند لە قەبارەی خۆی گەورەترە بەڵام وەکو نیشانەو مارکەی مسجلە زوو خاوەنەکەی دەناسیتەرە ، بێ گومان وێنەی کابرا دەشێوێت بەڵام شتێکی سەیری پێکەنین هێن پەیدا دەبێت .

شێخ ڕەزاش لەم وێنە سەیرانە نموونەی زۆری هەیە . وەکو نەخشاندنی وێنەی کاریکاتوری ریشی حەمە ، ئەسپەکەی کوێخا ، ئێسترەکەی میر . سەرو سەکۆتی ماڵمدیری ، کەشو فشی بەگ ، سەرو سوورەتی خۆی لە کاتی ئیفلاسیدا ،لە بەر هەیوانی مزگەوت هاتوچۆی حاجی لەقلەقانە ، وەسفی سینیو زەرفەو کەلەشێری یەك چاوو شێخ هۆمەر .. تاد .

**دەردی لوقوەی گرت لە ناکا شێخە توهمەت کارەکــــە**
**ئەو قەیافەت سەیرەکەی هەینەت وەکو کەمتیــارەکــــە**
**شێخەکەی ، دەم چەوتەکەی ، لچ گێرەکەی ، لێو خوارەکە**

خۆ یەکێك لەو وێنە کاریکاتوری‌یەی کە زۆر سەیر دێنە بەرچاو ، وێنەی دەمو جگەرەی زەلامێکە :

**موتــــەلەووین میـــــزاجی گوناگوون**
**موتـەصەڕیف کـــــە دیـــدە بوقەلەموون**
**موتەصـــەڕیف جیگارەکەی لـــە دەمـــا**
**دێو دەچێ وەك مریشکی چیلکـە بـە کوون**

وەکو ڤولتێر گوتوویەتی « ئەگەر پێکەنینمان نەمێنێ ، خەلك خۆیان بە پەت هەلدەواسن » ، ئیتر ئەو شیعرانە وەکو دەلاقەیەکی پڕ لە پرشنگ‌و تیشکی هەتاو وان لـــە ژوورێکی تاریکی نوتەکدا . ئەم دەورەی دیوانەکەی شێخ رەزاو شـــێخ رەزا خۆی‌و کەتنەکانی ، دەمەتەقێ‌و قســـە نەستەقەکانی ، یادگارەکانی لە کۆڕو کۆمەلەکاندا دەی‌گێرێ . دەورێکـــــە لە بیر ناکرێت‌و جێی خۆی گرتووە .

## 2 ـ شێخ رەزای ســالووك

لە بەشی پێشوودا گوتمان کە شـــیعری شێخ رەزا دوو رێباز دەستنیشان دەکەن ، یەکێکیان دەوری بەزمەسات بـــوو ، دووەمیشیان دەوری سەعلوکی‌یە کە خۆی بــــە رەندی‌و قەلەندەریشی ناو دەبات . ئەوەبوو گوتی :

**پابەندی خەلایق نی‌یـــە تەبعم وەکو خـــەلکی**
**بێ کولفەتم‌و رەندم‌و ســـەییاحم‌و ســـــالووك**
**من خواجەیی ئەحرارم‌و ئامێزشـــی دنیـــا**
**هێشتاکە نەمی کردووەتە بەندەیی مـــەملووك**
**وەك لامعی شاعیر نی‌یە ئێستێ لە جیهانـــدا ،**
**شیرین سوخەن‌و قابیل‌و خۆش تەبع‌و رەزا سووك**

لێرەدا من ووشەی ( سالووك ) بە ( صعلوك )ی عـــەرەبی دەزانم‌و لام‌وابێ لە ووشەی ( سلوك‌و سالك )ەوە نەهاتووە ، هەر ئەم ووشەیەش خەیالی بۆ ئەوە بردم کـــە بەندیواری‌ی‌و ئاشنایەتی‌یەکی باش لە نێوان شێخ رەزاو صەعلوکەکانی ئەدەبی عەرەبی‌دا ببینم .

بۆیەش بە بایەخەوە هەندێ لایەنی ئەدەبی صعالیك روون دەکەمەوە چونکە تـــا ڕادەیەکی زۆر رێنماییمان دەکات لــــە شیکردنەوەی ئەو هەل‌و مەرج‌و ئەو هۆیانەی کـــە ئەم جۆرە شیعرەیان لە ئەدەبی کوردیدا دروستکردووە .

ووشەی ( صعلوك ) لە رووی زمانەوە مانای هـــەژاری‌و پێویستی‌یە ، پاشان چەمکی ووشەکە فراوانتربوو تا باوەشی کرد بە مانای جوامێری ، پیاوەتی‌و کوڕێنی .. ئەمەش لەوەوە سەری هەلدا کە هەندێ صعلوك لە سەردەمی جاهیلی‌دا بـــە پیاوەتی‌و ئازایی‌و رووەت بەناوبانگ بوون ، ئەمانە دەولەمەندانی رژدیان تالان دەکرد ، تالانەکەیان لە خۆیان‌و لە هەژاران خەرج دەکرد . چەند شاعیرێکی وەکو ( عـــــروەی کوڕی وەرد ) ، ( تەئەبە طە شەڕڕەن ) ، ( سلیکی بن سەلەکە )و (شەنفەرا) لە بیابانی دوورگەی عەرەبدا هەلکەوتن کـــە ســــوارچاك‌و خانەدان بوون ، رێبازیان لە ژیاندا ئەوەبوو بۆ خەلك بژین ، بە زەبری شیر لە دەولەمەندانیان دەستاندو بەســـەر نەدارو لات‌و پیرو هەژارانیاندا بەش دەکردو بەشی خۆیان لە هی ئەوان زیاتر دانەدەنا .. ئەوەندەش بە خەم سەری خۆیانەوە نەبوون .

ئەمەش وەنەبێ کارێکی تاکو تەرایانە بێت‌و پەیوەندیی بە کەسەکان خۆیانەوە هەبێت‌و چ پەیوەندی‌یەکی بە کۆمەل‌و بـــە رژێمی کۆمەلایەتی‌یەوە نەبووبێت . نەخێر بەلکو ئەم مەسەلەی صەعلەکەیە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی‌و هونەری‌یە کۆمـــــەلی هۆزایەتی‌ی دوورگەی عەرەبی پێش ئیسلام پەیدای‌کرد .پاشان پەرەی سەندو کەوتە بەر مەرجی کات‌و شوێن ، ئەو گەلانەش کە موسلمان بوون لە حالی کۆمەلایەتی‌ی خۆیان‌و لە کەلەپووری خۆیانەوە رەنگو ســـــیمای تازەیان بۆ دیاردەکـــە زیـــاد کرد . بۆیە لە سەدەی چوارەمی هیجریدا لە بەغدا ئیبنی حەججاج‌و لە ئەندەلوس ئیبن قەزمان‌و لە میصر ئیبن عـــروس دەبینین . بنەڕەتەکانی دەوری صعلوکی بە پێی پێگەیشتنی مێژوویانەی ئەم دیاردەیە لە کۆنەوە تـــا ئێستا بەم جۆرە بووە کەوا باســـی دەکەین ، بە مەرجێك لە پال باس‌کردنی بنەڕەتەکانیشدا بـــۆ کورت بڕی بەراووردی خۆمان لە خسووس شێخ رەزاو شیعری شێخ رەزا تەواو دەکەین :

یەکێك لەو بنەڕەتانە، دژ وەستانە بەرامبەر بە رەووشت‌و نەریتی باوی کۆمەل‌و گوێ نەدان بە پەیڕەوو رژێمی کۆمەلایەتی . واش دەرکەوتووە کە ئەمانە لە دەورێکدا پەیدابوون کە کۆمەل تووشی خێورانەوەو هەلوەشان هاتووەو مژدانەی هاتنی بیرو باوەڕێکی تازە بلاو بوەتەوە .

شێخ رەزاش لە دوادوای دەوری دەرەبەگی‌و ئـــەکلیرکی رزیودا ژیاوە ، لەو باوەڕەدام گوێ نەدانی بـــەو نـــەریت‌و رەووشتە رەسمی‌یەی کە بلاوبوون لە زۆر لایەنی شیعرەکانیـــدا دەردەکەوێ . بە نموونە لەوەدا کە بێ پەروا باســـی ئەندامی زاوو زێی کردووە ، باس کردنی ئەمەش ( جگە لە لایەنە پێکەنین

هێنەکەی ) سەرکێشی‌یە لە کۆمەڵو دەرچوونە لـــە جغـزی هەستو زەوقی کۆمەڵ. ئەگەر نا هەموو کەسێك ئامادە نی‌یە بەم جۆرە جارِ بداتو دەنگی لێ هەلبرِێت .

هەمیسـان ئەگەر نموونە لە ئەدەبی عەرەبی وەربگرین سەیر دەکەین ( ئەبو نەواس ) یەکێك بوو لەو کەسانە کە سەرکێشی‌ی کۆمەلەکەیان دەکردو دژ بە نەریتو رەووشتی باوی ســەردەم دەجوولانەوە . نەك هەر ئەوە کە بە ئاشکراو بێ پەردە باســی مەی خواردنەوەو مەیخانەکانی دەکرد ، بەلکو گــەورەترین دەستووریکی شیعری عەرەبی تێك شکاندو شاعیرانی تریشـی لێ رزگارکرد جاران شاعیری عەرەب کە شیعری مەدحی دابنابا دەبوو لە سـەرەتادا بە باسی کۆچو کۆچباری یارەکـــەی‌و وەستان بە سەر کەلاوەو شوێن ئاگردانەکەی رەشمالی مالە بابی یاردا دەست بە هۆنینەوە بکات ئنجا وەرچەرخێتە سەر مەدحی مەدح کراوەکە .

ئەبو نواس لە باتی ئەوە هات یەکــەر بە باسی مەی‌و مەی خواردنەوە دەستی پێ‌کردو پەلاماری جۆری هۆنینەوەی شیعری کۆنی‌دا .

تۆ بلێی شیخ رەزاش بە دەستی ئەنقەســت دەستووری شیعری مەدحی شکاندبێتو هاتبێ لە مەدحی ئەحمەد پاشای باباندا پێشەکی بە وەسفی کورِ دەست پێ‌بکات. وەکو دەزانن چیرۆکێکی هەلبەستووە گوایا شتێکی وای لێ قەوماوە کـــە پێویستی بە یارمەتی پاشا هەیە . چیرۆکێکی پــرِ لە پێوەنانو زۆر دانە دەمی وا کە ( کاری خێری گوزەری کرد لە هەزار !!) بەجارێ خۆی تێدا ریسوا بکات ؟!

لە هەمووی سەیر تر وەسفکردنی رژێمی کۆمەلایەتی‌ی ئەوسای ئەستەمبۆلە . کەس لە تاوانو تاوانکار ناپرسێت . باس باسی ( قانوونی کیبار )و رەوشتی گەورەکانە کـە ئایا بەندو بەستی شکاوە یان نا ؟! ئەگەر پارەکە بداتو تاســێ رۆژ مۆلەت نەدۆرِێنێ ئەوە باشەو هیچ نەقەوماوە ، پاشـان تێ دەگەین مایەی دەم شیرینی‌و هەڵ خەلەتاندنو رێ بۆ تاوان خۆشکردن ئەوەیە کە تاوانبار دەلێ : « من زاتێکی شـەریفی گەورەمو مامۆستای وەزیرانم‌و هەموو شـامو خونکــاران من دەناسـن . سەرباقی ئەوەش سەد دینارم لـــە ناو کەمەربەندا هەیە ) .

هەر چۆنێك بێت دەست پێ‌کردنی شیعری مەدح بەم جۆرە لەلایەن شێخەوە گەلێ پرسیار هەلدەگرێ ؟ ئایا هەر لەبـــەر سەرکێشی‌و لەنەریت لادانبووە ؟ یان بۆ تێرکردنی ئارەزووی مەدحکراوو سەرنج راکێشانی‌یەتی بۆ ئەم جۆرە باسانە ؟ دەنا هیچ رایەلێك نی‌یە لە نێوان چیرۆکی رووداوەکەو لە نێوان ئەم وەسفەی وا لەو چەند دێرەدا گوێمان لێ‌ی دەبێت :

**یەعنی هەم نامی نەبی حەضرەتی ئەحمەد پاشا**
**فەخری دین ، کانی حەیا ، بەحری کەرەم ، کۆهی ویقار**
**مەدحی ئیحسانی بکەم ، عیلمی بکەم ، فەضلی بکەم**
**بەخوا خاریجە ئەوصافی حەمیدەی لە شومار**

.. .. ..

**تاوەکو دەورە بکاتو بگەرِێ چەرخو فەلەك**
**تاوەکو دێتو دەچێ ، بێتو بچێ لەیلو نەهار**
**بە مرادی بگەرِێ شەمسو قەمەر ، چەرخو فەلەك**
**ظەفەرو فەتحی قەرین ، بەختی موعین ، طالیعی یار**

بە راستی شیعرەکە بە پێشەکی‌یەکەوە کە بریتی‌بوو لــە وێنە نەخشانی لایەکی کۆمەلگای عوســمانی ، نموونــــەی رەووشتی چینی بالا کە خۆیشی بە یەکێك لە ئەوان دانــــاوە . ئەودرۆشاو کۆنی‌یەتی کە بریتی‌بوو لە هەلرژاندنی مەدح بە لێشاوو سـەوداو ماملەتی دوو بەرە ، لە دیوێکدا تا ئەوپەرِی بەرزی دوور لە بەشەر بەرز ، دیوێکیش تا ئەوپەرِی نــزمی لە چالو چالایی .. شیعرەکە بـەلگەی رزیوی‌و خێورانەوەی کۆمەلگاکە پێشان دەدات . باری راستی‌ی ئەوسا دەخاتە پێش چاو، بارو حالەتێك کە هاواری شۆرشو نوێکردنەوە هەلدەدا.

بنەرِەتێکی تر لە بنەرِەتەکانی صعلوکی ئەوەبوو کە ئەم ئەدیبـە سالووکانە رۆلەی چینی بالابوون ، یان بە هۆی بەهرەو توانای خۆیان لە باریاندابوو دەسەلات پەیدا بکەنو ببن بە یەکێك لە رۆلە دیارەکانی چینی بالا .

عروەی کورِی وەرد یەکێك بوو لە سەرۆکانی خێلەکەی، ئیبنی حەججاج خانەدانبوو تەنانەت وەزیفەی ( موحتەسیب)ی دیبوو لە دەولەتی بووەیهی‌دا ، هــــەروەها ئیبن عـــــرووسو سالووکەکانی تریش . بەلام هەموویان ژیانی ســەربەستانەو هەژاری‌یان لە ژیانێکی وێستاوی ناپەسند پێ چاکتربووە .

**شاهی کە نەبێ رادەبوێرِن بە فەقیری**
**بۆ ئەهلی قەناعەت لە بلاو خۆشترە داندوك**

ژیانێکیان مەبەستبووە وەکو ژیانی شێخ رەزا ، ژیانێك بێت بتوانێ بە کەیفی خۆی زمانی لەم‌و لەو رِابداتو قـــەی سەرزمانی نەگێرِێتەوە ، وەکو ئیبنی حەججاج بە ( هەجو )و هەرِەشەو شیعری بەزمە ساتو پێکەنین ئامێز مالو سامانی لە دەولەمەندو دەرەبەگو کاربەدەستانی دەولەت بستێنێ .

کێ دەتوانێ نەیداتێ ؟! ئەوەی نەیدا ، زمانی لێ دەخاتەکار کە:

**( زمانی من لە بۆ ئەعدا وەکو مارێکی ضحاکە )**
**( تۆ هەتە تیغی دەبانو من هەمە تیغی زوبان**
**فەرقی ئەم دوو تیغە هەروەك ئاسمانو ڕیسمان )**

ئیتر بەو چەکە بەگژ شێخو مەلاو ئاغاو سەرکردەو موتەصەریفو والیو نوێنەرو پاشا هەتا سولتاندا چووە ! جا لەتەك ئەوەدا کە وێستوویەتی شتیان لە چنگ دەربهێنێ لە هەجوەکاندا گەلێ دیمەنی کۆمەڵمان بۆ دەخاتە ڕوو ، مەسەلەی رەوشتی نێوان حەرەمی خانەدانان خۆبەخۆ،مەسەلەی بەرتیلو سیاسەتی ستەمکارانەی دەوڵەتی عوسمانی ، ریایی ، کاری ناڕەوای هەندێ لە دینداران لە ژێر پەردەی ئیرشادو تەریقەتدا:

**دووگەز عەمامە ، سێ گەز تەیلەسانو ، یەك گەز ریش**
**دوو سەد مرید ، رەوان دەر ڕیکابەش ئەز پەسو پێش**

بنەڕەتی سێیەم ئەوەیە لە ئەنجامی هەڵبژاردنی هەڵوێستی سەرکەشیو ڕام نەبوونو سەربەستی لە کۆتی نەریتەکانی کۆمەڵدا ، توانیان گەلێ ڕووی ئادیاری کۆمەڵ دیار بکەن . هەروەکو لە شیعری شێخ رەزادا تووشی سەدان ناوو سەدان شوێنو دێهاتو شارو وولاتو هۆزو بنەماڵەو خانەولدە دەبین، گوێمان لە چەندین ناوی ڕێبازی ئاینو تەریقەتو تایەفە دەبێت . گەلێ جۆرە ڕووداوو مامڵەتو گفتوگۆو شەڕو شۆڕو سولحو سازان دەبینین .

دەبینین شیعرەکەی لە ژیانی خەڵك نزیکەو دەرامەتو گوزەرانو هەڵسو کەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدا ڕەنگ دەداتەوە چ هەجوو ، چ بە زەمەسات .. ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی گرتووەو بە ئاشکرا ئامانجی ئەم جۆرە ئەدەبە دێتە ئاراوە ،لەم ڕووەوە هەر لە بابی هەژاریو سەعلووکیدا شێخ ڕەزا باسی حەوشەکەی خۆی دەکات :

**حەوشەیەکم هەیە بەقەدری لەپێ**
**ڕۆژ عیلاجی ئەکەم ، بەشەو ئەتەپێ**
**مەنفەذو درزو ئاودزی هەرچەند**
**دەیگرم ، دەیکوتم بەدەستو بە پێ**
**شەو کەدیم دەم دەکاتەوە وەکو هار**
**وا ئەزانم سەگەو بە من دەحەپێ**
**سەرو ریشم لە تۆزو قسڵو گەچا**
**وەك پلاستیکە پڕ لە ڕشکو سپێ**

هەر لەم جۆرە گاڵتە جاڕییە کۆمەڵایەتییەش لە عەرەبیدا نموونەیەکی هاوتای ئەم شیعرە ئەوەیە :

**( لي بيت كانه بيت شعر**
**لابن حجاج من قصيد سخيف**
**اين للعنكبوت بيت ضعيف**
**مثله وهو مثل عقلى الضعيف**
**بقعة صد مطلع الشمس عنها**
**فانا مذ سكنتها في الكسوف )**

بنەڕەتی چوارەم ، دیاردەیەکی ڕۆشنە لە شیعری ئەم شاعیرانە بەدیدەکرێت ئەویش ئازادییە لە هەندێ کۆتو زنجیری بینای شیعر کە بوونەتە دەستوورێكو نەریتێك هەموو کەس زاتی ئەوە ناکات خۆیان لێ لا بدات،یان پەیڕەویان نەکات، بێ گومان ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی سەربەستانەیانە لە ژیاندلو هونەرەکەیان ئاوێنەی دەروونی بێ گرێو گۆڵو بێ پەرڕوای خۆیانە .

عروەی کوڕی وەرد لە شێوەی باوی قەسیدەی جاهیلی لایداوەو ئەو تاسەو موعاناتەی دەربڕیوە کە ئەو ژیانە خۆویستەی خۆی بە سەریدا سەپاندووە ، هەروەها شێخ رەزاش لەگەڵێ بەندو بەستی کۆن لایداوەو هاتووە یەکەر جۆشی دەروونی خۆی سات بەسات دەربڕیوەو هیچی نەگێڕاوەتەوە،ڕوح سووکیو گیانی کۆمیدیو زیرەکیو دانەمانی تامو بۆیەکی تایبەتی بە شیعرەکە داوە .. پاشان نزیکی لە گەڵو زەوقی رەمەکی مەردوم یاریدەی داوە زیندووترین بێژەو گەشترین ووشەی سەر زاری خەڵکەکە بخاتە شیعرەوە و لە ووشە فەرهەنگییەکانو زاراوە قالب ڕێژەکان دوور بکەوێتەوە. گەلێ قافیەی تازەو نەسوواوی بە کارهێناوە کە جلەوی سەرنجی خوێنەرو گوێگر رادەکێشنو وەکو ترپەی مۆسیقا هەستی دەبزوێنن .

ئەمە جگە لە بەکارهێنانی چەند کاتێك لە یەك رستەداو دابەش کردنی وتووێژ لە نێوان چەند کەسێکدا ، وەکو لە شیعری ( شێخ هۆمەر ) و ( براژا ئەزیزەکەم ) و ( لەم ڕۆژە کە تۆرامو ) .. هیتریشدا هەر لەم بارەیەوە دەتوانم بڵێم شێخ خۆی لە هەندێ مەبەستی شیعر بە دوور گرتووە کە زانیویەتی بریتی دەبێت لە لاساییکردنەوەو کاوێژکردن بە داڕشتە کۆنەکانو بابەتانێك کە جۆشی دەروونی هەڵچووی خۆی نەگەیشتوەتێ یان هەتا دەیگاتێ سارد دەبێتەوە . بە نموونە بابەتی هەرە باوی شیعری ئەوسا کە دڵدارییە چ مەجازیو حەقیقی ، چ دنیاییو چ سۆفیانە .

# داشکەستنێ د چیرۆکێن ئەحلام

خوشکا ئەحلام وەك جیرۆك نڤیس هاتە ناسین ل سالاێت حـەفتێ یان راستتـر پشتی سالا «1974» ێ دەمێ رۆژنـامێت کوردی هندە چیروکێت وێ بلاڤە کرین .

براستی ئەحلام خانێ جهێ پێ خۆ یێ کری هەر چەندە گەلەك قەلەمان هێرشی دبرنە سەر دیار بۆ وان باوەر بشینا ژنا کورد نەبوو هندکا دگوتن ئەڤ چیروکە نە یێت وێنە بەلکی هندەك بۆ دنڤیسن .

هندەکي دي دگۆتن نەخێر خـودان بەهـرەیە دچیـروك نڤێسینێدا بەشێ سێ دگۆت پەلەنەبن ئۆحو کێت خوزی نەدەن ، دێ رۆژگار ڤێ چەندێ ئاشکرا کەت براستی روژگارێ دیارکر کینە خودان بەهرو شیانن .

گەلەکا لاپەرێت رۆژناما داگیر کر بوون بەلێ مخابن نهۆ یێت هشك بووین .

ئەڤ پێشکەیە مە گۆت دا بهێـنە سەر کاکلکا بابەتی .

ئـەحلام مـەنسوریێ وەك روداوەك ل ئـەدەبێ کـوردیدا جونکی ئەم شێنی بێژین جیروك نڤێسا ئێکانەیە یا خۆدان دەنگ دئەدەبێ کوردیدا .

هەتا نهو جیرۆك نڤێسێت کورد یێت نێر بەحسێ دەرون و «معاناتێت» ژنکێ دکر دگەل هەمی لایێت سەرکەفتی یێت وان جیرۆك نڤێسا بەلێ کەس نەشێت وەکی ژنێ خۆ بەحسێ غەم و ئاوات و دەردێت خۆبکەت .

ل ڤێرەدا ئەز نەشیم هەمی ئالێت چیروکی بگرم بەلێ تنێ دێ رەخێ داشکەستنێ دجیروکێت ئەحلامێدا گرم . پێش ئەم بهینە سەر هندێ مە دڤێت ڤان سێ جیروکا شروڤە بکەین ئۆل مخولکا هیر بدین .

دجیروکا « فەقی عەباسی و دیمەنیکی لە یـاد نەچـوو » دڤێ چیروکێدا ئەحـلام خان تکنیکـا ني بکار دهینێت بـەلێ دووبارە کرنا دیماهی یا جیروکی دو جارا ئەم دشین بێژین پر بێژي و زێدە گۆتنە کورتی یا ڤێ جیروکێ ئەڤەیە . لاوکێ هەی ناڤێ وی فەقی عەباسە یێ ل مزکەفتا گۆندی حەز ژ کچەکێ دکەت ناڤێ وێ مەلیحە ئەڤا ل ناڤ بەینا وان دهێت و دچیت کۆ ب راناوێ کەسێ سێیە تاك ناڤ دبت وەك دبێژێت رویشتم ... چاوم لێبۆ ... کردم ... هتد .

جیرۆك بدیماهی دێت دەمێ مەلیحا دبێە ییك دا بۆ مچێ قەساب دبن فەقەی عەباس ب دمانجەکێ بیکێ دکۆژیت خۆ ژی دگەل دراما جیروکێ هۆسا دەست پێ دکەت .

1 ـ **مەلیحاو عەباس گـەلەك ئێك و دو دڤیـا ڕۆژ هەبـو حەفت سەعەتا پیکڤە بوون .**

2 ـ **قارەمانا کۆ ب ناڤێ راناوێ کـەسێ سیهەمێ تـاك مە بناڤ بری دەورێ «مواصلات» هـات و برنێ دکـەت ئاخفتنا ل ناڤ بەینا هەر دوو کەسا دهینت و دبت .**

3 ـ **«مچـە»ێ عـەرەق ڤـەخـۆر گـەلەك هـەڤـالێ فـەقێ عەباسێیە مزکەفت نشین بـوو دایکا خـۆ دهینریتـە داخازێت مەلیحایێ یە .**

4 ـ **عەباس دبێژتێ رازی نەبـە هەتـا هەیڤـا رەمەزانێ تەمام دبیت ئەزدێ هێمە داخازیاتە .**

5 ـ **گۆزت و سووراڤ و سپیاڤ بۆ بیکی کرین .**

6 ـ **عەباسی ژ مزکەفتێ ئۆغر کر .**

7 ـ **کەژاوا . بیکێ کەتە رێ مچێ قەساب و مەلیحایێیە دەست خۆ تیك کرتن دەواتێ هەلایێ دەست پێ کر .**

8 ـ تەقە هاتە کرن و مەلیحە هاتە کۆشتن .

9 ـ **بشتی هنگێ عەباسی دەمانجە ب سەر خۆ ڤەنا ئۆ خۆ کۆشت** هەکە سەح بکەینە دراماو پرە پێدانێ ڤێ چیروکێ دبینین هەر وەك ئێك لە ئەفرازیەکێ بلند دبیت هـەتا چیـروك نڤێس دگەهینتە سەرێ چیایەکێ ڤێجا ژ وێرێ دهاڤتیە خارێ .

ئەڤە چیرۆکا پێشیێ ژ کۆمەلا «پرد» ئەم دێ هینە سەر چیـروکا دیمـاهییە ژ ڤێ کـومـەلێ کـۆ نـاڤێ وێ چیـرۆکـا « کۆشەییکی ژیانی رەعنا »

رەعنا کچەکا قەیرەو تەمەن چل سالە بۆ یـا بکەلەخ و پرچ زەرو چاڤ شینی و سوورو سپی هەمی گاڤا چاڤێ ل پشت دەرگەهی بۆ دقولکا دەرگەهی سەح دکرە ئەڤ زەلامێت هاتۆ چوێ دکەن بەلێ دەمێ ئەحلامێ دڤێت قارەمانا چیـروکێ ل پێش چاڤێت مە شیرین و خۆشتڤی بکەت دێ هێت قارەمانەکا دی دورست کەت ئەو ژی «ڤاتە» یە کۆ دبێژتێ فاتك کچکا قەیرو ناشیرین هەکە رۆژەکێ دو رۆژا دەم و چاڤێت پاقژ نەکربا دا سمبێلێت وێ وەکێ زەلاما لێ هێن هەر بڤێ چەندێ ناراوستێت ل دیڤ ڤێ ناشیرینێدا ب گێل و نەڤامی وەسف دکەت چـونکی هەکە چ کربا دابێژتێ چ نینە «ڤاتەیە» پشتی هنگێ هەر دهێت رەعنایێ ب باشي وەسف کەت کۆ گەلەك کراسێت هەین هەتا بۆ خەلکی هندەکا دریت . ئۆ دێ بـەحسێ ڤاتێ کـەت کۆ سـالێ

# مەنسورێ دا

انور محمد طاهر

کراسك ب دەست ناکەڤیت ئۆ دیسان راناوێ کەسێ سیهەمێ تاك ل ڤێرەدا پۆستە بەر بۆ دەمێ «قالە» دوکانا خۆ قەبات دکەت زێ خەبەرێ بۆ دهینیت بەلێ دەمێ زر دیکا قالی دەزانێت دڤێت بۆ کوڕێ خۆ بخازێت کو ناڤێ وێ سلیمانە ئۆ رەعنای هەر یا ل خیالێ قالە دای .

بەلێ دەمێ دهینتە خازکینیا تەمام دبیت برایێ وێ رازێ دبیت دبێژتێ بۆ سلیمانی کو تەمەنێ وێ پینج سالێو بێ ژن مریە دەمێ دبیتە سپێدە رەعنا خۆ دکوژیت و دبیتە تەرم .

«چیروکا چارە نووسی»

گەلەك ب ئەمانەت و راستەقینەو بێ شەرم بەحسێ دەردێ ژنا قەیرە دکەت و ئۆ هەکە شی نەکربیت . براستی هەکە ئەڤ چیرۆکە کچەکێ نە نفێسیبا یان «ئەحلام» نەبا کەسی نەشیا ڤێ چیروکێ مەهینیت چنکی راستگویا وێ تەمو لڤینەکا باشی یا دایە چیروکێ .

هەکە ئەم دگەل دراما وێ بچین دێ بڤی رەنگی دەست پێ کەین .

1 ـ کچەکا قەیرشی نە کریە هەمی گاڤا دایکا وێ ڤێ سوحبەتێ دگەل ڤە دکەت دێ کەنگی شی کەی ئەڤ ئاخفتنە ب موناسبەت یا بێ موناسبەت نەبەسی دایکا وێ دگوتێ بەلکو هندەکێت دی ژی هەبوون تەعنە لێدا ئێك ژوان «3» بۆ دەرچوییێ کۆلیێ بوو ڤێجا دەرد ئەڤەیە یێ ئەڤ بسیارە ژێ کوبا چیرۆك نفێسی دا ناڤێ وی بەت کو وەکی پیرە ژنێ یە ئۆ هەتا ب رەنگ و چاڤ و دەم وەك دبێژت ئەڤ [ م « راستە ئەمیان خوێندەوارە بەلام هەر وەکو پیرێ ژن وایە رەنگە پیرێ ژن باشتریش بیت »ل12 .

3 ـ کامیرا و ئاخفتن هەمی دچنە سەر سوحبەت و گیرو گرفتێت زافایێ وان کەریمێ خیشکا وێ نازەنین هانی هانی و تەقە تەقا ئاخفتن سەر وێ دچیت .

4 ـ دەنگێ زەنگا دەرگەهی تێت کەریمێ زافایێ وان تێتە ژوور هەمی خۆ ئامادە دکەن بۆ شەڕی دگەل وەك موقفێ ئینسانی راناوێ تاکێ سیهەم دەورەکێ دورست دکەت دبێژت مالا حەسەن بەکێ دێ هینە مالا مە ڤێجا ڤێ ئاخفتنێ مەعنا وێ گەلەك یا ئاشکرایە .

یەعنی «دێ هینە خازکینێت وێ بۆ کوڕێ خو قالی یە کو پێش چار سالا هاتنە بۆ خازکینا رێگەوت کو سێ جارا یا هاتی دڤێ چیروکێ دا ئۆ ئەڤ نیشانا ئالوز بوونێ یە ئۆ تێك دانا هونەرێ چیرۆکێ یە یا گرنك ئەڤ راستنیە دبیتە راست ئۆ ئێڤاری خازکینی دهێن و دایك و برا دکەنە کەیف بەلێ چارەکادی «دیماهی» هینانا [موهلسانێ] کاری دکەت ئۆ چیرۆك بدیماهیك هینانا داشکەستنێ تەمام دبیت . ئەو ژی دەمێ دبێژنێ ئەم بۆ «خزمەتکارێ» خۆ بێت هاتینە خازکینیا .

بێش ئەم بهینە سەر چیروکێت ئەحلام مەنسورێ مە دڤێت و پێدڤی یە یە ئەم پەنایێ بینە سەر هندە تیورەیێت «زانستا دەرونی» دا شاپێتێ بخینە سەر ڤان چیروکا، ڤێجا «داشکەستن چی یە» .

داشکەستن : حالەتەکە مروڤ هەست دکەت کو نەشێت ئارەزوێت خو بجە بهینیت ژ بەر تنکە بەرێت کەتنە رێگا مروڤی ژوان روژ کارێت بەر تنگاڤ و نەخوشی ڤێجا مروڤ تووشی داشکەستنێ دبیت ئۆ ل مروڤی دیار دبیت کو بێ نەرازیە ژیانا خۆ خەلکی»

ڤێجا ئەم دبێژین بۆچی قارەمانێت ئەحلامێ هەمی تووشی ڤێ داشکەستنێ دبن .

وەك فەقی عەباسی مزگەفت نشین و دلدار ئۆ مەلیحا یا روژ ئاڤا نەدبو هەکە نە دیتبا ئۆ مچەی قەسابێ هەڤالێ وێ هەر دو دگەرا خینێ گەفزین تووشی ڤێ دەردە سەرێ دین .

ئۆ ل جیروکا . چارە نووس ژ هەر ئەڤ دەردە سەری تووشی وان دبیت .

راناوێ کەسی سیهەمێ تاك دەمێ خازکینێ دهینێ «رفضی» دکەت کو دایکا هەر تەعن و ئاخفتنا تێ وەردکەت هەتا دگەهتە هندێ خاستی دهێن و گەیڤا هەمیا دهێت دیماهی یە دیار دبیت کو بیت هاتین خازکینا بۆ کوڕێ خزمەتکاری خۆ .

یان کەریمێ زاڤایێ وان دگەل خیشکا وێ دڤین ژیانا خۆ دگەل ژنا خۆ ب ( بەردانی ) دیماهی بیت چنکی کەریم مروڤەکێ داشکەستی یە نەشیت وەکی خەلکی ئەسبابیت ژیانا سەرفەراز پەیدا بکەت یان جیروکا « گوشەیەکی ژیانێ رەعنا » هەر بۆ وێ ئیحباطێ هینایێ بدیماهی دیت چنکی رەعنا چەند سالا یا ل هیڤی بۆ کو «قالە» بێتە شاسوارێ وێ ئۆ هەمی روژا د بەر دەرگەهی دەما کا کەنگی دێ قالە دوکانێ قەبات کەت روژا دایکا قالی هاتنە خازکینا دەرکەت نەبو قالەیە بەلکو بۆ زرکوڕێ وێ سلیمانی یە کو تەمەنێ وی پینجی سال زیدەتر ئۆ ژن مریە .

یان «ئەحلام خان» هوسا تێ جیهانێ تێنتە پێش چاڤێت مە کو خەلکێ تێدا هەمی داشکەستنێ بۆ مروڤی چێ دکەت وەك ل چیروکا سەرەتایەکی بۆ مروسێن نوی دەمێ شەشی سەعەت ل دائیری هەر بەحسێ مروڤکی نە ناسراو دکەت کۆ نڤیسەرا تووشي داشکەستنێ دکەت .

چار وی بێ ناڤی هوسا وەسف دکەت کۆ هەمیا تووشی داشکەستنێ دکەت . یان هەر زەلامەك دبیتە ئەگەرا داشکەستنێ ئەو ژی دگەلەك چیروکێت ئەحلامێدا یا هاتی وەکی چیروکا ل گۆرستانرا ئەڤە لایەکێ چیروکێت ئەحلامێ یا دی کۆچیروکێن وێدا دیار ئەو ژی کریا ئەلکترا کۆ ئەوە کچا رەق ل دایکا خۆ دبیت ئەو ژی غیرەتێ ژ جنسێ خۆ دکەت پێچەوانا کریا «ئۆدیب» ە کۆ کور حەز ژ دایکێ دکەت « هەر پەندە کا دێ چیروکێت ئەحلامێ دێ تحملا » ڤێ هندێ کەن یان ئەڤە زێدە بارە بەلێ ئەڤا مەگۆتی وەك میەکێ رەش ناڤ ماستی یا دیارە ئۆ ل سێ چیروکا گەلەك ئاشکرا دیار دبیت

1 - ل جیروکا «فەقێ عەباسی ژیانەکا دی»

«ل[6] هەلسە لێرە سەر خورە ئەلێ ی دلی ئاگای لی بوورازی نەبو خوی بکورێ دەتووت دەزانێ مەلیحە دەکوژری»

یان دەمێ دایکا وێ سێنیا خارنێ داڤێ دا بچیت مزگەفتێ فەقی عەباسی چەند فایتحا لێ بخێنیت دا هێتەڤە

«ها چەند فاتیحای خوێند ل[14]

- چوار

- شەڤا زللەییکم بەر دەکەوت ژ دایکا وێ ئەڤ کریا ئەلکترا دەڤ ئەحلامێ زێدە دبێت ئۆ تەعلو ترشي نەخوشي هەر ل ناڤ بەینا وان پەیدا دبیت .

«ل جیروکا چارە نووسی»

. دەمێ دەبیتە بەحسێ شي کرنێ هەر چەندە دەمێ دایکا دێ بەحسێ شیا کچێت خەلکی دکەت دبێژیت «نەسیبە» وەکی دبێژتە وێ ئەو دبێژتە دایکا خۆ نەسیبە دایکا وێ بەر دبیتە ناڤ چاڤا ئۆ دبێژیت نەسیب نەسیب تەرەماشی[21]

یان دایکا وێ ل بەر چاڤا دبیتە دورندە ئەو ژی نێچیر دەکەفتە دەستا دبێژیت .

[25][پیرێ ژن هەر کە دەبینێ بێ دەنگ وملم کەچ کردوە وەکو ئەوەی نێجیرێکی برینداری دەست کەوتبێ ونەیەلێ لە دەستی بچێ بە کوتەك تێ بەر دەبێ ئاوها ئەم سەر ئاسنینە بەقسە تێم بەر دەبێ]

یان دەێ دچیتە شارێ ئەلوندی ل مال کارەب ڤەمەربێت دبێژتە دایکا خۆ کا شەمالەکێ دالبەر بنڤێسم دایکا وی ب فرسەت دزانیت [ل[23] زەهری مار قورلقورت کچی عالەم لە نازو نیعمەتا دەژین مالیان منالیان سەیارەو مێردو وەزیڤەیان جێ ی شوینینان تویش لە باتی هەموو ئەمانە چرات دەوێ تا بنووسی چی دەنووسی بۆ دەنووسی تاکەی دەنووسی» ئەڤ گرێیە روهن ئاشکرا دبیت هەچکو ئەو دایکا خۆ بوینە کێرو پەنیر .

یان هندە جارا وەکی سادیەت هەبیت دجیروکێن وێدا کۆ دەمێ قارەمانێت هەمی تووشی گۆشتنێ دبن نەمازە دجیروکا [فەقێ عەباس و دیمەنکی ل یاد نەجۆ»

دەمێ مەلیحە هاتیە گۆشتن دچیتە سەر تەرمێ ئەوندە بەحسێ ڤی دیمەنی دکەت کۆ گەلەکێ جوان و نایەبە[°] مەلیحە راکشابو گۆللە ییکیش لە نیوان هەر دوو مەمکیا گیر ببو خوینی سنگی مەلیحەیش وەکو تاڤگەییکی سەر بەرەو ژوور فەوارەی دەکرد کراسە سپی یەکەی بۆ کێنی سوور دەم و چاوی نووقاند بوو «یان ل دیڤدا دبێژن کەچی دایکم وباوکم مردنیان ئەکرد قەدلە گەل جۆری مردنی مەلیحەیەکی نەدەگرتەوە بەهەر حال نیگای روخساری مردو ئەو شتە ترسانەکەی لە میشکمەدا نە چەسپان»

هەرچەندە ئەڤا مە گۆتی هەر دبێت ل کۆنەلێت رۆژهەلات وەك جورج طرابیش کۆ دبێژت [ل کۆ مەلەکێ ژێر دەستی زەلامی بیت ئۆ رۆژ هەلاتەکێ پاش کەفتی ئۆ باوەریا مکوم هەبیت ب ئایدلوجیەکا هشك ئەڤا ماڤێ دەست هەلاتییە ددتە زەلامی دێ پیوەندێت زەلام و ژنکا دو بەرێت ژێك جودا دبن وەك فروید دبێت نەخوشي و ئۆ سەررێك چونەکا گەلەکا ئاشکرایە کۆ دبێژن سادیت سەرکەفتنە بۆ زەلامییە ئۆ مازوکیەت سەرکەفتنە بۆ ژنان چنکي پیوەندیت ژن ومێرا دبنە بن دەستی زۆر دارێ .

ژێدەرکان


1 - پرد : « کومەلە چیرۆك » ئەحلام مەنصور

2 - في علم النفس الاجتماعي

3 - شرق وغرب رجولة وأنوثه جورج طرابيش

مەلا مسعود (بێبەش)



کات وەکو خەنجەر وەهایە نەیبری ئەو دەتبڕی
بیبڕە ئازابە زوو بە پێش ئەوەی ئەو بتبڕی

# هەستی هەستیارێک

هەستیارو شاعیرێکی بێریام
گیانفیدای هەرکوردی مەردی گیانفیدام
نانەوێنم سەر لەبۆ کەس تاکو هەم
هەربەسەربەستی هەتا ئێستا ژیام
هەربەسەربەستی ئەبێ بمرم لەبۆی
هەربەسەربەستی ئەدەم ئەوسا وەلام
تف لە هەستێ هەستی سەربەستی نەکات

ژینی بێسەربەستی هیچە من لەلام
سەر بە سەربەستی جوانە موختەسەر
هەستی سەربەستی نەبێ سەر نیتی سام
هەستە بەسینێتی هەتاکەی هەستنەکەی
مردی قەبرت لێ هەموو هەستا وەلام
(بێبەش) ی بەشدار ئەبی گەر هەستبکەی
هەستە گەر بێهەستی هەستە تۆنەفام

# شیعر و کارەسات

جلال مدحت خۆشناو

ووتوویانە شیعر بووکە
شیعر سوارێکی چاپووکە
بەلام ئێستا بەداخەوە
بووکەو تالای ڕەشی بەسەر !
سوارە بەبێ ڕمو خەنجەر !
ووتوویانە شیعر بانگە
شیعر مانگە ...
بەلام ئێستا لە ناخەوە
بانگی هاواری دراوە !

مانگی چواردەیە گیراوە !
داپیرەم کاتی خۆی ئەیگوٚ
پڕ مستی سینگی ئەیەڕوٚ :

کە مانگ گیراو کەوتە خەتەر
ئەڕوا بەرمو زاری نەهەنگ

تاکو لە دەوی بێتە دەر
پێویستە بە ڕێژنەی تفەنگ
ڕێژنەی تفەنگ !!

● مەجید ئاسنگەر ●




# لەبەر رۆشنایی هەڵبەستێکی «عەونی» دا

ئەدیب وەك هەستیارێکی ووردبین هەموو رووالەتێکی دەورو بەرەکەی دەبینێ‌و سەرجەمی هەڵسو کەوتو نەریتو جوولەی ناو کۆمەڵەکەی شان بەشانی دیمەن‌و تابلۆ رەنگینە سروشتییەکان سەرنجی رادەکێشن ، جا هەر ئەدیبێ بە گوێرەی ئەو بابەتەوە کە دەیەوێت لە بارەیەوە بنووسێت‌و بەگوێرەی تواناو رۆشنبیری‌و جۆری بۆچوونەکانی خۆیەوە بەشێوازێکی تایبەتی‌یەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو دیاردەو نەریت وەیا ئەو ئاکارە سروشتییانەوە دەکات .

زۆربەی ئەدیب‌و هونەرمەندان زۆربەی کات بەشێوەیەك لەو بابەتانەوە دەکۆڵنەوەو لێیان دەدوێن‌و دەیانخەنە روو کە لەگەڵ ئامانج‌و ئارەزووەکانی خۆیاندا دەگونجێت ، واتە : خۆیان چۆنی حەز پێدەکەن ئەئاوا رووداوەکان هەڵدەگێڕنەوەو نەشتەری رەخنە سازییان تیادا دەخەنە کارو سەرەنجام بەو بارەیاندا دەسووڕێننەوە کە مەرامیانە ، چونکە بڕوایان وایە ئەو شێوەیەی ڕووناکی‌یان پێوە خستۆتە سەر بابەت‌و ڕووداوەکانەوەو ئەو ئەنجامەی بۆیان دەسنیشان کردوون لەخزمەتی کارەکاندایەو بەسوودی بەرەو پێشەوە بردنی کۆمەڵگاکەیان‌و گەشە کردن‌و سەقامگیری نەریت‌و یاساو ڕەووشتە بەرزە خێر خواکانەوە دادەشکێتەوە .

جاری وایش هەیە ئەدیب‌و هونەرمەند هەندێ دیمەن‌و جۆری ژیانی ناو نەتەوەکەی چۆنە هەر وەك خۆی تۆماری دەکات‌و بەبێ دەستکاری هەروەکو ئاوێنەیەکی پاك‌و بێگەرد نیگاری وێنەکە دەکێشێ‌و وەك بەشێك لە ڕابوردووی گەلەکەی بۆ وەچەکانی پاشە رۆژ بۆ مێژوو دەیخاتە پێش چاوان .

لێرەدا هەڵبەستێکی شاعیری نەتەوەیی کورد (عەونی)[1] پێشکەش بە خوێنەرانی (کاروان) ی خۆشەویست‌و هەموو خوێنەرێکی کوردی بەڕێز دەکەین کە لەسەر جۆری ڕابواردن‌و دابودەستووری ژیانی گەنجانی شاری (کۆیە) ی داناوە لە نێوانی ساڵەکانی سی‌و چلەکانەوە هەتا سەرەتای پەنجاکان : وەك خۆی تیایدا بەشدار بووەو ناوی ئەو شوێن‌و جێ نەزرگانەی تیادا هێناوە کە ئەو سەردەمە سەیرانگاو جێ ژووانی بەهارانی هەرزەکارانی کۆیە بوون : ناوی هونەرمەندو مەقامبێژە دەنگ خۆشە ناسراوەکانی ئەوسای بردووە لەتەك جۆری مەقامەکانیان هەروەهایش جۆری ئەو خشڵ‌و زێڕو زەبەرەی لەبیر نەکردوون کە ئافرەتی ئەو رۆژگارە خۆشانەی (کۆیە) خۆیان پێ ڕازاندوونەتەوە .

**فەرموون ئەمەیش ئێوەو هەڵبەستە بە تامو ئاودارەکەی کاك (عەونی) ی شاعیر .**

**دانیشە لام خۆشەویستم**<br>
**دەستت بێنە بیخە دەستم**<br>
**داستانێکە نەك ئەفسانە**<br>
**باسی کۆیەی خنجیلانە**<br>
**وەکو دەڵێن : هەبوو نەبوو**<br>
**لە رۆژگاری رابووردوو**<br>
**ئێمە منداڵ بووین لاو بووین**<br>
**چوستو حالاکو پاڵاو بووین**<br>
**وەرزی بەهار ، رۆژی هەزار**<br>
**سەرچل دەگەڕاین وەك هوزار**<br>
**( ئۆمەرخوچان ) ، ( باخی شەمە )[2]**<br>
**سەیرانگای شاربوون ئەو دەمە**<br>
**( شاخی مشکە ) وەك کێوی توور[3]**

ئەدرەوشایەوە دوور بە دوور
سەر ( قۆنگرە ) و ( کانی بسکان )[4]
( کەندەکۆخ ) و ( سەر پلووسکان )[5]
لە ( حەمامۆك ) تا ( زایەران )[6]
دەبوو بە کوڕی شایەران
هەیبەت سولتان تا ( پوور تاوس )[7]
جوانتر لە شاری کەیکاووس
ناو باخەکانی ( تۆبزاوە )[8]
وێنەی بەهەشت بوو ڕازاوە
خێزان خێزان دەستە دەستە
دادەنیشتن وەك گوڵ بەستە
سەماوەری زەردی مسوار
قۆریەی سوورو پیاڵەی گوڵدار
چێشتو نانو هێلکەی کوڵاو
ماستو پەنیر ، گۆشتی برژاو
ژن لەگەڵ ژن : پیاو لەگەڵ پیاو
هێندێك خێزانیش تێکەڵاو
پاشی خواردنو خواردنەوە
ئەمجا دەبووە کۆ بوونــەوە
هەڵپەرکێو شایی شێخانی
دڵدارو دولبەر تێکەڵاو
دەست لەناو دەس بوو کیژو لاو
دیمەنی کیژی ئەو کاتە
دەتکووت فریشتەی ئاواتە
تاسی لەسەر ، تاسی زێڕین
لاگیرەو دەسرۆکەو پۆشین
گوارەی زێڕی بە لەرزانە
پۆیلەو ملوانکەو گەردانە
باوونج لەسەر سوخمەی سووری[9]
دەیبەست لە سینگی بەللووری
کەمبەرەی زیوو هەیاسە
هەرکەس دەیبینی : دەتاسا
گۆزینگ بە خاشخاشو خلخاڵ[10]
سەرو سەرپۆش ، ملو دەسماڵ
لەپێی سۆڵو پانی بەرزی[11]

لەنجەو لارو بالای بەرزی
کچی کورد بەم وێنەو شێوە
ئەوسا وا دەچوو بەڕێوە
لە بێگەردیو داوێن پاکی
چووبوونە باوەش خوای چاکی
دەبوو بە شاییو ڕەشبەلەك
تێکەڵ دەبوون حوورو مەلەك
وێنەی فریشتەو بەهەشت بوون
پۆل پۆل سەیرانکەر لەگەشت بوون
(عەزە) کە زوڕنای دەژەنی[12]
دڵی دلدار ڕادەچەنی
دەنگی دەهۆڵ دەبڕایەوە
شایی تەواو دەکوژایەوە
دەبوو بە بەزمی سازونەی
مەیگێڕ دەیگێڕا جامی مە ی
( پەندی لەشکریی ) بەشمشاڵ[13]
بۆی دەگوتین ( حەمەی خەیاڵ )[14]
دەنگخۆشان ، گۆرانیی بێژان
هونەرمەندانو بوێژان
دەنگی خۆشی ( خاڵە سێوە )[15]
سەدای دەداوە لەو کێوە
کراسی شەنگێ ، شەنگ مێرەمە[16]
مەقامێکە وێنەی کەمە
( نیوە شەوو سوارەو سەحەر )[17]

ئازیزو پاییز بوکگە و هەر
ڕێکو پێکو سافو ووردن
ئاوێنەی رابووردووی کوردن
دەنگی خۆشی ( کاکە مەلا )[18]
بە ئاوازی ( شۆرو سەبا )
بەیاتو دیوانو نەوا
دەشتو ماهوورو چووارگا[19]
ئەمجا بەستەی ( شلەو خانان )
دەیانگووت لەسەر گوێی بانان
( گۆجەو کەچەڵ ) سێوەو مەلا[20]

هەر چوار بەیەك نەزمو نەوا
کاتی ئێواران ڕۆژئاوا
بووکیان دەهێنا بۆ زاوا
( ئەحمەد ) بە ئای شیرینی بەهار[21]
خۆشتر لە ئاوازی هوزار
لە ئێوارە تا نیوەی شەو
خۆشتر لەبەزمی کەیخوسرەو
بەزمو ئاهەنگو شادی بوو
دوور لە خەمو بێدادی بوو
نەك وەك دۆستو ئاشنا بووین
هەموو لەگەل یەك برا بووین
نە سینەماو سینەما بوو
ئەوسا هەلپەڕکێ سەمابوو

**پەراوێزەکان :**

1 — مامۆستا کەریم شارەزا . گۆڤاری (کاروان) ژمارە — 3 — ل 15 .
2 — دوو باخی بە ناوبانگی باوکی مامۆستا کەریم شارەزان : سەیرانگای دلڕفێنی کۆیە بوون .
3 — سەیرانگایەکی تری کۆیە بوو نزیك بە دوو باخەکەی پێشەوەیە .
4 — دوو شوێنن یەکەمیان لەسەر باخەکانی کۆیە دادەروانێتو دووەمیان لە دامێنی هەیبەت سولتانەوەیە .
5 — کەندە کۆخ نزیك سەرچاوەی حەمامۆكو سەر پلووسکان ڕەزێکە لەسەر گەرمووکدا ـ هەردوو سەیرانگا بوون
6 — حەمامۆك سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی کۆیە یەو بریەتی لەڕەزو باخ . زایەران یاخود چاك وەیا لوولەی زایە رانیشی پێدەلێن کەوتۆتە خوارووی ڕۆژهەلاتی کۆیەو سەیرانگا بوو .
7 — سەیرانگاو شوێنی نیاز خواستنی ژنان بوو لە داوێنی هەیبەت سولتانەوەیە .
8 — گوندێکی بچووکی پڕ لە باخو سەیرانگایە ، کەوتۆتە پال شاخی باواجی یەوە نزیك (سیطرە) ی سەرڕێی هەولێر .
9 — لەزیو دروست دەکرا ، تایبەت بوو بۆ سووخمە .
10 — دوو جۆر خشلن بۆ پێی ئافرەت بەکار دێن .
11 — دوو جۆرە کەوشن یەکەمیان لەشاری کۆیەو دووەمیان لەسلێمانی دورست دەکران .
12 — ناوی زوڕنا ژەنێکی کۆیە بوو .
13 — مەقامێکە بەشمشال لێدەدرا .
14 — شمشال ژەنێکی بەناو بانگ بووە .
15 — سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندە .
16 — و 17 — ناوی ئەو مەقامە ڕەسەنانەن کە سێوەی هونەرمەند دەیانی چڕین
18 — مەلا ئەسعەدی هونەرمەندی دەنگخۆشە .
19 — مەقامەکانی مەلا ئەسعەدن .
20 — خوالێخۆشبووان وەستا محمد امین کەبابچی و کاك قادری حەمامچی : دوو دەنگخۆشی کۆیە بوون .
21 — خوالێخۆشبوو ئەحمەدی حمە مەلای باوکی هونەرمەندی لێهاتوو کاك ووریا ئەحمەد زۆر دەنگخۆش بووەو هونەرمەندێکی ڕەسەن بووە .

# چەند پارچەیەك

## (1) هەرچەند جارێ ....

هەرچەند جارێ کتێبێك
دەربارەی ژیانی ناودارێك دەخوێنمەوە ،
لە دلی خۆمدا دەلێم :
تۆبلێی ئائەمە ئەوەبێ
کە دانەر پێی دەلێ سەرگورشتەی مرۆڤێك ؟
تۆبلێی دوای مردنی منیش
یەکێك بێ ئاوا سەرگوزشتەمی منیش بنووسێ ؟
( هەروەك کەسێك هەبێ
بەڕاستی چمکێك لە سەرگوزشتەی من بزانێ !
ئەوەتا خۆشم زۆر جاران دادەمێنیمو
ناتوانم شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی خۆم هەلکرێنم
جگە لە چەند هێمایەك
جگە لە چەند سەرەدەزوویەکی کالبۆوەی
کلافەیەکی لە دەست بەربووی خۆتەفرەدان
ئەویش بۆ هیچ نا ،
هەر بۆئەوەی بیکەمە هەوێنی ئەم چەند دێرە )

## (2) بۆ دەنگبێژێك

فەرموو ، ئەوە بەهرە ، پێشکەشت بێ .
تا ئێستا بۆ پالەوانێك ،
بۆ حەتیبێك ،
بۆ ژەنە رالێکم هەلگرتبوو
بۆ کەسێکم هەلگرتبوو
کە خزمەتی دوزە[1] پیرۆزو دێرینەکەیی پێ بکا .

عەبدوڵلا پەشێو

لە ئینگلیزی یەوە وەریگێڕاوە

# شیعرێکی والت ویتمەن

خزمەتی پێشکەوتن و
ئازادیی نەتەوەو بیرە مەزنەکەیی پێ بکا ،
بۆ کەسێکم هەڵگرتبوو
کە دوژمنی ستەمکاران بێ
سەرکێشێکی بەجەرگ و زیخ(2) بێ ،
کەچی دەبینم
ئەو خەڵاتەی ئەو هەموو وەختە
بۆ ئەوانم هەڵگرتبوو
بەقەد ئەوان شایانی تۆشە .

(1) دۆز : مەسەلە ، قضیة .
(2) زیخ : ئازا .

(3) کوا ، کام جێگە ...

کوا ، کام جێگە گەمارۆدراوە ؟
کام جێگە گەمارۆدراوەو
بێ هوودە هەڵپەدەکا گەمارۆیەکە بشکێنێ ؟
ئەوەتا ، بۆ ئەوێ ،
من سەرکردەیەکی پشو درێژ ، دلێر ، نەمر دەنێرم .
سوارچاک و پیادەو
جبەخانەو تفەنگچیی ئەوتۆ دەنێرم هاوتان یان نەبێ .

(4) ئەی کتێبخانە بەفیزەکان ...

ئەی کتێبخانە بەفیزەکان
دەرگاکانتان لە ڕووم دامەخەن ،
چونکە من شتێکم بۆ هیناون
کە تاق و ڕەفکە تێرو تەسەلەکانتان بەدوایدا دەگەڕێن .
ئەوەی بوم هێناون کتێبێکە زادەی جەنگە .
لە کتێبەکەی مندا ، وشە بێبایەخە ، مەبەست هەموو شتێکە ،
کتێبەکەی من گۆشەگیرە ، لەگەڵ ئەوانی تردا دانووی ناکوڵێ و
هۆش و فامی مرۆڤ پەی پێ نابا ،
بەلام ئەو ڕازەی تیا نەمدرکاندووە ،
لەسەر هەموو لاپەڕەکان دڵەکوتێ یەتی .

(5) ئەی شاعیرانی دواڕۆژ

ئەی شاعیرانی دواڕۆژ !
ئەی خەتیبان ، نەغمەخوانان ، مۆسیقاژەنانی دواڕۆژ !
(ئەمڕۆ) ناتوانێ پاکانە بۆ من بکا ،
وەلامی ئەوەم بداتەوە : بۆچی من هەم ،
بەلام ئێوەی هاوخوێن ، ڕەسەن ، پاڵەوان
مەزنترن لە هەموو ئەوانەی پێش خۆتان ،
بۆیە ئەبێ بێنە سەر دنیاو پاکانە بۆ من بکەن .
من هەر ئەوەم لەسەرە
یەک ـ دوو وشەی بەکینایە بەجێ بێڵم بۆ دواڕۆژ .
من بۆ یەک لەحزە دەردەکەوم و
بە هەڵەداوان و تالووکە دەخزێمە ناو تاریکی .
من کەسێکم بێ وچان ، بەناو ئاپۆرەی خەڵکدا تێدەپەڕم ،
بەئاستەم ، بە تیلایی چاو ،
سەرنجێکتان دەدەم و ڕووی خۆمتان لێ وەردەگێرم ،
چەسپاندن و ناساندنی ئەو سەرنجە بە ئێوە دەسپێرم ـ
ئێوە جێی ئومێدی هەرە گەورەی منن .

### (6) سەردەمێکی دوورو درێژ بوو

سەردەمێکی دوورو درێژ بوو هەڵخەلەبووین ،
بەلام ئێستا گۆڕاوین .
وەك چۆن سروشت خۆی بە دیلی ڕادەپسکێنێ
ئێمەش ئاوا ، بە کارامەیی ، خۆمان ڕادەپسکێنین .
ئێمە خۆمان سروشتین و
سەردەمێکی دوورو درێژ ون بووبووین و ئێستا
گەڕاوینەوە :
بووین بە دەوەن ، قەوی‌دار ، گەلا ، ڕەگ و ریشە ، توێکڵ ،
بە زەمیندا چووینەتە خوارەوە .
ئێمە زنارین ، داربەڕووین و لەتەك یەکدا
لە دەشتێکی کاکی بەکاکی ڕواوین .
ئێمە جووتێك ئاژەڵین لەناو مێگەلێکدا دەلەوەڕێین
ئێمە جووتێك ماسیین لەناو دەریایەکدا مەلەدەکەین .
ئێمە وەك گولە خرنووکین ،
بەیانی و ئێواران بۆن و بەرامە بە تەلانٍاندا بلاودەکەینەوە .
ئێمە کولکی زبری دڕندانین ، میوەی ڕزیوین ، مەعدەنی ژەنگاوین

ئێمە جووتێك بارنی گۆشتخۆرین
بەئاسمانەوە لەنگەردەگرین و سەرنجی زەوی دەدەین .
ئێمە جووتێك هەتاوی هەرەگەشین .
ئێمە هەم خرین وەك گۆی زەوی ، هەم ئەستێرەیین .
ئێمە جووتێك ئەستێرەی کشاوین .
ئێمە جووتێك دەعباین ،
لە جەنگەڵدا خۆمان مەلاس داوە ،
تا لەپڕ بۆ سەر نێچیرێك بارزەقە ببەستین .
ئێمە جووتێك پەڵەهەورین ،
کە دەمەدەمی چێشتەنگاوان و دوای نیوەڕۆیان
ئاسمان تەی دەکەین .
ئێمە جووتێك دەریای تێکەلاوین .
ئێمە جووتێك شەپۆلی خۆشنوودین ، کە پەیتا پەیتا
یەکتر لەهامێز دەگرین و تێك دەکەینەوە
ئێمە وەکو هەواین ـ شت دەگوێزینەوە ، شت دەقۆزینەوە .
بۆ هەموو شتێك سەرەتاین و سەرەتا نین .
ئێمە بەفرین ، بارانین ، سەرماین ، ، تاریکیین ،
ئێمە جگەرگۆشەو ئیکسیری ئەم زەوی‌یەین .
ئێمە هێندە بەدنیادا سووڕاینەوە ،
تا گەیشتینە ناو ماڵەکەی خۆمان .
ئێستاش ، ئازادی و شادی نەبێ ،
دەستمان لە هەموو شتێکی‌تر بەرداوە .

### (7) کە وەك ئادەم لەگەڵ شەبەقی بەیانیدا

کە وەك ئادەم ،
لەگەڵ شەبەقی بەیانیدا ،
بە گورج وگۆڵی و چاوی تیژخەوەوە ،
لە خانیلکەکەی خۆم دیمەدەری و بەلاتا ڕادەبوورم :
تۆ لێم نزیك بەوە
سەرنجم بدە ، گوێ لە دەنگم بگرە .
کە من ڕادەبوورم ،
تۆ وەرە ، بەئاستەم ، ناولەپی خۆت
بە لەشمدا بێنە ،
تۆ قەت لە جەستەی من سڵ مەکە .

### (8) خەونم بە شارێکەوە دی

خەونم بە شارێکەوە دی
کە لە هەموولایەکی دنیاوە هێرشی دەکرایەسەر ،
بەلام قەت زەفەریان پێ نەدەبرد .
لە خەونمدا :
ئەو شارە شاری نوێی هاوڕێیان بوو ،
هەموو شتێك لەو شارەدا
ملکەچی ئەوینێکی بەتین بوو ،
ئەو ئەوینەی ، هەر ساتێك ،
لە هەر کردەوەیەکی ،
لە هەر نیگایەکی ،
لە هەر وشەیەکی پیاوەکانی ئەو شارەدا خۆی دەنواند

# پێشینەکان

شیعری
ت . س . ئیلیوت

« حەیدەر کەریم »
لەئینگیزیەوە وەری گێڕاوە

1

ئێوارەی زستان داهات
بۆنی گۆشتی سوورکراوە
لە دالانەکاندا دێ ...
کات ژمێر شەشە
پاشماوەی جگارە سووتاوەکانی ڕۆژانی دووکەڵاوی
ئێستاش لێزمەی باران
گەڵا ژاکاوەکان و ڕۆژنامە تەڕەچواوەکان لە شوێنە خاڵیەکاندا
لەبەر پێتا ڕادەماڵێ
باران دەتکێتە سەر پەردە . و نجرەکان و دووکەڵ کێشەکان
لە سوچێکی شەقامەکەدا
تاقە ئەسپی گالیسکەیەک هەڵمی لەدەم هەڵدەستێ و
سمکوڵ دەکا
ئینجا چراکان هەڵدەگیرسێن :

2

بەیانی دێتەوە هۆش
لەبەر پاشماوەی بۆگەنی ئاردە مشارەی پێشێلراوی
شەقام .
کە بۆنی بیرەی لێ دێ
لەگەڵ هەموو پێیە قوڕاویەکان بەیانیان زوو
دەیان پەستنەوەو ڕوەو قاوەخانە وەختیەکان
دەکەونە ڕێ
ئەو کاتەی چەند دەها شتی تر خۆیان دەسەپێنن
تا یەکیک بیر لەو دەستانە بکاتەوە کە پەردە
پیس و کەچلاوەکان لە هەزارەها ژووری
ڕێکخراودا دەکەنەوە

3

تۆ بەتانیەکەت لەسەر خۆت لادا
لەسەر گازەرای پشتێ ڕاکشای و چاوەڕوانیت دەکرد .
خەو دەتی بردەوەو سەرنجی شەوت دەدا ،
هەزارەها وێنەی دژواری بۆ ئاشکرا کردی .
کە گیانت لێیان پێك هاتبوو ،
ئەوانیش بەرەو بنمیچی ژوورەکە فڕین .
ئەو کاتەموو جیهان گەڕایەوە .
تیشك لە نێو پەنجەرەکاندا دەخزایە ژوورەوە ،
تۆ لە چەمەکاندا گوێت لە جریوەی پاسارەکان بوو ،
تۆ بە چەشنێك سەیری شەقامت دەکرد
کە شەقام بەدەگمەن تێی دەگەیشت
لە لێواری پێخەفەکەتدا دادەنیشی ،
لەو شوێنەی پەرە لە قژت دەئالێنی ،
یاخود بن پێیە زەردەکانت
بە هەردوو ناولەپە پیسەکانت دەگری ،

4

گیانی توند ڕوەو ئاسمانەکان هەڵدەکشێ ،
کە لە دیوی خانووە ژەنگاوەکانی شاردا وون دەبێ ،
یاخود پێیە لاملەکان لە کاتژمێر
چوارو پێنج و شەشدا ڕووی تێدەکەن .
پەنجە کوتمەکان قەنەکان پڕ تووتن دەکەنەوە .
ڕۆژنامەکانی ئێوارەو چاوەکان
دڵنیایی چەند دڵنیایەك دەکەن .
هۆش شەقامێکی ڕەشی بە پەلەیە
بۆ بنیاتنانی جیهان
چەند ئەندیشەیەك کە لە دەوری ئەم وێنانەدان
دەم هەژێنی
چەند هەستێکی بێ سنووری خۆش
بەشتێکی ئازاری بێ سنوور دەنووسێنی .
بەزارت دەستت بسرەوەو پێی بکەنە
جیهانەکان وەکو پیرێژنە کۆنەکان دەخولێنەوە کە لە
شوێنە چۆڵەکاندا چیلکەدار خڕ دەکەنەوە

چەند سەرنجێك دەربارەی « پێشینەکان »

ت . س . ئیلیوت ـ ئەم پارچە شیعرەی لە ساڵی « 1909 » دا داناوەو بلاوی کردۆتەوە ـ لە چوار ستانزەدا پێك هاتووە هەر ستانزەیەکیش بابەتی سەرەکی هەیە . دەتوانین بلێین کە هەڵبەستێکی سەربەخۆیە . ئیلیوت لەم شیعرەدا سەرکەوتوانە شێوازی سیمبۆلیزم و ئیمیجیزمی تێکەڵاوکردووە . بۆ دەربڕینی ئەو نیازەی کە لە مێشکیدا پەنگ دەخواتەوە بە چەشنێکی کورتتر و قووڵتر . هەڵبژاردنی ناوو نیشانی « پێشینەکان » بۆی هەڵبژاردنێکی هۆشمەندانەیە . چونکە ئەم شیعرە وەکو

سەرە تایەك یاخود نۆبەرەیەك بۆ شیعرەکانی داهاتووی دووپات دەبێتەوە .

ستانزەی یەکەم ـ باشترین وێنەیە بۆ تێکەلاوکردنی هەردوو شێوازەکە « سیمبولیزم و ئیمپچیزم » شێوە سیمبولیز مەکەش لەو وێنەو دەربڕینانەدا بەدەردەکەون کە پەیوەندیەکی هەستی لە نێوانیاندا هەیەنەوەك . لۆچیکی . بۆ نموونە : ئەو پەیوەندیە لۆچیکیە چییە ـ لە نێوان (کات ژمێر شەش) و « لیزمەی باران » و « رامالینی گەلاو رۆژنامەکان » یاخود ئەو پەیوەندیە چییە لە نێوان « باران دەتکێتە سەر پەردەکان » و « تاقە ئەسپێك » هەروەها پەیوەندی ئەو وێنانە چییە . بە تێکری بە وێنەی « چراکان هەلدەگیرسێن » لەراستیدا هەر وەکو ووتمان پەیوەندیەك لە لایەن خوێندەواران دروست دەکا . بۆ کۆکردنەوەی ئەم هەموو وێنانە بۆ نەخشاندنی تابلۆیەکی روون وئاشکرا . کە ئەویش مەبەستی « رۆتینی ژیانە » ـ لەکاتژمێر شەشی ئێوارەدا . فەرمانبەران لە دوا ی رۆژێکی کارکردن دەگەرێنەوە مالەوە . وە چێشتی شەو ئامادە دەکەن . هەر بۆیەش بۆنی برژاندنی گۆشت لە دالان و ژوورەکاندا دێ ، ئێوارەکانیش لە پاشماوەی جگارەیەکی سووتاو دەچێ ـ چونکە شارە قەلەبالغە پیشەسازیە ئەوروپیەکان لێرەدا شاعیر مەبەستی شاری (لەندەن) ە بە تەم و دووکەل دەورە دەدرێن ، ئێستاش کاتی ئیشکردنی رۆژانە بەسەرچوە ، ئینجا ئەم تەم و دووکەلە پەرت و بلاو دەبنەوە ، بارانیش شتێکی سەیرنیە ، وێنەیەکی ئاسایی یە کە شتی پیس و پاشماوەکان رادەمالی ، ئەو هەستەی کە ئەم ستانزەیە لە لایەن خوێنەر بەجێ دێلی . ئەوەیە کە ئەم وێنە جیاوازانە بوونی کەسێکمان بۆ دەردەبرێ ، بەلام ناتوانین ئامۆژەی بکەین ، هاتنی بۆنی گۆشتی برژاو لە ژوورەکاندا . ئەوە دەگەیەنی کە یەکێك گۆشت سوور دەکاتەوە . بەلام بۆ ئیمە بوونێکی راستەقینەی نی یە . یا وێنەی رامالینی گەلاکان لە ژێر پێیاندا . بەلام پێ ی کێ ؟ دیسان نازانین ... وێنەی تاقە ئەسپێك کە سمکۆل دەکا ، خاوەنەکەیمان دێنێتەوە یاد . کەوا دەشێ لە ژێر یەکێك لە خانووەکاندا راوەستابێ و چاوەڕوانی کەسێك بکات . کە پەیتونەکەی لێبگرێ .. ئەسپەکەش سمکۆل دەکا . بۆ گۆرینی رۆتینی وەستانی بەبێکاردن ، یکرە ئەویش لەم ژیانەدا وەرسەو چاوەڕوانی شتێکی نوێ و داهێنانی تازە دەکات ـ ستانزەی دووەمیش : وێنەی هەلاتنی بەیانی زوومان نیشان دەدا ، ئەو کاتەی کرێکارەکان بە سەرشەقامە پیس و پۆخلەکاندا دەرۆن و بە پێیە قورسەکانیان دەیان پەستنەوەو بۆ یەك دوو سعات لە قاوەخانەکاندا دەمینینەوەو لە چەقی رێگادا نان دەخۆن . ئەو هەموو خەلکە زۆرە وامان لێدەکەن . تایەکێك بیرلەو دەستانە بکاتەوە کە پەردە پیس و گەچلاوەکان لە هەزارەها ژووری . رێکخراودا دەکەنەوە : ـ

ژوورە رێکخراوەکانیش ئەو کەسانە بەکرێیان دەگرن . کە نە مالیان هەیە نە منال . هیچ پەیوەندییەکیان بە ژیانەوە نیە هەروەکو رێبوارێکن لە نێوان ژیان و مردن دان :
ستانزەی سێیەمیش : ـ وێنەی پیرە کچێکمان نیشان دەدا . کە کاتی شوو کردنی بەسەرچووە . دیسانەوە هەست بە بوونی ناکەین . هیچ جۆرە بەزم و خۆشییەك لە ژیانی ئەم مرۆڤەدا نییە . ئەوشتانەی کە دەیزانین تەنیا ئەوەیە کە شاعیر خۆی پێمان دەلێ : ـ

**« لە لێواری پێخەفەکەتدا دادەنیشی**
**لەو شوێنەی پەرە لە قژت دەئالێنی**
**یاخود بنپێیە زەردەکانت**
**بە هەردوو ناو لەپە پیسەکان دەگری »**

ستانزەی چوارەمیش : ـ وێنەی کورێکە کە ئەویش کاتی ژن هێنانی بەسەر چووە . ئاواتی دامرکاندنی ئارەزووە سێکسیەکەیەتی . لەبەر ئەوەشدا بەدوای « بروتێل » دا دەگەرێ گیانی توند رەوەو ئاسمانەکان هەلدەکشێ . کە لە ودیوی خانووە ژەنگاوەکانی شاردا وون دەبێ . لەکۆتایی شیعرەکەدا . دەنگی تایبەتی « ئیلیوت » دێتە گوێمان کە کۆمێنت لە وەهەموو کارەساتانەی رابوردوودەداو دەلێ : ـ

**جیهانەکان وەکو پیرێژنە کۆنەکان دەخولێنەوە**
**کە لە شوێنە چۆلەکاندا چیلکەدار خڕ دەکەنەوە**
**لێرەدا کارە ساتیش ئەوەیە پیرێژنەکان لەو**
**شوێنانەی چیلکەداری هەر هەر دەستناکەوێ ،**
**هەولێ کۆکردنەوەیان دەدەن :**
**ئەمەیە رای « ئیلیوت » بەرامبەر بە ژیان :**
**جا نازانم ئێوە دەلێن چی ؟ : ـ**

● محمد رشید فتاح ●

# شێتەکەی گەڕەکە خۆمانە

له دوامـالّی گەڕەکـەوه ، که دەترِوانیـه دەشتـەکـەی بەردەمت ، ئەمجا که بەرەو ژوورتر جلّەوت بـۆ روانینەکـەت شلدەکرد هێندەت دەزانی خانووەکەی ئەوو ئاشه رووخاوەکه چەشنی دوو پیرەمێردی کەل‌و کۆم قوت دەبـوونەوە ـ تـۆش ئاواتەخوازی ئەوەی رۆژێك لە ڕۆژان لەو خانووە نزیك بیتەوەو ، بێ ترس بچیتە ناوی یەوەو ، له نزیکەوه شێتـه بناسی‌و ، بـه زۆریش بێت بیهێنیتە قسه !. بەلاّم هەی هوو .. تۆ ئەوە سالّێکە ئەو ئاواتەت چاندووە ، کەچی هێشتا چەکەرەی نەکردووە !. باشه بـۆ دەتەوێ شێتـه بناسی ؟! . هـا .. دەتەوێ بیکـەیته پالّەوانی چیرۆکێك ؟!..

ڕۆژی چەند جـارێك لەو ڕێگـەو بانـه لووتت دەبوو بـه لووتیەوە ، بەلاتەوە سەیربوو ، هەرچەندە سەرت دەهێنـاو ، سەرت دەبرد ، وات بۆ دەرنەدەکەوت که ئەو کابرایه شێتەو ، فرِی بەم ژیانەوە نیه !.

**نه ڕەنگ‌و ڕووی ، نه روانینەکانی ، نه دەم‌و دووی ، وایان دەرنەدەخست ، که بەڕاستی تێك چووەو ، بۆ بەرد دەگەڕێت !!.**

گەلێ ئاسایی‌بوو ، جا چی لەوە ئاسایی تر ، له ڕۆژێکی وەك ئیمڕۆدا که مرۆی ئاسایی شێت دەکەن !. ئەو کابرایه له بری دەست وەشاندن‌و ، جنێودان‌و ، ڕاکه ، ڕاکه ، خەندەیەك .. تەنها خەندەیەك بگرێته ئەو خەلّکەی کەوا ئازاری دەدەن !. ئای لەو خەندەیه چ ڕۆشنایيەکی لێ دەکەوتەوە ؟! . له ناوکی ئەو خەندەیەدا هەزار واتەی پرِشنگدارت بەر چاو دەکەوت !.

ئەی بۆ ئەو کابرایه ئەم خەلّکه بەشێت نەزانێت ؟. بۆ نا ؟. ئەو خەلّکه .. سەرباری هەموو گێرمەو کێشەو .. نـارەحەتی یەکی ژیانیان ، ئەوەیان بۆ مابێتەوە ، بەم ڕۆژگارە بەو کابرایه ڕابوێرن !.

دوای نیـوەڕوان که منـدالاّنی گەڕەك له دەشتـەکەدا دەکەوتنه یاری کردن ، شێته دەهاتـه سەر بـانەکـەو ، چوار مەشقی لێی دادەنیشت‌و ، چەشنی منداڵێك دەتریقایـەوە !. لەوە دەچوو هەلّس‌و کەوتی مندالّەکان له ناخەوە بیهەژێنێ ، که تاقمێکیان گۆلّێکیان دەکرد ، دەکەوته چەپلّەلێدان‌و ، هەر ئەوە نەبوو له خۆشیاندا بالّ نەگرێت !.

تۆش له نزیکەوه لێت دەڕوانی ، بە وردی سەرنجت دەدا ، دەت‌ویست بچیته ناخی‌یەوە ، بچیته مۆخی‌یەوەو ، بزانی بیر لەچی دەکاتەوە ؟. بەلاّم نزیك بوونەوەو ، لێ ڕوانینی هیچ شتێك نادەن بە دەستەوە ، دەمی قفلّێکی داخراوەو ، بە هیچ کلیلێك ناکرێتەوە !. بەڕاستی ئەو کابرایه دەریایەکی بێ‌بنە !.

گەلێ جار وەڕسی پشتی پێ هەلّ دەکردی ، بەلاّم هەر زوو سواری ئەسپی ئـاواتەکـەت دەبوویتـەوەو ، دەبوویتـەوەو ، دەکەوتیتەوە دوای شێتـه !. ئەوە لە کـەیەوە گیـرۆدەی ئەم خولیایە بوویت ؟. دوای چی ؟ دوای ئەوەی که ژیـانێکی ترت بەرووی خەلّکی ئەم شارەوە بینی ؟. ژیانێکی ناهەمواری وا که مێژووی ئەم گەڕەکە بە خۆیەوە نەدیوە !. ئا .. لەو دەمـەوە خووت داوەته ناسینی ئەم شێته !.. بە تایبەتی دوای ئەوەش که پیرەکانی گەڕەك ، باوو باپیری شێتەیان پێ ناساندی !. ئەوا شێیە بەلاتەوە بووە سەرەتای مێژوو یەکی نوێ !.

**پیـرەکان دەیـان ووت :.. ئا بـه پێی تێگـەیشتنی خۆیان دەیـان‌ووت : « بە تـایەفـه هەر شێت‌بـوون !. » باپیری بەدەستی عوسمانلی یەکان لەناوچووە ، باوکیشی بـەدەستی ئنگلیزەکـان . ئەی بـاپیرە گـەورەی ؟!. خوا ئەزانێ بەدەستی کێ ؟!.**

ئـەمە شتێکی بـه هـاداری دەست خستی ، شتێکی‌وا شەوانە دابنیشی‌و ، ماوەیەك قالّی بیرکردنه وردبیت !.

کاتێك یاری‌ی مندالّەکانی شەکەت دەکرد ، بە کۆمـەلّ بـەردەرکه شینـەکەی مـالّی شێتەیـان دەگرت‌و ، دەکـەوتنـه هاوارکردن .

« ـ شێتە .. شێتە .. وەرە خوارێو ، گورانییەکە بڵێ ! » .
گۆرانییەکە ؟. ئا .. وەك دەڵێن گۆرانی یەکەی شێتە دارو بەرد دێنێتە جۆشو خرۆش .. وەکو بەر گوێشیان کەوتووە ، دەنگی شێتە لەو ئاوازە دەچێت ، کە ئێوارەو ، سبەینان سروشتی ئەم وڵاتە بە گوێی خەڵکیدا دەدات !.

ئاوازی سروشت ، ئاوازێکی پیرۆزە !.. ئاوازی عیشقێکی بەرزە . ئەی ئەم چریکەیەی شێتە ؟!. تۆ بڵێی بنەمای عیشقێکی گەورە نەبێت ؟!. بۆ نا ؟ . هەیە شێتی پارەیە ، هەیە شێتی دینە ، هەیە شێتی دولبەرە ، هەیە شێتی ...!. ئەی عیشقەکەی شێتە ؟!.

منداڵەکان لە هاوار هاواری خۆیان نە دەکەوتن . وا دیاربوو ، لەوەو بەر شێتە ئاوازەکەی خۆی رژاندوتە ناخیانەوە !. ئەگینا بەو جۆرە وەك هەنگ بەسەر گوڵەوە نە دەنیشتەوە !.
شێتە خێرا لە سەر بانەکە دەچووە ، خوارەوەو لە حەوشەوە وەڵامی دەداتەوە .

**« ـ با رۆژی بێت ، بۆتان دەڵێم .. بەڵێن بێ بۆتان دەڵێم !.**

منداڵەکان بەو ئاواتەوە لێی دوور دەکەوتنەوەو بەرەو ماڵ دەبوونەوە . تۆش کە گوێت لەو بەڵێنە دەبوو دەگەشایتەوەو ، دوا بەدوای ئەوان دەگەڕایتەوە . ئاخۆکەی ئەو گۆرانیەت بەر گوێ دەکەوێت ؟. هەر لە خۆتەوە وات هەست دەکرد ، کاتێك ئەو گۆرانیەت بەر گوێ دەکەوێ ، هەموو شتێکت بۆ دەردەکەوێت ، لە هەموو رووبەکیشەوە شێتە دەناسی !.

هەموو رۆژێك بەو ئاواتەوە لە تەك منداڵەکاندا بەر دەرگەکەی شێتە تان دەگرت . بەڵێن درێژەی کێشاو ، ئاوات سەوز نەبوو !.

**ئێوارەیەکیان وات بە خەیاڵدا هات دوا بەوای منداڵەکان نەگەڕێیتەوەو ، لە پەنا ئاشەکەدا خۆت بگریت .. بەو نیازەی خۆت بکەیەنییە شێتەو ، هەر چۆنێك بێ لە تەکیا دانیشیو ، بیهێنیتە قسە . مایتەوە ، وەك خۆت نابێتەوە لە پەنا ئاشەکەدا مابیتەوە . وردە وردە ، تاریکی دەنیشتە سەرزەوییو ، دنیاش تا دەهات بەرگی خامۆش بوونی دەپۆشی .**

**چاوت لێ بوو ، تارماییەك لە دەرگە شینەکە نزیك کەوتەوەو ، بەر لەوەی لێی بدات ، خێرا دەرگەکەی کردەوەو ، دوای ئەوەی سەیرێکی ئەملاو ئەو لای خۆی کرد ، خۆی کرد بە ژووردا . دوای کەمێکیتر تارماییەکی تریش بە هەمان شێوە کردی بە ژووردا . خۆت پێ نەگیرا بەرەو دەرگەکە بوویتەوە ، ویستت لێی بدەی ، بەڵام زوو دەستت کێشایەوە . دەنگی شێتە کەوتە بەرگوێت .. لەوانی دەپرسی :**

**« ـ خۆ .. بە کوڵانەکەی ماڵی گورگەدا نەهاتن ؟ » .**

**« نەء .. بەکوڵانەکەی ئەودیوا هاتین . » ئەها .. دۆزیمەوە .. گورگە ! بە گورجی بەرەو دوا بوویتەوە . ئەو کاتە تاریکی دەشتەکە لێت بووە ، چەندەها گورگی دڕندەی خوێن مژو ، لە هەموو لایەکەوە شاڵاویان دەهێنایتو ، پێت پێ ئەکەنینو دەیان وت : ـ « ـ وەرە .. با راوە ژیژکەکە بکەینەوە !. »**

**راوە ژیژك .. تا کەی ؟ . بەسە گورگینە !. هەموو دەمێك دەتانەوێ راوە ژیژك بەم فەقیرو هەژارە بکەن !.. تا کەی ؟. لە پێناوی بەرژەوەندی خۆتاندا دەست لە گەڵ شەیتاندا تێکەڵاو دەکەن !. بەسە ... چەندەها ڕەشو ڕووتی وەك شێتە بۆتە قوربانی راوە ژیژکەکەی ئێوە !!..**

لەپڕ پێکەنیت .. بەوە پێکەنینت هات .. « ـ رۆژێك دێت .. کە سانی وەکو شێتە راوە ژیژکیش بە ئێوە بکەن ! . »
ئێوارەی رۆژێکی نوێ بوو ، بۆنی زەوی مرۆی کاس دەکرد ، منداڵەکان لە بری یاریکردن ، بەم دەستو بەو دەست ، دارو لاستیکیان دەهێناو ، لەسەر یەکیان کە لەکە دەکرد . شێتەش خێرا ، خێرا ، شرو شیتاڵی لە خانووەکەی دەهێنایە دەرێو ، دەی هاویشتە سەر دارو لاستیکەکە .
منداڵەکان ئاگریان کردەوە . لە گەڵ بەرز بوونەوەی کڵپەی ئاگردا شێتە دەنگی هەڵبڕی . ئاوازێکی چریکاند . منداڵەکان وەك سروشت بێدەنگ بوون ئاگر دەسووتاو ، شێتەش دەی چریکاند ، تاریکیی دەهاتو تیشکی ئاگرەکەشی دەچوو بەگژیاو ، باوەشی پیا دەکردو ، دەی ویست بیدا بە زەویدا . شێتەش هەر دەی چریکاند .
لەپڕ وەستا .. وەستاو بێدەنگ بوو رووی کردە منداڵەکان : ـ « دەزانن .. ئێستە گورگە تۆقیوە ! »
**منداڵەکان پێکەوە دایانە قاقای پێکەنین !.**

# خەوم..

● حەسەن جاف ●

شەو میوانێکی ناوەختەو سەر بەشارەکەتـدا دەکات ، وردە وردە جێ بـە ڕووناکی لەق‌دەکـات‌و هەمـوو کـووچـەو قوژبنەکـانی دەگرێتـەوەو لەسەر جـادە شۆستـەکانیـا شان دادەدات ، خەڵکەکەش خواحافیزی لەیەك دەکەن‌و بـە پەلە پڕووزێ خەم‌و پەژارەی ڕۆژگار لە دڵ باردەکەن‌و هـەنگاوی گورج گورج بەرەو ماڵ دەنێن ، تۆش سوارێکی شارەزای بست بە بستی ئەم شارەیت ، شوێنی تێدا نیە یادا شتێکت تیایـدا نەبێ ،لە گشت کۆڵان‌و جادەو گوزدرەکانیا وتەیەك پێکەنینێك ، یا چپە یەکی خۆشەویستیت هەر هەیە ، ئەم ڕێگە تەنگەبەرەش .. لێی وردـدەبیتەوە .. دڵنیانیت ، هەر چەنـد دەکەیت هـەر ڕەگی گومان لە دەروونتا دەمێنێت . ناتوانیت ڕیشە کێشی بکەیت .. کە ئاوڕدەیتەوە یەکێکت لەگەڵدایە ، ئەمیش ناناسیتەوە ،زۆر سەیرت بەخۆت دێت ،هەوڵێکی بێهودە دەدەیت بیـری‌خۆت دەگوشی ، نازانی کێیە ، لێی دەپرسی وەڵامت ناداتەوە ، گومان لە دڵتدا چەکـەرە دەکات . تـۆ بڵێیت شارەکـەی خۆت‌بێت ؟ پێکەنینت بەخۆت دێت ، چۆن مرۆڤ مەڵبەندی لە دایك‌بوون‌و ژیانی خۆی نـاناسێتـەوە . « خۆیـەتی‌و خۆی گـۆڕیوە » بـۆ وانـەبێت ، هیـچ شتێـك لەجێی خـۆیـدا نـەمـاوە ، دەڵێیت گولەزیەکی شارەزای سەر شانۆی هەراجخانەیە « ئەی نالین ژیان هەراجخانەیە ؟ هەر جارەی بەشێوەیەك خۆی دەگۆڕێ‌و هەموو شتێکیشی تیدا دەفرۆشرێ .. هەرزان فرۆش دەکرێ ! »

سەرنج دەدەیتە ئەم بەرو ئەو بەری ڕێگەکە ، هیچ بەدی ناکەیت ، دوو دیواری بەرز ڕێی لە نیگاکانت گرتوە ، سەر بەرز دەکەیتەوە کۆتایی دیوارەکانت نایەتە بەرچـاو ، شەوەزەنـگ پەردەیەکی ڕەشی ئـەستووری بـەسەر هێـزی بینینتا داداوە « دەڵێن لە پشت پەردەی شەوەزەنگەوە هەزاران دڵدار بەیەك دەگەن‌و کەف‌و کوڵی خۆشەویستی دادەمرکێننەوە ، هەزاران تاوانیش دەکرێ ، سەگەکانی سەر بڕۆست ددانیان لەو دڵە پڕ سـۆزو خۆشـەویستی‌یانـە گیر دەکـەن‌و گڕی ڕك‌و کینـەیان دادەمرکێتەوە ، چۆن ئەم ڕێیـە ناناسیتەوە ؟ . بـە ڕاودی دەکەیت لەگەڵ ئەو شوێنانەی پێشتر دیوتن ، یەکسەر نـاوی «تلمسان» * لە مێشکتدا بروسکە دەدات « جـادەیەکی ئـاوا بـاریك ، لایـەکی دیوارە بـەرزەکەی بـاخچەی گشتی بـوو ، لایەکەی دیکەی شوراکەی قوتابخانەی مندالانی شۆڕش بوو » . زۆرت سەیر بەو دیوارە بەرزانە دەهات کە لە سێ لاوە وەك یا ساوڵە ئەفسانەنیەکان دەوری باخەکـەیان دابـوو ، هەنـدێ ڕووەك‌و گژو گیاش لە ڕەقەنی بەردەکانیاندا سەوز ببـوون ، پێکەنینت بەخۆت‌دێ :

**« من لەکـوێ‌و تلمسان لەکـوێ ؟ » . هـەر ئـەبێ شارەکەی خۆت‌بێت « ئەی بۆ نایناسمەوە ؟ بۆ کەسێکی ناسیاو بەدی ناکەم ؟ » .**

وەك نابەڵەدێك کورتە هەنگاوی نامۆ دەنێیت‌و قسەکانی مامۆستا ـ م ـ ت دێتەوە یاد : « ژیان گەشتێکە لە زایینەوە بۆ مەرگ ، لە تاریکستانی مندالدانی دایکەوە بەرەو تاریکستانی گۆڕ ، دوای مەرگیش نە ناو دەمێنێ‌و نە نیشان » . خۆتۆ هێشتا زیندوویت ، ئەی چۆن وابێ ناونیشان بوویت‌و کەسێك نایەت بەدەنگتەوە ؟ .

ترس وەك مۆتـەکە چـۆك بەسـەر دەروونتا دادەدات ، سـەرنجێکی دیکەی ڕێ یـان دەدەیتـەوە ، ئـاوڕ لەوەکـەی تەنیشتت دەدەیتەوە « ئەبێ کێ‌بێت ؟ » . ڕێك وەك سەربازێك لە کاتی مەشقدا لای چەپی لێ‌گرتویت ، لەگەڵ هەنگاوەکانتـا هەنگاو هەڵدەهێنێتەوە ، دەمی وەك سنووقێکی پڕ نهێنی کلیل داوەو وەڵامی قسەو پرسیارەکانت ناداتەوە .

« گوتوویانە زمان بهێڵێ سەر ڕەحەتە ، ئەمیش چـاکی

گرتوەتە گوێ بۆیە وا بێدەنگە ، ئەی ناڵێن بێ دەنگی زێرە ! » .
ئەوەندەیان ئەم ووتەیە بە بەر گوێتدا داوە لەوە دەترسایت زمانت نەمێنێ و ببووکێتەوە ، زوو شتێکت خوێندبـووەوە گوایـا زاناکان دەڵێن : ئەندامانەی لەش کە بەکار نایـەن وردە وردە بچووك دەبنەوە تا لە دواییدا نامێنن !! . دەی خەمی بۆ مەخۆ دەرگایەك ڕەشەبای لێ بێتە ژوورەوە نەبوونی باشترە ! .

**هەوڵێکی دیکە دەدەیت ، حەز دەکەیت کـوتی ئەو وتەیە بپچڕێنیت .**
**ـ ئەرێ بۆ وەڵامم نادەیتەوە ؟ .**
**ـ .....**

قیژاندت بەسەریا ، وەك لە ناو ئەشکەوتێکدا هاواربکەیت گوێت لە دەنگدانەوەی قسەکانت بوو ، ترسەکە بە هەموو لەشتا بڵاوبووەوە ، جارێکی دیکە سەرنجی ڕێگەکەت دایەوە تا هێزت تیابوو چاوت کردەوە ، لە دوورەوە ڕووناکیەکی کز وەك چرای دز دەبریسکێتەوە .

تیشکێکی بێ ڕەنگ بە بازنەیەکی تەسکی دەوری خۆی دەبەخشێت .. گوێت لە مرەی سەگێك بوو ، دڵت داخورپا ، زۆر لە سەگ دەترسیت ، ئەو ڕۆژەت هاتەوە یاد کە باوەژنـەکەت بەزۆر ڕەوانەی ماڵی دراوسێکەتانی کردیت .

**ـ دەبـڕۆ دەی ئەوەنـدەی پیاوێکت لێ هـاتـوە داوەشێی یاخوا بۆ ئەترسیت ! .**

بـەسەرە تـاتکێ و لادیوار گـرتن و ئەم لاو ئـەو لاکردن دەڕۆیشتیت ، تەپە تەپی دڵت لەگەڵ هەنگاوە بچکۆلەکانتا تیژتر دەبوو ، نەتزانی لە کوێوە ئەو گـەماڵە . ددانـەکانی لەسمتت گیرکرد ، نهێن گربوو ، مندالانی گەڕەك زراویان لێی تۆقیبوو .

سڵەمیتـەوە ، ئێستێکت کـرد ، ئـەوەکـەی تـەنیشتت نەوەستا ، هێدی هێدی هەنگاوی هەڵهێنایەوەو ملی ڕێی گرت تا لە سەگەکە تێپەڕی ، چاوت بۆ بەردێك گێڕا « ئەم شەو زەنگە چاوی کردوەتە دوو چالایی بێ کەلك » . دەچەمیتـەوەو بە دەوری خۆتا دەست دەگێڕی ، هیچت وەبەر چنگ ناکـەوێ ، ئەویش بەمـرە مر بـەرەو ڕووت دێت ، تەنهـا تارمـاییەکـەی دەبینیت ، نازانیت چۆن کابرای شاری «ك» ت هاتـەوە یاد ، سەگە هارەکە پارچە پـارچەی کـرد ، خەڵکیشی دووراو دوور تەماشایان دەکرد ، کەس نەیدەوێرا توخنی بکەوێ . « دەڵێن ئەو کەسەی سەگی هار بیگەزێ ، چل شەو دەژێ و بە دەردی سەرەیەکی خراپ دەمرێت ، ئەویش هەر کەسێك بگەزێ هار دەبێت ، بەزنجیر دەیبەستنەوە بێ سەرو شوێن سەرنگومی دەکەن » . مرەی ئەم سەگە دووبارە سەگەکانی سەر بڕۆستت وەبیر دەهێنێتەوە ، گوایا دەڵێن پاسەوانی دۆزەخن .. بۆوا نەبێ سەگ هەر ئێشی پاسەوانی نیە ؟ .. ئیتر پاسەوانی هەر چیەك بێت ؟!

تا دێت لێت نزیك دەبێتەوە ، ترس و مەرگی چەرمەسەرێ وزەیـەکی ئەفسـوونـاویت پێ دەبـەخشێ ، دەچـەمیتـەوە ، ئەمجارەیـان بەردێکی زلت بـەردەست دەکەوێت ،چـاوەکانت وەکو تیشك پەردەی ئەستووری تاریکی دادەدڕن ، بەردەکەی تێدەگری ، نـووزەیەکی لاوازی لەگـەروو دێتە دەرو گـرمۆڵە دەبێت ، هـەرچی ترسێـك لە دەروونتا هـەبوو کـۆچ و بـاری کۆکردەوەو ماڵ ئاوایی ی لێکردێت و میوانێکی نوێ لە هەواری نـاواختنتا خێـوەتی هـەڵدا .. ڕك و کینـەی سـالانی تـرس لە قاچەکـانتا کـۆبوونـەوە ، چوویتـە سەری بـە پێ لەقە تێی بەربوویت ، خوێن و مێشکی تێکەڵبوون ، ئارەق بەناو چەوان و شان و ملتا ڕێچکەی بەست ... لەتاوانا هەناسەت سواربوو .. ئاگات لە خۆت و دەوروبەرت بڕابوو ، کەسەرت هەڵبڕی ئەمبەرو ئەو بەر ڕووناکیە ، تا چاو بڕ دەکات چراخانە .. ویستت لە خۆت بپرسیت .. ئەمە چۆن .. ؟ بە ئاگا هاتیتەوە ، هەمـوو لەشت نوقمی ئارەق بووبوو ، دەڵێی بارانێکی بەلێزمە بەسەرتا دایکردوە ، گوێت لەتەپە تەپی دڵت بوو وەك ڕێگەیەکی یەکجار هەورازو دوورت بڕیبێ ، خۆریش لە زورگەکانی دەورەی شارەوە سەری دەرهێنابوو ، لەگـەڵ گرەکـانی دەوروبەریـدا سەرەتـاتکێی دەکردو هەرەسی بە لەشکری شەو هێنابوو .

ئەمەت بۆ خێزانەکەت گێڕایەوە .. وتی

**ـ ئەوە باسیان کردویت ، بەڵام مادام سەگەکـەت کوشت بەسەریانا زاڵ دەبیت .**

سەرێکت بادا .. ئێستاش لەو باوەڕە دایت خەون نیە .

---

* **تلمسان : شارێکە لە جەزایر .**

# بەرەو قووڵایی

سەلاح عومەر

هەولێر ٢٨ /١/ ١٩٨٢

○

لە چاوەكانی وورد دەبمەوە ، بینایيم لەگەڵ نهێنییەكی پڕ مانا تێكەڵ دەبێ . موچڕكێ هەموو لەشم دەخاتە سەما ، لەناو زەریـای بێ ئـارامی نقـوم دەبم ... دەڕوانمـە ئـەوانـەی دەوروبـەرم ، بەڵام هێنـدەی دەكەم نـاتوانم شێـوەی چاوە خەماوییەكانی لەبیر بەرمەوە ، بۆیە پتر زەردەواڵەی هەستم دەوروژێن ، كۆمەڵێ زەردەواڵە بە دیواری ناخمەوە دەنوسێن ، دیوی ناوەوەم دەئاوسێ . خەنجەری زامەكـانی هەریـەكێ لە كالانی خۆیان دەر دەپەڕین ... تیژ دەبنەوە .. یەك دەگرن ، تا ئەو ساتەی هەموو دەبن بە یەكو وەك پارچە پۆلایەك دەكەونە

گیانم ... بە قوڵایی گۆشتو ئێسقانی مەلۆتكەی دلمدا دەچنە خوارێ ، خوێن دەڕژێتە ناو ڕووباری ئاسودەییم !! ... ئێش جارێكیتر سەرم پێ هەڵدەبڕێتەوە .. دلۆپە فرمێسكەكانی سەر گۆنای مگناتیس ئاسا بەرەو لای خۆیان رام دەكێشن ، خولیای ماچكردنو لە ئامێز گرتنی وەكو گەڵای دار دەمهەژێنێتـەوە : هەستە بیگرە باوەش ، با ئەوانەی تریش بـەدواتەوە بیگـرنە باوەش . هەڵدەستمەوە ، لەگەڵ هـەستانـەوەمدا ، هـە ست بەگرانایەكی قـورس دەكەم لەژێـرەوە ناهێـڵێ راستبمەوە ، سەرم خوار دەكەمەوە ، دەبینم كورسییەكەی لەسەری دانیشتووم لە نێوان تێك ئالانی پەنجەكانمـەوە شۆڕ بـوّتەوە . سـەرسام

دەبم ، چونكە نازانم چۆنو كەی دەستم بردوّتە ژێر دەسكی كـورسییەكـەو پەنجـەكانم تێـك ئاڵانـدوە . پەنجـەكانم لێـك

دەكەمەوە . شەرقەیەك لە یانەكە بەرز دەبێتەوە ئەوانەی دەورو بەرم لە شوێنی خۆیان ڕادەپەڕن ، بە تورەیی سەیرێكی پڕقینم دەكەن ، بەلام من گوێیان نادەمێو هەنگاو دەنێم .. دەگەمە لای ، چەند خولەكێ بەسەر سەریەوە دەوەستم ، هێندەی پێ

ناچێ ئەویش هەڵدەستێتەوە.. دەڕوانینـە یەكتـر ، ناتـوانین یەكتر بدوێنین ، تەنیا بە دەنگی هەنـاسەدان ، هێمـای چاوو خورپەی دڵ یەكتر دەدوێنین ، دەچینە ناو یەكتر.... خەمی دڵو چاوی مێشكو دەمی ئازارەكانی بانگم دەكەن :

**بیگرە باوەش با ئەوانی تریش بەدواتـەوە یەكتـر بگرنە باوەش .. خۆ لەش بۆش نییە ئاگرت تێ بـەردا ، ناتسوتێنێ ، ناتسوتێنێ !..**

خۆم دەجووڵێنمەوە ، دەمەوێ دەست بنێمە سەر ڕوومەتی ، تێر چاوەكـانی ماچ كـەم . دەست بەرز دەكـەمەوە ، كـەچی كومانێكی كتو پڕ ناهێڵێ . دەستم بەرزتر دەكەمەوە . پتر لێی دەچمـە پێش ، هێندەی نـامێنێ سنگم بە سنگییـەوە بنوسێ نـاوێرم بـەخۆمـەوە بینووسێنم . بـەلام هـەرچـۆنێ بێت بـە پەنجەكـانم چاوەكـانی دەگرمـە خۆ ، دلۆپـە فرمێسكـەكانی نـاوگلێنەی دەسـڕمەوە ، بـەلام هەی هـوو لەوەی دەتـوانێ بارانێكی پڕ حەزو ئارەزوو لەداكەوتن بخا !... هەی هوولەوەی دەتوانێ دیوارێ لە نێوان بەرەو پێش چوونی ڕووبارێك دروست

کا !! ... دڵۆپێک دەسڕمەوە دوانیتر ، دەیتر ، سەدیتر لەوان پەلەتر دادەچۆڕایە خوارێ . دەستم یەک پارچە دەبێ بە ئاو ، دەشۆڕێتەوە . پەنجەیەک دەنێمە نێو لێوەکانم ، تامی ژان و خەم و پاکی و ڕاستی بەرەو ناخم هەڵدەکشێ . نامەوێ لێوەمکانم لێک کەمەوە ، دەترسم لەوەی نەوەک لەگەڵ جوڵانەوەیاندا ببنە هەڵم و مانای خۆیانم لێ بشارنەوە . دڵۆپەکان قووت دەدەم .

فێنکي بە گەروومدا شۆڕ دەبێتەوە ، دادەبەزێ تا بەهەموو دەمارەکانم بڵاو دەبێتەوە . ئا ئەو ساتە هەست بە خۆسیەکی بێهاوتا دەکەم . دەم و چاوم گەش دەبێتەوە ، پانایی گلێنەکانم بەرینتر دەبن ، چاوەکانم وەکو تەلسکۆبی لێدێ . بەناو بەژن و باڵایدا دەچێتە خوارێ . دەگەمە ناو ژووری ناخی لەوێ هەموو شتێ ئاسایی ئەهاتە بەر چاو ، بەڵکو شتە بچوکەکان گەورەتر دەبینم ، شتە نادیارەکان پەردەی نەهێنی و شاراوەییان لەسەر لادەبردرێ و بەهێمني لەگەڵ چاوەکانم دەکەونە چاوشارکێ ، ناو دڵی وەکو شارێکی بچوک دێنە بەر چاوم .. وەرز زستانێکی تووشە ، شەقامەکان کز دەبینرێن ،

کۆڵان و خانووەکان لەناو تاریکیدا نقوم بووین ، ئەوەی ناوی ئادەمیزادیشە یەک هەنگاوی تیا بنێ بەناو قوڕو چلپاودا ڕۆ دەچێنە خوارێ .. شەل ، کوێر ، منداڵ ، ڕێبوار ، ویلەکان ئەمانەش هەموویان لەژێر چەتری بێ ئارامي خۆیان گرموڵە کردبوو . کە چاویان بە من دەکەوێ رادەچڵەکێن .. دێنەوە سەرخۆ ، ئەوسا بە دەنگێکی پڕ لۆمە هاوار دەکەن .. ئەی بۆ تۆش وەکو ئەو نامانخەیتە ناو دڵت ؟؟ ئەی ئەوە نییە ئەوشۆخە هەموو ڕۆژێ چەند جارێ پووش و پەلاش ناخی خۆیمان بۆ کۆ دەکاتەوە بەگڕی ژانەکانی ئاگریان تێ بەردەدا ، بۆ ئەوەی لاشەی سڕبوومان گەرم بێتەوە . ئەی ئەوە نییە ئەو عاشقە ، هەموو ژمێ پارچەیەک لە گۆشتی ئەندامێکی خۆیان بۆ لێ دەکاتەوە بۆ ئەوەی زگی بر سیمانی لێ پڕ کەینەوە ؟؟ باوەشی پیاکە .. باوەشی پیاکە ، تا نیوە لە ئێمە بپەرێتەوە ناو دڵێ تۆش . ئیتر خۆم بێ ئاگیرێ و بێ سێ و دوو ئەمجارە باوەشی پیا دەکەم ، بە خۆمەوەی دەنووسێنم .

# یادگارە خەماوییەکان

**جەمال نوری**

**١٩٨٠**

مێگەلەکەی لە .. لە وەڕگای دامێنی کێوەکەدا مۆڵ ئەداو تاقەتی ئەکردن ، گەماڵە بۆری ئەکوردە پاسەوانیان . جا خورجەکەی لە شانی ئەکردەوە . لە تەنیشت خۆیەوە دای ئەنا . خۆیشی لە خوار .. ڕانە مێگەلەوە لێی درێژ ئەبوو .. شانی لێ دا ئەداو دەستی چەپی ئەنایە ژێر چەنەی خەفەت : جار جارە خەوە نووسکە کۆتایی بەتارمایی خەمە سەوزەکانی ئەهێنا ، ئەو خەمە بۆچڕوکاویانەی زامی قوڵ قوڵیان لە مێشک و دڵیا جێ ئەهێشت و نەفرەتیان لە قەزاو قەدەری ئەو ڕۆژگارە نالەپارە ئەکرد کە ئەم گردە خەمانەیان لە دڵ و کەللەیا قوت کردبۆوە :

جار جارەش بیری وێڵی ئەکەوتە کێوماڵ کردن و پشکنین بۆ نهێنییەکانی پاڵ گاشە بەردەکان و ژێر دار بەڕووە قەد ئەستووڕو بە ساڵاچووەکان : . تاوێکیش بیری لە کۆچ و کۆچباری ڕوونبووی ژیانی سەرکەش و سمکۆڵ کردنی ئەسپە دوڵدوڵی تەوێڵ و کاکۆڵ سپی باوکی ڕەحمەتی ئەکردەوە کە چۆن ئەمیش کاتی

گەنجێتی لەگەڵ هاو تەمەنەکانیا بەڕاوو شکارەوە بەسەر ئەبرد !

**- ئای بۆ توولە چوارپەل کورتە بەڵەکەکەی ! بۆ تلنجی‌یە لاوازە گوێ شۆڕە پشت چەماوە سەرما بردەڵەکەی دوای ئەسپە شێ‌ی !**

دەروازەی ئەوینی ئاگراویشی لە هێلانەی خەڵوەتگای گەنجێتی‌و هەرەتی دڵداری‌و ژن‌و ماڵداریشی ئەکردەوە ! کەچی ئێستاکە ... بەهارە زەردەکانی دوا تەمەنی‌و ژانی ئەو عیشقە خاوێنانەی لە سینەی بەرینیا خەوانووەو تێکەڵ بە ژانە گریانی نهێنی‌یەکانی خەم لێنیشتووی دڵی کردوون ! .

خەمەکانی فریشتەیەکی پەڕوباڵ هەڵپڕوزاو بوون کە لەو دامێنی بنارەدا بەرەڵلای ئەکردن . هەندێ جار بەسەر کێڵە شکاوەکانی گۆڕی باوکی ڕەحمەتییا ئەنیشتنەوە کە لە نێزیك قسن‌و گومەزەکەی مام شێخەوە بوو . بووە پێخوستی ئاژەڵ‌و ڕەشە وولاخ‌و خەڵکی !

خوالێخۆشبووی باوکی کاتی خۆی لەناو گومەزو قسنی ئەم مام شێخەوە ، ڕەشمارێ بۆی هاتە دەرێ لە کاتی زیارەت کردنیاو پێوەی‌داو وەك ئەڵێن تووکی سەری بابردی !؟ .

بۆ ئەوەی کەمێ خەمەکانی بەبا بدات ، چاوێکی ئەخشان بە خوارو ژووری مێگەلە تاقەت کراوەکەداو لە گەماڵە بۆری ئەڕوانی‌و جا کە بەزیت‌و ووریایی‌یەوە ئەیدی دڵخۆش ئەبوو . کلکە لەقێ‌ی ئێوارانی سەر تەنووری وەبیر ئەهاتەوە کە چۆن بەدەورو خولی خەجەی ژنیا دێ‌و ئەچێ بە نیازی ئەوەی کوڵووە نانێکی گەرمی ناو تەنووری بۆ هەڵدات‌و ئەمیش لە ژێر کەڵبەکانیدا بیهاڕێ‌و بیکرمێنێ !. جا لە گەماڵە بۆر نێزیك ئەبووەو پێ‌ی ئەگوت..

بێگومان تۆش خورجی دڵت کەمێ خەم‌و جەخاری ڕۆژانێکی رابووردووی هەر تێ ئاخنراوە ! . ئایا بەسەرهاتێ سەرنجی ڕانەکێشاوی‌و جار جارە وەبیرت بێتەوە .. وەکو ئەوەی

چەند منالی لاساری گوند بەخرتە بەرد لاقێکیان شەل کردبی‌و تۆش بە قوروسکە قوروسکەو شەلە شەل لە دەستیان هەڵهاتبی‌و جا لە پەنا پاسارێدا یا کەلاوە رووخاوێکا لێ‌ی کەوتبی‌و چاوەڕوانی ساڕێژ بوونی زام‌و جێ ئازارەکانت کردبێ ! .

یان لە بناری ئەم کێوانە راوەدووی گورگێ .. چەقەڵێ .. ڕێوییەکی فێڵبازت نابی‌و ڕازت کردبن‌و چەمێڵەکانت نابنە سەر تەوقە سەریان ، یا گازەرەی پشتیان‌و بەمرەمر ڕۆحت بردبن تا خاوەنەکەت هاتووەو لە ژێر چنگتی دەرهێناون ! . یان هەر بۆت نەگیراون‌و خاوەنەکەت لە داخا بە رووتا هاتووەو بە تەماڵ‌و بوودەڵەی یان هیچ لەبارا نەبووی داناویت ! .

گەرچی ئەمرۆکە بۆمن خێرت داوەتەوەو پاسەوانی‌ی باش ئەکەیت ! .

گەماڵە بۆر ئەم هەقایەتانەی لەبەرگوێ خۆش بوون . بۆیە ڕەزامەندی‌و ڕاستی‌ی بۆ بۆچوونەکانی مام وەیسی بەکلکە لەقێ‌یەك ئەسەلمان !؟ .

جا .. مام وەیس هەڵئەستاو لە کانیاوی بەردەم کێوەکەدا دەسنوێژێکی بۆ ئەشت‌و ڕووی ئەکردە قیبلەو چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی بۆخوا ئەکردو وایی خورجەکەی ڕائەکێشایە بەر دەمی‌و چی تیابوایە مەلی ئەرشت‌و نان‌و پێخۆری لە نێوان خۆی‌و گەماڵە بۆر بەش ئەکردو دوا جار دەستێکی شوکرانەی بەردینە ماش‌و برنجی‌کەیا ئەهێناو دەمەو سەسرێکی درەنگانیش ، مێگەلی خڕ ئەکردەوەو لەگەڵ خۆر ئاوابوونا ئەیکردنەوە بەناو دێ‌دا ! .



○

نووسینی : فاسیل شوکشین

○

گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە

ئارام قەرەداغی

○

بەو جۆرە هەموو شەوێ هەمان شت دووبارە دەبۆوە . هەر کە خامۆشی باڵی بەسەر گوندەکەدا دەکێشاو خەڵك دەچوونە ناوجێ ، ئەو دەستی پێ دەکرد . دەچووە دەرەوەو لە کەناری گوندەکەدا دەستی دەکرد بە ئوکۆردیۆن لێدان . ئوکۆردیۆنەکەشی سەیر بوو ، لە جیاتی ئەوەی گۆرانی بڵێ هاڕەی دەهات .

خەڵکەکە لە نینکا . کریچیتۆفا دەپاڕانەوە : «لە ڕێی خوا شووی پێ بکە با ژیانمان لێ هەراسان نەکات !»

نینکا بە بزەیەکی سەیرەوە وەڵامی دەدایەوە : «پێویست ناکات گوێی لێ بگرن . بخەون !»

«چۆن دەتوانین بخەوین لە کاتێکدا ئەو دەعبایە لە بن پەنجەرەکانماندا ناڵە ناڵیەتی . خۆ ئەو کەرە بەستەزمانە ناشچێتە خوارەوە بۆ لای ڕووبارەکە ، هەر لێرەدا زرمەی دێ . ئەڵێی بە ئەنقەست وادەکات .»

کۆڵکا ماڵاشکین کە کابرایەکی کەتەی لچ ئەستوور بوو چاوێکی دادەگرت و دەیوت : «هەقی خۆمە . هیچ یاسایەك ڕێم لێ ناگرێ .»

ماڵی ماتلی ریازانتزیفی سەرۆکی کۆڵخۆزی گوندەکە لەسەر سووچی کۆڵانێك دابوو کە کۆڵکا پیایدا دەڕۆیشت بۆ شەقامی گوندەکە . لەبەر ئەوە هاڕەی ئوکوردیۆنەکە بەدرێژایی ئەو کۆڵانە دەبیسترا ، پاشان بە لای خانووەکەدا پێچی دەکردەوەو لەولا تریش هەر دەبیسترا .

هەر کە بەرایی دەنگەکە دەگەیشتە کۆڵانەکە ، ماتلی لە ناوجێ هەڵ دەستاو قاچی شۆڕ دەکردەوە بۆ زەمینە ساردەکەو دەیوت : «بەزمە دیسان ! .. دەبێ سبەینێ لە کۆڵخۆز دەری بکەم . شتێکی لێ دە دۆزمەوەو دەری دەکەم .

هەموو شەوێ ئەمەی دەوت بێ ئەوەی کوڕە دەربکات . ئەگەر بە ڕۆژ کۆڵکای بدیایە پێی دەوت «تاکەی واز لەم ناڵە ناڵی نیوە شەوەت ناهێنی ؟ . خەڵکی دوای ماندوویی ڕۆژگار پێویستیان بە حەوانەوە هەیە گەچی تۆ ناهێڵی بنوون ! . ئەڵێی دەهۆڵکوتی !»

«هەقی خۆمە .» کۆڵکا وەك هەموو جارێ وەڵامی دەدایەوە .

«هەقت پیشان دەدەم !»

هەر ئەوەندەبوو ، گفتوگۆکە لەوێدا دەبڕایەوە .

بەڵام ماتلی هەموو شەوێ لە سەر جێگەکەی سوێندی دەخوارد «دەبێ سبەینێ دەری بکەم .» پاشان دەستی دەکرد بە بیرکردنەوە ، ئیتر تا ماوەیەکی زۆریش دوای ئەوەی دەنگی ئوکۆردیۆن لە شەقامەکەدا دادە مرکایەوە ئەو هەر بیری دەکردەوە . پانتۆڵەکەی هەڵ دەکێشا لەسەر کورسییەك دادەنیشت ، جگەرەیەکی لە باخەڵی دەردەهێناو دای دەگیرساند .

«چیت کرد ، جگەرەی ڕۆژێکت کێشا !» . ژنەکەی

**بەدەم خەوەوە بانگی لێدەکرد .**

**«بنوو !» ماتڵی بە کورتی وەڵامی دەدایەوە .**

گوایە ئەم هەموو خەیالاتە لە بارەی چی‌یەوەبوو ؟ لە ڕاستیدا شتێکی‌وا نەبوو ؛ یادی ڕۆژانی ڕابوردوو ، ئەویش نەک شتێکی تایبەتی بەڵکو هەندێ بیرەوەری تەم لێنیشتوو . بەلام شەوێکیان کاتێ مانگ بەرزبووەوە ئۆکۆردیۆنەکە دەنگی دەهات ، بۆنی تیژی گەرمی‌و هەوای ساردی شەو لە پەنجەرەکەوە پەخش دەبوو بە ژوورەکەدا ، ماتڵی شەوێکی تەواو جیاوازی بیرکەوتەوە . ئەو شەوە وەك گۆڕ تاریك بوو . باوکی‌و کوزمای برا بچووکی پازدە کیلومەترێك لە گوندەکە دوور کەوتبوونەوە لای کوچوکوری‌یەوە . بۆ شەوەکەی کوزما دەنگی نووسابوو ، توومەز ئەو ڕۆژە ئارەقی کردوتەوەو لە کانی‌یەك ئاوی تەزیوی خواردبووە ، بۆیە شەو قورگی دەچێتەوە یەك . باوکیان ماتڵی خەبەر دەکاتەوە پێی دەڵێ سواری ئیگرێنکا ببێ (ئەمە گورجترین ئەسپیان بوو)و بەغار تا دەتوانێ خێرا بچێ لە گوندەکە هەندێ شیر پەیدا بکات .

«منیش لێرەدا ئاگرێ دەکەمەوەو کە شیرەکەت هێنا دەیکوڵێنین ئەبێ فریای قوڕگی بکەوین ئەگینا کوڕەکەمان لەدەست دەچێ .» باوکی وتی .

ماتڵی گوێی لە دەنگی لەوەڕانی ئەسپەکان گرت ، ملی ئیگرێنکای گرت ، لغاوی کردو ، ئەو گوریسەی پێی بەسترابووە کرد بەقامچی‌و بەربووە بەرسکی ئەسپەکەو تێی تەقاند بۆ گوندەکە . ئێستا ماتڵی بەرەو شەست سالان دەچێ ، بەلام ئەوسا دوازە سیازە سالان‌بوو ، کەچی هێشتا ئەو شەوەی چاك لەبیرە . ئەسپ‌و کوڕەکە وەگ یەگ پارچە بە تاریکایی یەکەدا وەك تیر دەردەچوون . شەویان بەسەردا هات‌و پرژی گیاتەڕەکەی دەپرژاند بە دەموچاویاندا . ماتڵی لاوای هەست دەکرد شەپۆلی ئەشئەیەکی سەیر ڕای دەماڵێ ؛ خوێنی لاجانگی شەپۆلی دەدا . دەتوت بە ئاسمانەوە ، دەتوت زەوی بەجێ هێشتووەو دەفڕێ هیچی نەدەبینی . نە ئاسمان نەزەوی نە سەری ئەسپەکەش . تەنیا شتێك ئاگای لێبێ ئەوەبوو هوژەی غاردانەکە دەی‌دا بە گوێی‌داو دەریای شەوی بێ‌ئامانیش بەرەو ڕووی دەکشا . بیری لە برا نەخۆشەکەی نەدەکردەوە ، بیری لە هیچ نەدەکردەوە . دڵی خۆش‌بوو ؛ دوا

ژێی گیانی بە خۆشی‌یەکی بێ پایانی دەگمەن دەلەری‌یەوە .

پاشان نۆرەی حەسرەت بوو . شیرەکەی پەیدا کردو گەڕایەوە ، بینی باوکی کوڕە بچکۆلەکەی ناوە بە سنگیەوەو بە دەوری ئاگرەکەدا دەسوڕێتەوە ، لەوە دەچوو خەریکی بێت .

**«وەرە ، کوڕم ، چیتە ، ها .. ! کەمێکی تریش چاوەڕێ‌بە ، تا شیرەکە دێت . تۆزێکت بۆ دەکوڵێنین‌و تۆش یەکسەر هەناسەت بەر دەبێ . پەلەمەکە کوڕە شیرینەکەم .. ئەوەتا ئەوە ماتڵی‌یە شیرەکەی هێناوە ..»**

بەلام کوزما هەناسەی بۆ نەدەدرا . کاتێ دایکی دوای ماتڵی گەیشتە سەری کوزما مردبوو . باوکی دانیشتبوو ، سەری لە بەینی هەردوو قۆڵیدا گرتبوو ، بەم‌لاولادا خۆی دەشەکاندو ناڵە ناڵی لێوە دەهات . ماتڵی بە سەرسامی‌و چاوی پرسیارەوە لە براکەی وردبۆوە . تا دوێنێ بوو پێکەوە لە ناو کاکەدا یاریان دەکرد ، کەچی ئێستا منالێکی تەواو جیاوازە ، نامۆیەکی بچکۆلەی سپی‌ی شین هەڵگەڕاوە لەبەردەمیدا ڕاکشاوە .

چەند سەیرە ، ئەم ئۆکۆردیۆنە نەعلەتی‌یە چۆن ئەو تەرحە یادگارەی خرۆشاند ! . بۆ لەناو ئەو هەموو شەوانەی ژیانیدا تەنیا ئەو شەوە ؟ . یەك ژیانی دوورو درێژ بەسەر ئەو شەوەدا تێ پەڕیوە ـ ژن هێنان ، هەرە وەزاندن ، جەنگ . جۆرەها شەوی جیاواز ! . بەلام هەمووی کاڵ بوونەتەوە ، لە ڕابرووەدا تواونەتەوە . بە درێژایی ژیانی ئەوەی پێویست بووبێ کردوویەتی . کە داوایان لێ کردبوو بچێتە کۆڵخۆزەوە چووبوو ، کە کاتی ژن هێنانی هاتبوو ژنی هێنابوو ، ئینجا خۆی‌و ئەلێونا منالیان بووبوو ، گەورەبوون ، .. پاشان جەنگ دەست پێ دەکات ، ماتڵی دەچێ بۆ شەڕ . لەوێ بریندار دەبێ‌و پێش هاوڕێیانی دەگەڕێتەوە . ئینجا پێی دەڵێن : «ماتڵی دەبێ ببی بە سەرۆك ، کەسی‌تر نیە .» بەم جۆرە دەبێ بە سەرۆکی کیڵگەکە . بە هەر جۆرێك دەبێ بە ئیشەکە ڕادێ‌و خەڵکیش لەگەلی هەل دەکەن . ئەوەتا تا ئێستاش هەر زرمەی دێ ـ ئیش ، ئیش ، درێژایی ژیانی هەر ئیش . جەنگیش هەر هەمان شت‌بوو ـ ئیش . هەموو شپرزەیی‌و خۆشی‌و حەسرەتی هەر بەدەم ئیشەوە بووە . ئەگەر بۆ نموونە گوێی لە خەڵك بوایە باسی (خۆشەویستی) دەکەن دە حەپەسا . بۆی دەرکەوت شتێك بە ناوی خۆشەویستی‌یەوە لە دنیادا هەیە . خۆی دەبێ

ئەلیۆنای خۆش ویستبێ . (تا کچبوو نازداربوو) . بەڵام لەوە بەولاوە هیچی لە بارەی مەسەلەکەوە نەدەزانی . تەنانەت گومانی لە قسەی کەسانی تریش دەکرد لەو بارەیەوە . گۆرانی بە خۆشەویستیدا هەڵ دان فرمێسك ڕشتن و هەنسك‌دان و تەنانەت خۆکوشتنیش ، ئەمانەی هەر بە بیستن بیستبوو . گەرچی مەسەلەکە لە عادەت و خۆ واپیشان دانەوە نەبوو ، خەڵك لای وابوو پێویستە باسی خۆشەویستی بکەن بۆ لێی دەدوان . بەڵام هەر لەبەر نزیك بوونەوەی کاتی ژن‌هێنانیان بوو ! . بۆ نموونە کۆلکا بگرە . بڵێی کەوتبێتە داوی خۆشەویستی‌یەوە ؟ . بێگومان نینکا داویەتی لە کەسەی ، جا کچێکی نازداری وەك ئەویش ! . جگە لەوەش کۆلکا کاتی ژن هێنانیەتی ، بۆیە بە درێژایی شەو ناڵەی دێت و نوکوردیۆن دەکوتێ . جا بۆ نەی‌کات ؟ . گەنجە ، لە هەرەتی توانادایە ... هەمیشە هەر وابووە . بەس نیە ئێستە کورگەل لەسەر کیژان نادەن بە یەکدا ! . جاران وابوو . واتلی خۆشی زۆر جار شەڕی کردبوو . هەمووی ئەنجامی یەك شتە ـ وزەی زیادەو ئارەزوو ـ پیاو ناچارە دەبێ بەهەر شێوەیەك بووە بەکاری بێنێ .

شەوێکیان ماتلی لەسەر قەراغی چەرپاکەی دانیشتبوو بیری دەکردەوە ، ژنەکەی ڕاتەکاند :

«هەستە ، دەی ، دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم .»

«چیتە ئەوە ؟»

«قەت کەست خۆش ویستووە ؟ . من یا هەر کەسێکی تر ؟»

ئەلیۆنا لە سەرسامیدا جووڵەی لێ بڕابوو .

«چی‌یە ، سەرخۆشیت ؟» .

«بە هیچ جۆرێ ! ... خۆشت دەویستم یاخود چی پێ دەڵێن ، هەروا وەك ڕەسم شووت پێ کردم ؟ .. بە ڕاستمە .»

ئەلیۆنا بۆی دەرکەوت مێردەکەی نەی‌گرتووە بەڵام پەلەی نەکرد لەوەڵام دانەوەیدا .

«چی وای لێ کردووی بیر لەشتی وا بکەیتەوە ؟» .

شتێك هەیە دەمەوێ پەی پێ بەرم ، خوا بی‌بڕێ . شتێك نارەحەتی کردووم .. لە جۆرە نەخۆشی یەك دەچێ .»

«بێگومان خۆشم دەویستی» . ئەلیۆنا بە دڵنیایی‌یەوە وتی . «ئەگەر وانەبوایە چۆن شووم پێ دەکردی . بیرت نایە چۆن مینکا کۆروۆلیۆف دەورو خولی دابووم ، کەچی شووم پێ نەکرد ! . بەڵام چی وای لێ کردی بەم نیوەشەوە بیر لە خۆشەویستی بکەیتەوە ؟ . چی‌یە مێشکت تێك چووە ؟» .

«باشە بڕۆ !» ، ماتلی ڕقی هەستا ، «بڕۆ بنوو !» .

بیرت نەچێ سبەینێ مانگاکە بکەیت لەگەڵا . بیرم چوو پێت بڵێم . من بەیانی لەگەڵ ژنان دەچم بۆ ڕنین .»

«لە کوێ ؟» . ماتلی گوێ قولاغ بوو .

«خەمت نەبێ لە کێڵگەکانی تۆ نا .»

ئەگەر ئەو گیایە بشێلن یەکی دە ڕۆبڵ جەزاتان لێ دەستێنم .»

«شوێنێك دەزانین گیای لێ نادروونەوەو پڕیشە لە بەر . تۆ بیرت نەچێ مانگاکە بکەی لەگەلا .»

«باشە .»

دەبێ ئەو شەوەی ماتلی غاری‌دا شیر بۆ براکەی بهێنێ چی ڕووی دابێ ؟ بۆ واکوتوپڕ بیری کەوتەوە ؟ . بەم بیری‌یەوە خەریکە کەر دەبم . ماتلی لەدڵی خویدا وتی . خەڵك هەمووی خەریکە کەر دەبن .

ئیتر دڵ نارەحەتی یەکەی هێمن نەدەبوەوە . بەبێ ویستی خۆی چاوەڕێی کۆلکاو هاڕەی ئۆکۆردیۆنەکەی دەکرد . ئەگەر لە ڕۆژان زیاتر دەنگی نەهاتایە بێزار دەبوو ، لە نینکا توورە دەبوو . «ئەو کچە جەحێڵە .. دیارە ڕێی لێ دەگرێت !» .

بەو جۆرە دادەنیشت و بەدەم جگەرە کێشانەوە چاوەڕێی دەکرد . تا دوور لە کۆلانەکەوە دەنگی ئۆکۆردیۆنەکە سەری هەڵ دەداو دڵ نارەحەتی‌یەکەی ئەمیش دەکولایەوە . بەڵام نارەحەتی‌یەکی سەیر بوو ـ خۆش بوو . بێ ئەو نارەحەتی یە ماتلی خۆی بە ناتەواو دەزانی .

بیرەوەری چەند بەیانی‌یەکیش دەی دایەوە لە خەیاڵی : کاتێ بە پێی پەتی بە گیاکەدا دێت و دەچێ کە سەرتاپا شەوڵی لێ دەچۆڕێ و بە دوای خۆیدا ڕێچکەیەکی کاڵ بەجێ دێڵێ و شەو نمەکەش چزە لە پێی هەڵ دەستێنێ . ئیستاش ئەو چزەیە گیانی دەخاتە لەرزین .

جاری واش بوو لە خۆیەوە بیری لە مردن دەکردەوە . بەم زووانە هەموو شتێ دەبڕێتەوە . بیری لە ترس و ئازاری نەدەکردەوە ، بەڵکوو سەمەرەیی‌ی . ژیان وەك جاران دەگەڕێ ، بەڵام ئەو بەرەو گۆڕستان بەڕێ دەکرێ و دەکرێ بە

ژێر خاکەوە . سەیرە . چۆن دوای ئەویش هەموو شتێ هەر وەك خۆی دەگەڕێت بێگومان ، خۆر هەر هەڵ دێو ئاوا دەبێ ، وەك جاران . بەلام خەڵکی تر لە گوندەکەدا پەیدا دەبن کە ئەو هەرگیز نایان نا سێ . سەری لەمە دەرنەدەکرد . لەوانەیە تا دەپازدە ساڵێکی تریش هەندێ کەس ماتڵی ڕیازاتزیفێکیان بیر بمێنێ بەلام ئەی دوای ئەوە .. بەهەر حاڵ ئەو/حەزی دەکرد ئاگایەکی لە حاڵیان بێ . لە گەڵ ئەوەشدا هەستی بە لەدەست چوون نەدەکرد . بەشی خۆی خۆر کەوتنی دیوەو لە ڕۆژانی پشوودا حەساوەتەوە . بەشی خۆی ڕۆژگاری خۆشی ڕابواردووە . نەخێر داخ بۆهیچ ناخوات ، زۆری دیوە . بەلام ئاخ لەو خەیاڵە : ئەو کۆچ دەکات و کەسانی تر دەمێنن ، بۆ هەتا هەتایی کۆچ دەکات ! تۆبڵێی دوای ئەو ژیانیان خاڵی‌تر بێ ؟ . کۆچی ئەو هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ ؟ .

«های ! بەڕاست پیر بووم !» ئەم خەیاڵاتە تەواو کەنەفتی کرد .

«هێی ، هەستە !» . ماتڵی ژنەکەی ڕادەوەشێنێ . «تۆ لە مردن ناترسی ؟» .

«کابرا شێت بووە !» ئەلیۆنا لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی . «قابیلە ! کێ هەیە لە مردن نەترسێ !» .

«من ناترسم» .

«باشە بڕۆ بنوو . پێویست ناکا بیری لێ بکەینەوە .»

«ئەی تۆ بۆ نانووی ؟» .

بەلام هەر کە ئەو شەوە تاریکە بێ ئامانەی بیر دەکەوتەوە ، کاتێ بە سواری ئەسپەکەیەوە دەفڕی ، ئازارێکی تیژی شیرین دەیدا لە دڵی . نەخێر ، شتێك هەیە لە ژیاندا ، کە لە دەست چوونی نێجگار ناخۆشی و حەسرەتناکە ، پیاو دەخاتە گریان .

شەوێکیان بێ هودە چاوەڕێی نۆکۆردیۆنەکەی کوڵکا بوو . دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا بەلام هیچ دەنگ نەبوو . زۆر چاوەڕێی کرد بەلام بێ ئەنجام ... ئەو شەوە تەواو حەپەسابوو . هەر کە دنیا ڕوناك بۆوە ، ماتڵی ژنەکەی خەبەر کردەوە :

«دەهۆڵ کوتەکەمان چی لێ هاتووە ؟ ئەم شەو دەنگی نەبوو .»

«ژن دێنێ . ئاهەنگەکەی ڕۆژی یەك شەممەیە .» .

ماتڵی بەم هەواڵە خەمناك‌بوو . خۆی کردەوە بە ناو جێداو هەوڵی‌دا بخەوێ ، بەلام بێ کەڵك بوو . تا خۆر کەوت چاوی بڕیبووە بنمیچەکە . هەوڵی دەدا شتێکی‌تر لە ڕابردوو یاد بکاتەوە ، بەلام هیچی بیر نەدەکەوتەوە . دووبارە نۆرەی خەمی کیلگەو کوڵخۆزە . بەم زوانە کاتی دروێنەیەو نیوەی کەمباینەکانیش لای ئاسنگەرەکە کەوتوون . ئەو شەیتانە خێڵەیش ، فیلیای ئاسنگەر ، هەر خەریکی کەیف و خواردنەوەیە ، ئەم ئاهەنگەشی بۆ دەبێ بە بیانوو ، یەك هەفتەی تەواو بە فیڕۆ دەچێ .

دەبێ سبەینێ قسەیەکی لەگەڵ بکەم . بۆ سبەینێ کە کوڵکای لێ ئەستووری بینی بە لاقرتێیەوە لێی ورد بۆوە :

«ئێ ، کوڕم ، کەوابێ نۆکۆردیۆن لێدان تەواو ؟» . کوڵکا بزەیەکی فراوان گرتی :

«بەڵێ تەواو چیتر شەوان خەوت لێ نازڕێنم : تەواو .»

«باشە ، خێری پێوەبێ .» ماتڵی ئەوەی وت و ڕۆیشت . دڵت

بەچی ئەوەندە خۆشە کوێرەکە ؟ . لە دڵی خۆیدا وتی . دوو ڕۆژی تر نینکاکەت شاخت دەگرێ . خێڵی کریچیتۆف هەموو لەو بابەتەن . هەفتەیەك تێ پەڕی .

هێشتا تیشکی مانگ لە پەنجەرەکەوە بە ژوورەکەدا پەخش دەبوو . بۆنی گەرمایی و گەڵا پەتاتە تازەکانی بێستانەکە هەواکەی تیژ کرد بوو . دنیا خامۆش‌بوو .

ماتڵی خەوی تێك چووبوو . خەبەری دەبۆوەو دەستی دەکرد بە جگەرە کێشان . جار جار دەچووە دەرەوە تا پێکێ گلاس بخواتەوە ، یا دەچووە دەرەوە لەسەر یەکێ لە قادرمەکات دادەنیشت و دەستی دەکرد بە جگەرە کێشان . گوندەکەش لەبەر تیشکی مانگە شەودا لە خامۆشی‌یەکی ترسناکدا ڕاکشابوو .

کتێبی : Vasily Shukshin
I WANT TO LIVE
Progress Publishers
Moscow 1978 PP. 191 — 199

# نـووسـیـن و

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

**لە بەراوردکردنی ئاخاوتنەوە لەگەڵ نووسین ، ئەوە دەردەکەوێ کە ئاخاوتن دێرینترە . تەمەنی ئاخاوتن لە (400 — 500) هەزار ساڵێك کەمتر نییە ، بەلام تەمەنی نووسین هەشت نۆ هەزار ساڵێك دەبێ [1] .**

نووسین وەسیلەیەکە بۆ لەیەکتر گەیشتن و تەواوکەری ئاخاوتنە . پێویستی ئادەمیزاد بۆ لەیەکتر گەیشتن لە دوورەوەو لەکاتی جیاوازدا بووە بە هۆی پەیدابوونی نووسین . دیارە قسە ئەگەر بەهۆی نیشانەی تایبەتییەوە لەسەر شتێك نەنووسرێ ، ئەوە نەکەسێکی دوور دەتوانێ لێی ئاگادار بێ و نە بۆ دەمێکی دواتریش دەمێنێتەوە[2] . بەوێنە یەکێك بیەوێ هاورێیەکی لە شارێك یان ولاتێکی تر پاش ساڵێك کارێکی بۆ جێبەجێ بکا ، ئەوە دەتوانێ نامەیەکی بۆ بنووسێ و بیخاتە زەرفێکەوەو لەسەری بنووسێ ، کە دوای ساڵێك بیکاتەوە . جا پاش ساڵێك ماوەیەك بەسەر نووسینی ئەو نامەیەدا تێدەپەرێ و رەنگە دوو هاورێکەش هەزاران کیلۆمەتر لەیەك دووربن . بەلام ئەو نووسینە مەبستەکەی پاراستووەو گەیاندوویە . ئەگەر ئەم داوایە نەنووسرایەو هەر وەك قسە بکرایە ، نەدەگەیشتە جێ و نە دەمایەوە ... هەروەهاش دەزانین ، ئەگەر دوو کەس چەندیش دەنگ گەورەبن ، لەچوار پێنج کیلۆمەتر دوور لە یەکترەوە ناتوانن بە باشی گوێیان لەیەکتر بێ و چاك لەیەك تێبگەن[3] .

پەیدابوون و بوونی نووسین وەك وەسیلەیەکی تایبەتی بۆ لەیەکتر گەیشتن ، دەورێکی دیاری بووەو هەیەتی . نووسین یارمەتی ئادەمیزادی داوە لە کورتکردنەوەی دووری و کاتدا ؛ تەجروبەی ئادەمیزادی پاراستووەو دەپارێزێ و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی هێشتوتەوەو دەهێڵێتەوەو لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تری گەیاندووەو دەگەیەنێ . بەهۆی نووسینەوە هەر مرۆڤێك دەتوانێ کەڵك لە تەجروبەی مرۆڤایەتی وەربگرێ و گەشەی پێبدا .

هەرچی دیاردەی گەورەی سیاسی یان ئەدەبی یان زانستی هەیە ، کە لە ناوچەیەکدا لەدایك بووە ، بەهۆی نووسینەوە گەیشتووەتە هەموو جیهان .

دەنگی ئادەمیزاد بەبێ ئامرازی تایبەتی ، وەك : تەلەفوون و رادیۆ ... تاد تەنیا لە سنوورێکی تەسکدا دەمێنێتەوەو هەر لە چوارچێوەی گوێلێبووندا کاردەکات . ئەوەی پێوەندی بە مانەوەشییەوە هەیە لەرووی کاتەوە ، دەمێکە قسەی نەستەقی وا وتراوە کە نووسینی بەگرنگتر لە ئاخاوتن داناوە . بۆ نموونە رووسەکان دەڵێن : «وشە چۆلەکە نییە ، کەچی دەشفرێ و ناگیرێ» ، بەلام «ئەوەی بەقەڵەم نووسراوە ، بەتەوریش نابررێتەوە» . ئەمەش نزیکی لەگەڵ ئەو قسە نەستەقە لاتینییەدا هەیە ، کە دەڵێ : «Verba volant — scripta manent» ـ واتە «وشە دەفرێ ، نووسین دەمێنێتەوە»[4] .

راست وایە پەیدابوونی نووسین بگەرێنرێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی ، کە قسەکەران پێویستیان بەوە بووە ، زەحمەتیی گەیاندنی دەنگی خۆیان بە هۆزێك یان نەوەیەکی دی ئاسان بکەن . بۆیە لەرووی ئەرکەوە جۆری هەرە دێرینی نووسین ، نامەو نووسراوی سەرکێلی گۆر بووە ، بەلام ئەم جۆرە نووسینەش هەروەك زمانی ئاخاوتن زوو بەسەرچوو . بەدوا ئەمەدا نووسراوی هەڵکەنراوی سەر بەردو دیواری ئەشکەوت و تاقی سەرکەوتن ... تاد هاتە کایەوە . لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵی ئادەمیزاددا نووسینیش پێشکەوت و ئەرکی پاشان وردە وردە فراوانتر بووو جۆری نوێی لێپەیدابوو . ئەو نووسینانەی ئەمرۆ دەیانبینین لە ئەنجامی هەوڵ و تەقەلای دوورو درێژو بەردەوامیی شەنوکەو کردنی ئەوەی زووتر لەو بارەیەوە کراوە ، هاتۆتە بەرهەم .

**نووسین کە کەرەستەی تەواوکەری زمانی ئاخاوتن و**

نموونە ١



# جۆرەکانی و مێژووی

لەیەکتر گەیشتنە ، لە شێوەو جۆری هەمەچەشنی خۆیدا لە سەردەمی جیاوازدا بە چەشنی جیاواز پێوەندی لەگەڵ زمانی گفتوگۆدا بووە .

لەگەڵ یەکنەبوونی بیروڕای هەندێ زاناشدا ، بەر لەهەر شت پێویستە گومانی پەیدابوونی نووسین لەپێش زمانەوە بڕەوێنینەوە . ئەگەر مرۆڤ زمانی نەبێ ، نووسینیشی نابێت . نووسین لەهەموو پلەکانی پێشکەوتنی ئادەمیزاددا تەواوکەری ئاخاوتنە - واتە دووەم وەسیلەی لەیەکتر گەیشتنە . دەربڕینی زمان بەهۆی ئەلفوبێوە هی دەورێکی زۆر درەنگی پێشکەوتنی نووسینە . وا دیارە لە سەرەتادا پەیام پەیدابووە . لەم بارەیەوە هیرادۆتی مێژوونووسی یۆنانی (سەدەی 5 ی پێش زایین) نووسیوێتی ، کەوا کاتێ ئەسقووفەکان لەگەڵ فارسەکاندا شەڕیان دەکرد پەیامێکیان بۆ ڕەوانە کردن ، کە لەم گیاندارانە : (بۆق ، مشک ، مەل) و پێنج تیر پێکهاتبوو ، کە واتای «ئەگەر ئێوەی فارس فێرنەبن وەک بۆق لە زەلکاودا قونەقون بکەن و وەک مشک لەکوندا خۆتان بشارنەوەو وەک مەل بفڕن ، ئەوە وەک گەلای دار بەتیرەکانمان دەتان خەین» . ئەم نموونەیە نیشانەیەکی ڕەمزییە ، کەهەر شتێک تێیدا ڕاستەوخۆ ڕەمزێک نیشان دەدا ، وەک (مەل - فڕین ... تاد) . مانای گشتیی ئەو پەیامە لە لایەن ڕەبەنەکانی دارای پادشای فارسەوە لێک درایەوە[6] .

لەتەک ئەو نیشانە ڕەمزییە ، هەروەها نیشانەی مەرجیش هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە شتەکان هیچ دەرنابڕن ، بەلام وەک نیشانەی مەرجی بەکار دەهێنرێن . بەوێنە پەیامێکی بەکیبو بەناوبانگی ناوچەی پیرۆ (لە خوارووی ئەمەریکا) کە بریتییە لە : دارێک پەتی هەمەڕەنگی پێدا هەڵواسراوەو گرێی جۆربەجۆریان لێدراوە (بڕوانە : وێنەی ژمارە 1) . یاخود پەیامێکی خێڵی ئیزۆکیزی[7] ، کە بەوامپوم ناسراوە بریتییە لە : پشتێنێک و گوێچکە ماسیی هەمەڕەنگی گەورەو بچووکی پێوەکراوە (بڕوانە : وێنەی ژمارە 2)[7] .

ئەم جۆرە پەیامانە بە زۆری هەواڵی بەلاو وێرانییان دەگەیاند ... لەبارەی واتای گرێی پەتەکان و دانانی گوێ ماسییەکانەوە ، بێگومان پێویستە زووتر ئەوە بزانرێ کە کێ نامەی وا دەنووسیّ و کێ وەری دەگرێ . جا ڕەبەنەکان ئاگاداری ئەوە بوون و بۆیە بە ئاسانی لەمەبەست تێ دەگەیشتن[8] .

بەم چەشنە ، بە واتایەکی فراوانتر ، دەتوانرێ هەموو شێوەیەکی لەیەکتر گەیشتنی مرۆڤ بە یاریدەی نیشانەی بینراوەوە دەربڕێ - واتە بەهەر نیشانەیەک کە چاو ببینێ ... ناوەڕۆکی ئەم دیاریکردنە تەنیا نووسین و چاپ ناگرێتەوە ، بەڵکو هەموو نیشانەیەکی تری وەک : نیشانەی هاتوچۆو نیشانەی سەر قوتوی شیرو گۆشت ... یش دەگرێتەوە .

زانست سێ جۆری سەرەکیی نووسینی لێ ئاشکرایە ، کە بەپێی پلەی مێژوو بەدوایەکدا هاتوون :

**یەکەم جۆری نووسین لە مێژووی ئادەمیزاددا ، نووسینی وێنەیی (Pictography - الکتابة التصويرية)یە .** نموونەی نووسینی پیکتۆگرافی[9] چ لە لایەن زانایانی ئاسەوارەوەو چ لە لایەن ئەتنۆگرافەکانەوە دۆزراوەتەوە .

لە نووسینی وێنەییدا وێنەی مرۆڤ ، بەلەم ، گیانلەبەر ... بەخەت کێشراوە . بێگومان چ ئەوانەی بە مێژووی هونەرو چ ئەوانەی بە ئەتنۆگرافیاوە خەریکن ، لێکۆڵینەوەی ئەو جۆرە وێنانەیان بەلاوە گرنگە ، چونکە هونەرو نووسین لەم ڕووەوە بەیەکەوە بەستراون ، بەلام لەڕووی ئەرکی نووسینەوە ، مەسەلەی هونەری گرنگ نییە .

وێنەی ژمارە (3) کە «یادداشت»ی ڕاوکەرێکی ئەسکیمۆیەو وێنەی ژمارە (4) کە «داواکاری»ی هیندییەکانە ، دوو نموونەی جوانی نووسینی وێنەیین . یەکەمیان خوێندنەوەی ئاسانترە ، چونکە ناوەڕۆکەکەی باش دیارە «مرۆڤێک چووە بۆ ڕاو ، پێستی درندەیەکی دەستکەوت ، دواتر پێستێکی تریش ، ڕاوی فیلی ئاویی کرد ، لەگەڵ ڕاوکەرێکی دیدا سواری بەلەم بوون ، شەو مایەوە» . لێرەدا ڕیزی هێڵەکانی وێنەکە واتای ڕیزی هێڵەکانی ڕوودا وەکە نیشان دەدەن .

**وێنەی دووەم داواکاریی خێڵە هیندییەکانە لە سەرۆکەکەیان ، کە دەیانەوێ ڕێگەیان بدات بچن لە ناوچەی دەریاچە جێنشین ببن . ئەم پیکتۆگرافییە**



نموونە 2

**خوێندنەوەی گرانترە ، چونکە جگە لە باسی گیاندار ، هەروەها مەبەستی واتای داخوازی خێڵە هیندییەکان باسەکە فراوانتر دەکات[10] .**

بۆ تەواو روونکردنەوەی ئەم جۆرە نووسینە ، با بۆ نموونە دوو هاوڕێی ئەم سەردەمەش بێنینە پێش چاومان ، کە ویستوویانە نامەی وێنەیی بۆ یەك بنووسن. یەکێکیان وێنەی مانگ لە تاریکاییدا دەکاو ئنجا رۆژ لە کەلەوە ، بەدوا ئەمەشدا وێنەی ئەسپێك لەسەر ئاوی سەرچنار ... دووەمیان وێنەی رۆژ دەکا لەکەلەوەو ئنجا مانگ لە تاریکاییدا ، بەدوا ئەمەدا وێنەی پیاوێك لەسەر مێزێك و بوتڵێ لەبەردەمیدا . وا بزانم نووسراوی یەکەم دەڵێ : «سبەینێ بەیانی بەسواری ئەسپ دەچم بۆ سەرچنار» . دووەمیشیان دەڵێ : «ئەمرۆ ئێوارە دەخۆمەوە» .

لە بەراوردکردنی ئەو نموونانەوە ، دیارە کە لە نووسینی وێنەییدا هەموو ئەوەی لەبەرچاوە واتای راستەوخۆ دەگەیەنێ ، بەڵام هەرچی واتای گشتییەتی بەگران لێك دەدرێتەوە .

نووسینی وێنەیی پەیوەندی بە ئەلفوبێوە نییە ـ واتە بریتی نییە لە کۆکردنەوەی نیشانەی دیاریکراوو هەروەها بە فێرکردنی خوێندنەوەشەوە بەند نییە ، چونکە مەبەست ، گەیاندنی واتای پێویستییەکە ... بێ پەیوەندیتی نووسینی وێنەیی بە زمانێکی دیاریکراوەوە ، بووەتە هۆی ئەوەی بتوانێ ببێ بە وەسیلەیەکی لەبار بۆ لەیەکتر گەیشتنی هۆزی خاوەن زمانی جیاواز .

هەرچەندە ئێستا نووسینی وێنەیی وەك چەشنێکی سەرەکی نووسین لە کاردا نەماوە ، بەڵام لە هەندێ بواردا بەکار دێنرێ ، بەوێنە : لە جامخانەو پڕۆپاگندەو ... دا .

لەگەڵ پێشکەوتنی ئادەمیزادو گەشەکردنی بیرو هەستیدا ، پێویستی وا هاتە ناوەوە کە ئیتر نووسینی وێنەیی نەتوانێ ئەو ئەرکە بەجێبێنێ و ئەو دەمە نووسینی ئیدیۆگرافی (Ideography)[11] ـ واتە (نووسینی بیر) هاتە مەیدان . لەم جۆرە نووسینانەدا نیشانەکان واتای راستەوخۆی دیاردەکان نادەن ، بەڵکو ئەو بیرە رادەگەیەنن کە لە مێشکی ئادەمیزاددا پەیدا دەبێ .

پەیدابوونی نووسینی ئیدیۆگرافی پەیوەندی بە پێویستی دەربڕینی ئەو شتانەوە هەیە کە نەدەتوانرا لە رێگەی وێنەوە نیشان بدرێن . بە وێنە بۆگەیاندنی واتای (بینین) ، وێنەی ئەو ئەندامەی لەش (واتە ـ چاو) دەکرا کە شت بە هۆیەوە دەبینرێ . بەم جۆرە لە هەنگاوی یەکەمی ئیدیۆگرافیدا هەمان رێگەی پیکتۆگرافی ـ واتە رێگەی وێنە ـ دەگیرا ، بەڵام لە گەیاندنی واتادا جیاوازی هەبوو : لە نووسینی پیکتۆگرافیدا وێنەی واتای «چاو»ی دەگەیاند ، کەچی لە ئیدیۆگرافیدا مانای «بینین»ی دەدا ـ واتە لە ئیدیۆگرافیدا وێنە واتای ئەرك یاخود ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو شتەی مەبەست بوو . هەر بەو شێوەیە دەکرێ واتای «دۆستایەتی» بەهۆی وێنەکردنی دوو دەستەوە دەرببڕرێ کە یەکتر بگوشن ؛ یاخود دەشێ مانای «دوژمنایەتی» بەوێنەی دوو چەك بگەیەنرێ ، کە لە شێوەی خاچێکدا لێك درابن ... تاد .

لەم بارانەدا وێنە لە شێوەی مەجازدا مانا دەگەیەنێ ئە[illegible] واتا مەجازییانەی وێنە زۆر لە ئیستیعارەی هەندێ وش[illegible] دەچن . بۆ نموونە (زمان ـ لسان) ، (زمان ـ لغة) ... لە[illegible] قۆناغەی پێشکەوتنی نووسیندا ، یەك وێنە وەك چۆن واتا[illegible] راستەوخۆ دەگەیەنێ ، هەروەها مانای مەجازیش نیشا[illegible] دەدات ، جا بۆیە خوێندنەوەی ئەو جۆرە نووسینانە ئاسا[illegible] نییە . پێویستی خێرایی نووسین و پێویستی دەربڕینی تێکست[illegible] ئاڵۆز چ لە رووی ناوەرۆك و چ لە رووی رووخسارەوە بوونە هۆ[illegible] ئەوەی رێگەی دەربڕینی مەبەست بەهۆی وێنەوە بگۆڕرێت [illegible] نیشانەی مەرجی ـ هیرۆگلیف (Hieroglyph)[12] .

**پێشکەوتنی تەکنیکی نووسین ـ واتە دۆزینەوە[illegible] کەرەستەی لەبارتری لەسەر نووسین و ئامرازی نووسین بووە هۆی ئەوەی لەبریتی بەردو پارچەدارو توێکڵەدار ئامرازی تایبەتی بەکار بهێنرێ . لەمیسر لە قامیش تەبە[illegible] گەورەی لوولکراویان هێنایە بەرهەم ، لە وڵاتانی ت[illegible] پێستی هەمەچەشنەیان خۆش دەکرد ؛ سەرئەنجامیش [illegible] چین کاغەز دروست کرا . لە بریتی ئامرازی نەقش و نەقا[illegible] ئامرازی نووسین پەیدا بووو توانرا بە مەرەکەبی چینی[illegible] بە فلچە زۆر خێراتر نیگاری نیشانەکان بکێشرێن .**

**نووسینی هیرۆگلیفی لەوەدا لەبارە کە نیشانەکا[illegible] دەتوانن بە رووخساریش و ناوەرۆکیش نیشان بپێکن . ئاشکرایە ، بۆ ئەوەی شت بنووسرێ و بخوێندرێتەوە پێویست بە کۆمەڵێك نیشانەی دیاریکراو هەیەو ئە[illegible]**



نمونە 3

**دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی مەسەلەی ئەلفوبێ . بەلام نیشانەکانی هیرۆگلیفی ناتوانن بەباشی ئەم ئەرکە بەجێ بێنن ، چونکە هێندە زۆرن لەبیرکرد نیان زەحمەتە .**

هەرچەندە نیشانەکانی نووسینی هیرۆگلیف وشە لە رووی فۆنەتیك و رێزمانەوە سازناکەن ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو جۆرە نووسینێکی هیرۆگلیفیدا ، ریشەی نیشانەی دەنگ هەیە ، جا بۆیە لە لێکدانەوەی نووسینی ئەو دەمەدا مەینەتێکی نوێ پەیدا دەبێ ، چونکە هەر ئەو نیگارە ئیدیۆگرافیە لەهەمانکاتدا دیاردەیەکی فۆنەتیکیش (برگە ، دەنگ) نیشان دەدات .

بەهۆی کۆمەڵێك رووداوی مێژووییەوە ، لە ولاتانی رۆژهەلاتی نزیکدا دەورێکی نوێ لە پێشکەوتنی نووسیندا سەری هەلدا[13] .

لەم دەورەی پێشکەوتنی نووسیندا شتی سەرەکی ئەوەبوو ، کە دەبوو نووسین بۆ ئەوانەی بەکاری دێنن پتر لەباربێ . بەهۆی پێشکەوتنی بێوچانی ئادەمیزادو زیادبوونی پێویستییەکانی و گەشەکردنی دەریاوانی و بازرگانی و هاتوچۆو پێوەندی نێو دەوڵەتان هوە ... ژمارەی ئەو کەسانەی بەکاریان دەهێنا زۆر پەرەی سەند[14] .

بەم بۆنەیەوە بۆ ئاسانکردنی نووسین هەولی جۆربەجۆر درا . ئەو هەولانە لەرووی پێوەندی زمان بە نووسینەوە جیاواز بوون :

**یەکەم ـ لەرووی پێوەندی وشەوە .**

نووسینی چینی بەم رێگەیەدا رۆیشت ، بەوێنە بۆ راگەیاندنی واتای «فرمێسك» پێویست بوو دوو نیشانەی (چاو)و (ئاو) لەیەك بدرێن ؛ بۆ نیشاندانی مانای «وەڕین» دەبوو دوو نیگاری (سەگ)و (لوز) بکێشرێن ؛ بۆ دەربڕینی مەبەستی «قیژاندن» دوو وێنەی (مندال)و (دەم) بکرێن ؛ بۆ «تەماشاکردن» (مرۆڤ و درەخت) ؛ بۆ «رووناکی» (رۆژو مانگ) ؛ بۆ «دارستان» (دوو درەخت) ... بێگومان لەبەر زۆریی ئەو هیرۆگلیفانەو هەروەها هەندێ جاریش روون نەبوونی مانایان کاتێکی زۆرو ماندووبوونێکی زۆر پێویست بوو .

**دووەم ـ لەرووی رێزمانەوە .**

رێگەیەکی دی کورتکردنەوەو ئاسانکردنی نووسینی ئیدیۆگرافی بە مەسەلەی رێزمانەوە بەندە . ئەویش ئەوەیە کە رەگی وشە دەهێڵرایەوە . هەرچی ئەو وشانەشە کە لەو رەگانەوە رۆدەنران ، نیگاری تەواوکەریان لەگەڵ دادەنرا ، کە واتای ئافیکس بگەیەنن . بەلام ئەم رێبازە تەنیا بۆ ئەو زمانانە دەگونجا کە وشەیان تێدا بەسەر رەگو ئافیکسدا دابەش دەکرا . لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەم شێوازە دەوری لە کورتکردنەوەو ئاسانکردنی نووسیندا کەمبوو ، چونکە ژمارەی رەگ بێ سنوورەو هەر رەگێکیش پێویستی بە نیگاری سەربەخۆ هەبوو .

**سێیەم ـ لەرووی فۆنەتیکەوە .**

رێگەی هەرە لەبارو گونجاوی نووسینی فۆنەتێکی بوو ، چونکە ئەمە قالبێکی وایدا بە نووسین کە نەك تەنیا لەرووی پێکهاتنی رێزمانییەوە ئاوێنەی زمان بێ ، بەڵکو لەرووی قەوارەی فۆنەتیکیشەوە وشەی تێدا ببینرێ .

کاتی خۆی میسرییەکان و بابلییەکان هەولی ئەوەیان دا نووسین بخەنە سەر رێی فۆنەتیکی . بابلییەکان وشە ناسادەکانیان کەرتکەرت دەکردو بەم پێیە لەو دەمەدا هیرۆگلیف وای لێهات کە بە برگە (المقطع ـ Syllable) مانا بدات . بەم جۆرە هەنگاوی یەکەمی پێشکەوتنی نووسینی فۆنەتیکی نرا .

**باشترین نموونەی شێوەی نووسینی برگەیی ، نووسینی هیندیی کۆنە ، کە تێیدا هەر نیگارێك ، وەك دەستوور نیشانی کۆنسۆنانت بزوێنی (1)ی دەدا** ، واتە برگەی (دا ، را ، شا ، زا ... تاد) ؛ بۆ ئەوەی بزوێنێکی تر بخوێندرێتەوە نیگارەکە دەگۆڕرا ؛ ئەگەر بویسترایە تەنیا کۆنسۆنانتەکە بخوێندرێتەوە ، ئەوە نیشانەی «قەدەغە»ی لەگەڵدا دادەنرا ، بۆ کۆبوونەوەی چەند کۆنسۆنانتێکیش لە برگەیەکدا نیشانەی «پێکەوەبەستن» بەکار دەهێزا[15] .

نووسینی برگەیی کە نیشانەکانی هێندەی برگەکانن ، ژمارەیان ئێجگار زۆر نییەو بۆیە ئەم شێوە نووسینە تارادەیەك ئاسانە .

هەنگاوێکی تر لە پێشکەوتنی نووسینی کۆنی جوولەکەو فینیقییەکاندا نرا ، کەوا کۆنسۆنانتەکانی رەگی وشەیان تێدا بەپیت دەردەبڕراو ئەو بزوێنانەش کە فۆرمی رێزمانی بەجێ

دێنن بە نیشانەی تایبەتی جیا دەکرانەوە (لە عیبری یدا بە «شوا»و لە عەرەبیدا بە «حەرەکات») دەردەبڕران [18] . ئەم جۆرە نووسینانەش لە زانستی زماندا بە نووسینی «کۆنسۆنانتی» ناسراون[17] .

دوا هەنگاوی نووسینی فۆنەتیکی لەلایەن یۆنانەکانەوە نرا ، ئەویش ئەوەبوو ڕێبازی بەکارهێنانی ئەلفوبێیان لە فینیقییەکان وەرگرت . بەڵام ئەمان پیتیان هەر بۆ دەنگە

کۆنسۆنانتەکان دانەنا ، بەڵکو بۆ بزوێنەکانیشیان سازکرد چونکە وەك ئاشکرایە لە زمانی یۆنانیدا ، لە پێکهاتنی ڕەگ و ئافیکسدا تەنیا کۆنسۆنانت بەشداری ناکات ، بەلکو بزوێنیش هەیە . یۆنانەکان هاتن بۆ بەشێك لە دەنگە بزوێنەکانی زمانەکەیان ، وێنەی ئەو دەنگە کۆنسۆنانتە فینیقییانەیان دانا ، کە لە یۆنانیدا نین .

بەم چەشنە ئەلفوبێی یۆنانی بەو دەستکاری کردنەوە ، یەکەم ئەلفوبێیە کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگ سازکرابێ و لە دواییشدا بووە بە بناغەی دانانی ئەلفوبێی لاتینی و سلاڤ و گەلێکی تر[19] . پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کە وەنەبێ پیتەکانی ئەم جۆرە ئەلفوبێیانە بە شێوەیەکی ساکار هەر وێنەی دەنگ بن ، بەڵکو بە شێوەیەکی سەرەکی وێنەی فۆنیمن .

لەسەر بناغەی ئەلفوبێی سامیی کۆن ، نووسینی ئارامی پەیدا بوو ، کە ئەمیش لە ڕۆژهەڵاتەوە تا لای ئوگورو مەغۆل ... گەیشت و لە خوارووشەوە بۆ لای عەرەب و میللەتانی کەنار ئۆقیانووسی ئەتڵەس پەلی هاویشت .

**هەموو ئەو میللەتانەی هاتنە سەر ئاینی ئیسلام : فارس ، تورك ، کورد ، تەتەر ، ئازەر ... ئەلفوبێی عەرەبییان وەرگرت .**

**ڕۆمانەکانیش پاش شەڕو کەوکردنی ئەلفوبێی لاتینی ، توانییان ئەلفوبێیەکی باش و لەبار بۆ نووسینی زمانی خۆیان سازبکەن و ئنجا بە هەموو میللەتانی گرووبی ڕۆمانە ـ جەرمەنییەکان : (فەرەنسەیی ، ئیسپانیایی ، ئیتالیایی ، پرتوگالی ، ئەڵەمانی ، ئینگلیزی ، سویدی ، نەرویجی ، دانمارکی ...)ی بدەن . هەروەها (فینلەندی ، مەجەری ، ئیستۆنی ، لاتیشی ، لیتوڤی ، ئەلبانی و هەندێ میللەتی سلەڤیانی ـ پۆلەندی ، چیکی ، سلۆڤاکی ...)ش ئەلفوبێی لاتینییان وەرگرت .**

**ساڵی 1929** تورکەکان هاتنە سەر بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی . لە یەکێتی سۆڤێتیشدا ئەو میللەتانەی بە ئەلفوبێی عەرەبی دەیاننووسی ، وەك تورك و ئێرانییەکان و هەندێ میللەتانی قەفقاس لە ساڵانی بیستدا نووسینیان کرا بە لاتینی .

ئەلفوبێیەکی زۆر دێرین ، کە بە تەواوی چۆنیەتی پەیدابوونی ئاشکرا نییە ، ئەو نووسینەیە کە ئەرمەن و گورج بەکاری دێنن ... لە سەدەی چوارەمی زاینیشدا قەشە (ڤۆلڤیل) ئەلفوبێیەکی بۆ ئەڵەمانەکان سازکرد ، کە لەسەر بناغەی نووسینی یۆنانی و ڕوونی پێکی هێنابوو .

نووسینی ئەمڕۆ کەڵك لە هەموو ئەو شێوازانەی نووسین وەردەگرێ کە لە درێژایی مێژوودا بەکار هاتوون .

پیکتۆگرافی لە هەندێ بواردا کەڵکی لێ وەردەگیرێ ، بە نموونە بۆ یاریدەی کەسانی نەخوێندەوار یان کۆلکە خوێندەوار ، وەك وێنەی پیاو یان ژن لەسەر دەرگای ئاودەست ؛ لە کتێبی پۆلە سەرەتاییەکاندا کە منداڵ بەر لەوەی وشەکە بخوێنێتەوە تەماشای وێنەکەی دەکات ... یاخود وێنەی سەر جامخانەو کەبابخانەو چێشتخانەو زەنگی بەردەرگای میوانخانە بۆ یەکێك لە ولاتێکی بێگانەبێ و زمانی ئەو ولاتە نەزانێ .

ئیدیۆگرافی (وێنەیی و هیرۆگلیفی) لەگەڵ لێ بواردا بەکار دێنرێ ، بەوێنە لە مەودای هاتوچۆدا وێنەی (خاچ) نیشانە لێکدانی دوو شەمامە ... لە پزیشکیدا وێنەی مارێك و پیاڵەیەك ژار ڕەمزی پزیشکییە لە دەرمانخانە ... لە کارەبادا نیگاری کەللەسەرو ئێسك نیشانەی قووەت زۆری و مەترسی مەرگە ... وێنەی ژمارەکان ، نیشانەی هەمەچەشنەی کیمیاو فیزیاو ماتماتیك و جەبر ... دەچنە ڕیزی هیرۆگلیفەوە .

**پێویستی زانست بە ئیدیۆگرافی لەوەدایە :** 1 ـ بناغەی شت بەتەواوی ڕوون بکاتەوە . بەوێنە کە لە کیمیادا $H_2O$ کراوە بە نیشاندی ئاو ، مەبەست ئەوەیە ئاو بە ساکاری نیشان نەدرێ ، بەڵکو مانا کیمیاوییەکەی دەربڕدرێ ؛ 2 ـ کورت و پوخت مەبەست دەربڕین ، بۆ نموونە ئەگەر لە بریتی



نمونە (4)

ئەو هیرۆگلیفەی کراوەتە ڕەمزی ئاو ، بەنووسین بنووسرێ زۆری دەوێ ؛ 3 ـ نووسین قالبێکی جیهانیی پێ بدرێ . بەوێنە لەبەر ئەوەی هیرۆگلیف بە زمانێکی دیاریکراوەوە بەند نییە ، پزیشك و ئەندازیار ... دەتوانن کەڵك لەگشت ئەدەبیاتێکی مەیدانی زانستەکەی خۆیان وەربگرن ، بەهەر زمانێك نووسرابێ[20] .

هەرچەندە نووسینی سەرەکی و باوی ئەمڕۆ نووسینی فۆنەتیکی یە ، کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگەکان سازبووە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شێوازی دی تێکەڵ بووە . بە وێنە لە نووسینی ڕووسیدا لەگەڵ بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی فۆنێم ، هەروەها بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی بڕگەش لە ناواندایە .

باشترین ئەلفوبێ کە لەسەر بناغەی فۆنەتیك دانرابێ ، ئەوەیە ، کە ژمارەی پیتەکانی هێندەی ژمارەی فۆنێمەکانی ئەو زمانە بێ[21] .

**لەبەر ئەوەی نووسین بە دەورێکی مێژوویی درێژدا تێپەڕیوەو گەلێك پاشماوەی کۆنی تێدا ماوە ، ئەلفوبێی کامل نییە . ئەلفوبێی هەرە ناسراوو پتر بەکارهێنراوو لەبار ئەلفوبێی لاتینییە . هەرچەندە ئەو ئەلفوبێیە لەگەڵ فۆنەتیکی زمانی لاتینیدا باش دەگونجا ، بەلام پڕ بەپڕی زمانە ئەوروپاییەکانیتر نەبوو ، چونکە ئەو (24)** پیتەی بۆ زمانی لاتینی دانرابوون[22] ، بەشی ئەو زمانە ئەوروپاییە نوێیانەی نەدەکرد کە پێویستیان بە (36 — 40) پیت بوو بە پێنج پیتی بزوێنی (a ,e ,o ,u ,i)و دواتریش (y) نەدەتوانرا ئەو هەموو بزوێنانەی لە زمانی فەرەنسیو ئینگلیزیو زمانە ئەوروپاییەکانی دیدا هەن دەربڕدرێن . یاخود ژمارەیەك دەنگی کۆنسۆنانتی ئەوتۆ لە هەندێ زمانی ئەوروپاییدا هەن کە لە لاتینیدا نەبوونو پێویستیان بە نیشانە بوو ... جا بۆ پڕکردنەوەی ئەو ناتەواوییانە ـ واتە لە دانانی پیت بۆ ئەو دەنگانەی لە لاتینیدا نەبوون ـ هەوڵی هەمەجۆر درا ، وەك : دانانی چوکڵە لەسەر یان لە ژێر ؛ گەیاندنەوەیەکی هەردوو سەری پیتێك ، لێکدانی دوو پیت ... تاد .

ئەگەر ئەلفوبێ لەسەر بناغەی یەکسانی لە نێوان ژمارەی پیتو ژمارەی فۆنێمدا دابمەزرایە ، ئەوسا کێشەی ڕێنووس نیوەی نەدەما . لەبەر ئەوەی ئەلفوبێی کامل نییەو **تێپەڕینی بە دەوری مێژوویی درێژدا کێشەی بۆ سازکردووە ، بۆیە ڕێنووس ـ (Orthographia)[23] پێویستی بە دەستوورە . هەرچەندە ڕێنووسی هەر زمانێك بگری بنەمای جۆربەجۆری تێدایەو چەند بنەمایەکیشی بوونەتە سەرەکی . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە سازبوونی ڕێنووسدا بنەمای گشتی هەنو پێویستە پەیڕەوی بکرێن .**

## پەراوێزەکان :

(1) پ .ن . گۆلۆڤین ، سەرەتاییکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، 1978 ، ل 236 .

(2) ف .ئی . کۆدۆخۆف ، سەرەتاییکی زمانناسی ، مۆسکۆ ، 1979 ، ل 156 .

(3) بێگومان ، ئەگەر تەلەفوونو ڕادیۆو هەندێ وەسیلەی دی تەکنیکی لە ئەزەر نەگرین .

(4) ئا .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، 1967 ، ل 348 .

(5) هەمان سەرچاوە ، ل 349 .

(6) یەکێکن لە خێڵە هیندییەکانی خوارووی ئەمەریکا .

(7) سەرچاوەی ناوبراو ، ف . ئی . کۆدۆخۆف ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 157 .

(8) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 349 — 350 .

(9) پیکتۆگرافی ـ Pictography لە دوو وشەی (Pictus ـ جوان ، قەشەنگ)ی لاتینیو (grapho ـ دەنووسم)ی یۆنانی پێکهاتووە . بەم جۆرە وشەی پیکتۆگرافی بە مانای ـ جوان نووسین ـ دێت .

(10) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 351 — 353 .

(11) ئیدیۆگرافی ـ Ideography لە دوو وشەی (idea ـ بیر)و (grapho ـ دەنووسم)ی یۆنانییەوە سازبوە .

(12) هیرۆگلیف لە وشەی (Hieroglyphoi)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، کە بەواتای (نووسینە پیرۆزەکان) دێت . دەقی تەواویشی (نەقشی ڕەبەنەکان)ە . بۆیەش بە (نەقشی ڕەبەنەکان) ناونراوە ، چونکە ڕەبەنەکان : 1 ـ نەیان دەنووسی ، بەڵکو لەسەر ئێسقانو شتیتر نەقشیان دەکرد ؛ 2 ـ ئەوان نهێنییەکانی نووسینی هیرۆگیفییان دەزانی .

(13) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 357 .

(14) ف .ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ، چاپی یەکەم ، مۆسکۆ ، 1961 ، ل 62 — 63 .

(15) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 359 .

(16) هەمان سەرچاوە ، ل 360 .

(17) ئۆ .س . ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، 1966 ، ل 324 .

(18) سەرچاوەی ناوبراو ، ف .ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ل 93 .

(19) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی .ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، ل 362 — 363 .

(20) هەمان سەرچاوە ، ل 366 — 367 .

(21) هەمان سەرچاوە ، ل 367 .

(22) دواتربوو بە (26) پیت .

(23) (Orthographia) لە دوو وشەی (orthos ـ ڕاست)و (grapho ـ دەنووسم)ەوە پەیدابووە ، کە لە کوردیدا واتای (ڕاست نووسی) دەگرێتەوە .

● غفور میرزا کریم ●

# دوو هەڵوێستی گرنگ لە بواری تێکۆشانی ناو ئەنجومەنی نوێنەراندا

... هەوڵ و خەباتی رۆشنبیرانی کورد بۆ بناغەدانانی دەزگاو کۆڕو کۆمەڵی رۆشنبیری تازە داهاتوو بۆ بەرەو هەورازبردنی کاروانی زانستی بەرفراوانی خوێندەواری و پەرەپێدان و خۆش‌کردنی ئاگری جوڵانەوەی رۆشنبیری هیچ کاتێ رانەوەستاوەو سستی نەنواندووە .

لە ساڵەکانی بیست و بەرەو ژووورتر بە تایبەتی لە ساڵی 1928دا کاتێ کە جوڵانەوەی نیشتمانی کورد لەباروو دۆخێکی کوێری ناهەمواردا ئەژیاو بەدەست پیلان و نەخشە بۆگەنەکانی بەڵێن و پەیمانە پفەڵدراوەکانی ئینگلیزەکانەوە ئەتلایەوەو ئەیناڵاند ، لەو رۆژەدا کە هێشتا کێشەی کوردو چارەنووسی دواڕۆژی بەتەپو دووکەڵی نائومێدی و بەدبەختی تەنرابوو ، دەستەیە لە رۆشنبیرانی کورد بەنیازو مەبەستی خزمەت‌کردنی کاروانی رۆشنبیری و دردان بەشەوە زەنگی دواکەوتن و پێش‌خستنی وولات ؛ مەیدانی هاوکاریان لەگەڵ دەزگای میریدا گرتەبەرو بەپێی توانا ئەرکی گەورەیان لەم دەزگایەدا گرتە ئەستۆو بونە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەراندا . وەکو لە رۆژنامەی «ژیان»دا بە–بەرچاوو دەرئەکەوێ کە زۆربەی نوێنەرەکانی کورد لەدەوری پێشوی ئەنجوومەنی نوێنەراندا لە مەیدانی خزمەت‌کردنی گەلدا سەرکەوتنیان بەدی نەهێناوە نەبونەتە جێگای ئومێدو رەزامەندی کۆمەڵانی خەڵکی ، بۆیە رۆژنامەی ژیان سەرزەنشتیان ئەکا بەپێچەوانەوە بەدڵ و بەگیان بەشان و باڵی نوێنەرانی هەڵبژێراوی ساڵی 1928دا هەڵئەداو وای پیشان‌ئەدا کە ئەم نوینەرانە بەرەزاو دڵ و بۆ خزمەت‌کردنی گەل هاتونەتە مەیدانی خەباتی نوێنەرانیەوە .

بەراستی ئەگەر بروانینە ناوی هەریەکە لەم نوێنەرانە بۆمان دەرئەکەوێ کە هەریەکە لەمانە لەکۆمەڵدا بەرەنگ و شێوەیەکی تایبەتی پایەی زانین و گەورەیی وەرگرتووەو لەبوارو مەیدانی دیاری‌کراوی خۆیدا گرەوی سەرکەوتنی بەرزیان بردۆتەوەو ناویان بەشاسوارو مەزن دەرچووە . مامۆستا ئەمین زەکی بەگ (بێگباشی ئەرکانی حرب لە زەمانی عوسمانی‌داو مدیری مەکتەبی حربی‌یەو دار التدریبی عسکری لە حکومەتی عیراق‌دا) لەوکاتەدا لەناو کۆمەڵگای کوردیدا ناوی بە شاسوارێکی زاناو رۆشنبیرێکی لێهاتووی کورد دەرکردبوو . هەڵبژاردنی لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکی‌یەوە بە نوێنەر بۆ دەورەی یەکەمی ئەنجومەنی نوێنەران ساڵی (1925)و دەوری پیرۆزی لە ئەنجومەندا بۆ خزمەت‌کردنی گەل و پێش‌خستنی وولات بەزەقی و روونی ئەبینرێ . هەروەها بڵاوکردنەوەی نامە تایبەتیەکەی لە رۆژنامەی (ژیانەوە)دا کەتیایا بەڵێن و پەیمان

ئەدا بەدانیشتوانی کە دریغی نـاکا لە هـەوڵو کۆشش کـردن لەپێناوی خزمەتکردنیـاندا . هـەروەها دەرکـردنی نامیلکـە خنجیلانەکەی بەنـاوی (محاسبـەی نیابـەتەوە) کـە هەوڵو کۆششی خۆی تیایا بۆ خزمەتکردنی پیشـان ئەدا ، ئـەمانـە گشتی بەڵگە نەویستە بۆ دڵسۆزیو خزمەتکـردنی لەپێناوی رۆشنبیری‌ی کوردیدا . لەبەر ئەوەی ماموستا ئەمین زەکی بەگ لەوکاتەدا بەتواناترو پایە بڵندترو پشت ئەستوور تر بەخۆو لە هاوڕێکانی تری وە لەگەڵ بارودوخەکەدا زیاتر ئەگونجا ، بۆیە دەزگای میری پـاش هەڵبـژاردنی بە نـوێنەر لە سـاڵی 1925دا دەستوبرد فـەرمانی بـۆ دەرکرا کـەببیّ بە وەزیـری اشغالو مواصلات تا لەم کاتەدا بەتەنها خۆی دوو راپۆرتی دەربارەی باروودۆخی نەگونجاوی زانستیو خوێندەواری لە کوردستاندا نـووسیو ریّوشـوێن دانـانی گـونجـاوی پـر بـەپێستی بـۆ چـارەسەردنی پێشکـەشی ئەنجـومەنی نـوێنـەران کـرد کـە بەداخەوە دەقەکەیمـان تا ئێستـا دەست نەکـەوتوە ، بـەڵام بەکورتی رۆژنامەی (ژیان) ژمارەی 118 کە لە 21 حزیرانی 1928دا دەرچووە ، بڵاوی کردۆتەوە کەوا ئێمەش لە خوارەوە دەقی ئەو کورتە راپۆرتە پێشکەش بە خوێندەواران ئەکەین .

«خوڵاصەی دوو تقریری مبعوثی محترم سلێمانی معالی امین زەکی بەگ کە تقدیمی مجلسی عالی مبعوثـانی کردووە لە خصـوصی معارف کـوردستانو تشکیـل لجنەیـەکی علمی بۆ تألیفو ترجمەی کتێبی تدریسیەی کوردیو احـداثو تشکیل مـدیریـەتێکی معارفو تعیـین مفتشین کـورد بـۆ منـطقـەی کوردەکان :

**خلاصەی تقریری اول :**

«لە لوای مـوصـل ، هـەولێر ، کـرکـوك ، سلێمـانیدا حال‌حاضر 38 مکتبی کوردی تیاموجودە ، لە مکاتب ابتدائي ، ثانوی کوردەکانا لەسەر منهاج رسمی معارف بۆ پنجاو هشت موضوع کە مجبورن تدریس‌بکەن ، تنها بۆ دەرسێکیان کتێبی کوردی هەیە ، بۆ موضوعەکانی کە چونکە کتێب نی‌یە طلبەکان مجبورن نوط بکرنو لەسەر ئەو نوطانە محکومی سعی‌کردنن . لکن لە صنفی اولیەکاندا چونکە طلبەکانی بەتەواوی ناتـواتن بنـوسن ممکنیان نـابیّ نـوطێکی صحیـح‌بکـرن وە لە خـارج امکـانیاتیـاندایـە ، لەغـیر ئـەوەی کـە بـە غلط وە بـە عجلە دەفترەکانیان رەشو پربکنەوە ، ناتوانن سعێکی‌تر بکـەن لبر ئەمە ذهنیان بە معلومات غیر صحیحە اشغالو ماندو اکریّ . هیچ وجدانێـك قبوڵی نـاکا ئـەم طلبانـە کە امیّـدی استقبالی کوردەکانن بە معلوماتی غیر صحیحە زهن وە دەماغیان مشوش وە زهراوی بکریّ مجبورن ئەم مکتبانەی کە کراونەتەوە بیکەن بە مؤسسەیەکی معرفتو بوسانطیکی تدریسیەکی چاك مادتاً ومعنا لەبر ئەمە استـرحام ئـەکەم بـۆ ئەوەی دەست بـەجیّ دەست‌بکەن بە ترجمەو تـألیف بە عجلە (لجنـەیەکی دائمی) تشکیـلوە لە کوردە منـورە مقتدرەکـانی ایـرە اعضـای بـۆ تعیین‌بکەن .

**خلاصەی تقریری دوم :**

أو مکتبانەی کە لە لوای سلیمانی ، کرکوك ، هـەولێر ، مـوجودن قسمێکیـان لە طرف مدیـریتی منطقـەی مـوصـلو قسمێکیان لە طرف مدیریتی منطقەی بغدادەوە ادارە ئەکرێن ، لەبەر ئەمە کە مدیری هردو منطقەکان کوردی نازانو عـادتاً بیگانن بم لسانە ناتوانن تفتیشو مراقبەی مکتبەکـان بکەنو لەقوەت تدریسیەی معلمەکان تی‌ناگەنو بەتواوی عاجـزن کە اصلاحی طرزی جریان اصول تدریسیەی مکتبەکان بکـەن . لەبر ئەم وضعیەتە چونکە مکتبە کوردەکان لە مراقبەو نظارتێکی متمادی محرومنو نتیجە بوە بە سببی عدم ترقیو تکاملیان لەبر اوە طلب اکەم أو مدیریتی منطقەی کە دو 3 ساڵ لەوەپێش بوئەم خصوصە هەبوو بە عجلە احداثو اعادەی بفرمونەوە وەمکاتب سلیمانی ، کرکوك ، هولێر ربط ئەم مدیریتە بکەنو مـدیریکی کوردی بۆ تعیین بفرمون .

**وەلەعینی زماندا بو او شازدە مکتبە کوردی کە لە لوای موصلدا هیە بۆ تفتیشو مراقب‌یان مفتشین کوردی مقتدر استخدامو علاوی قادوری مدیریتی منطقەی موصل بکنو محقق لێم معلومە کە مجلس عالیتان ابیّ بە ظهیر ام طلب وامیدم ترویج بفرمون .**

ئەمرۆ کە روشنبیرانی کورد پاش زیاتر لە نیو سەدە ئەم دوو یادداشتەی ماموستا ئەمین زەکی بگ ئەخوێننەوەو بەچاوی مێـژوویی‌و لەرووی گرنگی‌و بـۆ چوونی بـۆ خزمـەتکـردنی جولانەوەی روشنبیری هەلی ئەسەنگێنن بۆ یان دەرئەکەوێ کە ماموستا ئەمین زەکی بگ زۆر بە وەستایی‌و کارامەیی‌یەوە بۆ شیـرازە دانانی بنـاغەی دەزگـایەکی تـایبەتی بـۆ زانستی‌و خوێندەواری‌و پەرەپێدانی جوولانەوەی رۆشنبیری‌ی کوردی لە

کوردستاندا هنگاوی ناوه . بە مانایەکی تر هێنانەدی دەزگایەکی تایبەتی لە کوردستاندا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری زانستی‌و خوێندەواری ، دانانی لیژنەیەکی تایبەتی لە رۆشنبیرانی کورد بۆ دانانی کتێب‌و وەرگێڕانی کتێب بۆ کوردی‌و خوێندنی قوتابیانی کورد بە زمانی زگماکی خۆیان‌و دابینکردنی هەموو پێویستەکانی قوتابخانەکان ئەم ئاوات‌و ئامانجانە بەتێکڕایی لەم دوو یادداشتەدا بەروونی ئەبینرێ‌و رەنگ ئەداتەوە . لەپاش پێشکەش‌کردنی ئەم دوو یادداشتەی ماموستا ئەمین زەکی بەگ نۆ لە نوێنەرە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق کە بریتی بوون لە نوێنەرانی سلێمانی‌و کرکوك‌و هەولێر پاش یەکتری بینین‌و گفتوگۆو دانیشتنی لەگەڵ یەکتردا ، لەسەر دەقی نووسینی ئەم راپۆرتە مێژوییە گرنگەی خوارەوە رێکەوتن وە بەناوی هەموویانەوە لە (1)حوزیرانی 1928دا پێشکەشیان‌کرد بە وەزیری معارف :

«صورت‌و ترجمەی تقریرێکی مبعوثە محترمەکانی کوردە کە لەخصوصی معارفەوە داویانە بە وزارەتی معارف :

**بۆ وەزارەتی جلیلەی معارف**

لەفخامتتانەوە معلومە کە جهت شمال لەخصوصی علاقات سیاسی‌و اقتصادی‌و لەناو حکومەتە گنجە تازەپێگەیشتوەکانا ئەهمیەتێکی گورەی هەیە . لبر امە لازمە ازالەی همو موانعیك بکرێ لەخصوصی نشری معارف‌وە و او شتانەی کە جهل لا أبات پێویستە اکمال‌بکرێ .

چونکە لەمنطقەی شمالا معارف زۆر سست ارواو زۆر دواکوتوە لازمە بۆئەوەی بە درجەی مطلوبە بگەیەنرێ معاونتی بکرێ بە نوعێك مساوی‌بێ بە منطقەکانی تری عراق .

**او اسبابانەی کە معارف ام منطقەیەی دواخستوە امانەن :**

1 ـ نەبونی کتێبانی ترجمەکراو بە کوردی کە لسانی تدریسیەی او منطقەیەو عبارتە لە چند لواو قضایکی مهم .

2 ـ کمیەتی مُعلم لەو منطقەدا .

3 ـ بو اوەی ارشادو مراقبەیکی تواوی معلمەکان‌و مکتب بکاو ترقی‌و تعممی معارف بکاو لسر یك ری یك پروگرام تدریس‌یان پێ‌بکات بۆ ام منطقەیە مدیریکی معارف نیە .

4 ـ لم منطقەیەدا مکتبێکی تکملی ثانوی نیە کە ببێ بە کفیل‌و بواسطەی تواوکردنی او علمانەی کە طلبەکان لە مکاتب ابتدائیەدا خوێندویانەو بۆ اوە کە لەوێدا لزت لە خوێندن وەرگرن‌و علمێك چاك فێری طلبەکان بکرێت بە نوعێك کە بتوانن بچنە مکاتب عالیەوە .

5 ـ ام منطقەیە محرومە لە مکتبێکی دار المعلمین کە موجودین الزامەو بکاتە واسطەیە بو اوەی معلم مقتدرو عالم پێ‌بگەیەنێ کەبتوانن چاك بەکوردی تدریس‌بکەن .

6 ـ لبر فقیری اهالی او منطقەیە ناتوانن‌و ممکنیان نابێ اولادەکانیان بۆ اکمال تحصیل ثانوی‌و عالی بنێرن بۆ مرکزی حکومت .

7 ـ زۆر اسبابی تر هیە کە بوە بە سببی اوە کە ابوینەکان اهنمام ناکن بۆ اوەی اولادەکانیان بنێرنە مکتب . او رێیەی کە لازمە لەخصوصی نشری معارفەوە تبعیتی بکرێ اوەیە کە او نقصانیەتەی لەخصوصی معارفەوە هیەو ذهنی اشغال کردوە کە اهتمام بە معارف ناکن لازمە لابرێ کە امانەن .

1 ـ تشکیل (لجنەیەکی ترجمەو تألیف) کە اعضاکانی لە عالم‌و منور منتخبەکانی کوردەکان بێ کە وفق پروگرام معارف کتب تألیف‌و ترجمە بکەن واعتقادمان وایە کە ئەم لجنەیە نسبەکانیان زۆر چاك‌و بەتواوی بەجێ‌ئەهێنن . وەزارتی معارف بۆ ئەم خصوصە معارفیکی زۆر ئەبێ‌و اگەر وزارتی معارف لەحال حاضرادا معذور بو لەتشکیل‌کردنی ام لجنەیە کە زۆر پێویستە بەلابردنی تذبذب ، هیچ نەبێ رجا اکین رسماً اعلانی بکات کە او کسانە موافق پروگرام معارف کتێب‌یك ترجمە یا تألیف لکن بەنسبە چاکی کتبەکانەوە اکرامیەیکی ادرێتێ کە اقلاً لە (500) روپیە کمتر نەبێ‌و اگر ام مسئلەیە ترك‌بکرێ بۆتثبت شخصی جوان نابێ ، چونکە امە لە حالێکا اکرێ کە لەناویانا علم مترقی بێ‌و قدر معارف بزانن‌و اگەر معارف ام مسئلەیە بۆ تثبت شخصی ترك بکات باور ناکین هیچ کسیك لەخۆیەوە ئەم خرمتە بکا چونکە بۆخۆی انتفاعێکی مادی‌و ضروری تیا نابێ .

2 ـ بۆ اوەی معلمی مقتدرو عالم بو صنفە ثانویەکان چنگ بکەوێ ، لازمە وزارتی معارف لەخصوصی زیادی

معاشه‌وه اهتمام بكات چونكه اعتمادمان هه‌یه كه پیاوی زۆر مقتدرو عالم هیه له‌ولاتمانا فقط لبر معاش كه‌می انتساب به معارف ناكن .

3 ـ لازمه دائریكی معارف له‌م منطقه‌یه‌دا تشكیل بكریٚ به شرطێك مركزه‌كه‌ی له‌وسطی ئه‌م منطقه‌یه‌دا ابیٚ كه بتوانیٚ مراقبه‌ی همو مكتبه‌كان بكات و لازمه مدیریكی وای بۆ تعین بكریٚ كه له مدارس عالیه ده‌رچوبیٚ كه مقتدری حالت معارف بگه‌ینیٚ به حدیكی مطلوب و بونی ئه‌م دائریه‌ش ضروریه بۆ نشر علم و معرفت و حكومت له تشكیل كردنی ام دائریه مصرفێكی زۆری نابیٚ به‌نسبت ایستاوه كه بۆ تفتیش و مراقبه لواء سلێمانی و كركوكی داوه به بغدادو هولێرو اقضیه‌كانی شمال وه‌كو زاخۆ ، دهۆك ، عمادیه ، عقره‌ی داوه به موصل ، جا هه‌م له‌خصوصی معارفه‌وه هم له‌خصوصی تدریساته‌وه خراپه چونكه تابعی منطقه‌یه‌ك نین تدریسیان وه‌كویك نابیٚ و غیر امیش چونكه مفتشین و مدیرین ام منطقانه كوردی نازانن هیچ فائده‌یكیان لیٚ حاصل نابیٚ .

4 ـ اكمال و تنظیم مكاتب ثانوی به‌صورتێكی وا كه حسب المطلوب تكفل تربیه‌ی طلبه‌كان بكاو احتیاجاتیان دفع بكا . اما له‌خصوصی او معذوره‌وه كه طلبه‌كان چونكه به عربی ناخوێنن له مكاتب عالیه‌دا مشكلات اكیشن امیش راست نیه چونكه ام معذوره‌یه زیادكردنی اوقات تدریسیه‌ی درس عربی له‌صنفه ثانویه‌كاندا لائچێت .

5 ـ كردنه‌وه‌ی مكتبێكی دار المعلمین بۆ اوه‌ی احضار معلم مقتدر چاك بكا كه بتوانن له‌سر اصول تازه‌و موافق مطلوب طلبه‌كان پیٚ بگه‌ینێت .

6 ـ كردنه‌وه‌ی مكاتب كچان .

7 ـ هر وقتێك مكتبه‌كان و معارف ام منطقه‌یه به‌م نوعه كه عرضمان كرد تنظیم كرا أو وقته ابوێیه‌كان شوقیان ابیٚ كه منداله‌كانیان بنێرنه مكتب بۆ تحصیل .

انجا استرحام له وزارتی معارف اكین كه اهتمامێكی كافی و تواو به‌م معروضاتانمان بكات و لم ساله‌وه ده‌ست بكا بم اصلاحاته مطلوبه و قطعی به ازاله‌ی همو موانعێك بكات كه ابیٚ به‌سه‌به‌بی عدم ترقی معارف ام منطقه‌یه‌و ایمه‌ش پێشه‌كی تشكری اكین .

### نوێنه‌ره‌كان

| | |
|---|---|
| معروف چیاووك | نائب اربیل |
| اسماعیل رواندوزی | نائب اربیل |
| محمد صالح | نائب سلێمانی |
| محمد جاف | نائب كركوك |
| صبری | نائب سلێمانی |
| عبدالله مفتی | نائب اربیل |
| جمال بابان | نائب اربیل |
| سیف الله | نائب سلێمانی |
| محمد سعید | نائب كركوك |

بۆ اوه‌ی مغالبن و اقتداری مبعوثه محترمه‌كانمان له‌ملت بگه‌ینن او عزم و تشبثانه‌ی كه بم مدته كمه له‌خصوصی معارف ولاته‌كه‌مانه‌وه كردویانه عرض قارئین كرام كرا .

همو ایزانین كه مبعوث محترم و خوشه‌ویستمان معالی امین زكی بگ له دوری پێشودا بۆ ترقی و تعالی وطن و ملته‌كه چند سعی فرموو چند تیٚ كۆشا حقیقتاً به واسطه‌ی فوق العادەیه وه ملت زۆر انتفاع وركرت و گلیٚ اسبابی ترقی و لم دوریه‌دا چونكه مبعوثه‌كانی تریشمان همو مقتدرو مغالن له ایستاوه سعی خۆیان پیشان داین ، ایتر به سبب فعالیت و عزم ملت بروراپانه‌وه رۆژ به رۆژ برەو ترقی رۆین و استرحام اكین بۆ خاطری قطعی موفقیت تامین بكریٚ تشریكی مساعی بكه‌ن و دست له‌ناو دست یكتری بۆ به‌جیٚ هێنانی همو املیكی ملته كه بذل مساعی و همت بفرمون ، چونكه له‌م عصردا همو شتێك به یه‌ك بونی افكارو به توحیدی مساعی یه‌وه پێك دێت ، ئیتر دائما تمنای موفقیت و انتظاری مساعی حسنه‌یان اكین خوا توفیقیان بدات .

جا چونكه له‌كاتی خۆی‌دا كۆمه‌لانی خه‌لكی كوردستان به هه‌لبژاردنی ئه‌م ده‌سته نوێنه‌ره دلشادو پیٚ خۆشحال بوون ، خونچه‌ی هیواو ئومێدیان پیٚ كرایه‌وه چاوه‌نواری ئه‌ركی نیشتمانی و فه‌رمانی مه‌زنتان لیٚ ئه‌كردن وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه له جێگای خوی‌دا به پیویستی سه‌ر شانی خۆیان هه‌لسان و ئه‌م یادداشته‌یان پێشكه‌ش كرد ، بۆیه ئێمه‌ش به راستی ئه‌زانین كه كورته‌یه‌ك له‌ژیانی هه‌ر یه‌كه‌یان و پایه‌ی كومه‌لایه‌تی و پله‌ی

زانستی و دەوریـان لەخزمـەتی گەلدا بخـەینـە بـەرچـاوی خوێندەواران . دیارە لە جێگای خۆیدایە بڵێین کە سەرچاوەی زانینمان دەربارەیان رۆژنامەی (ژیان)ە چونکە ژیان بەهـۆی هەڵبژاردنییـانەوە بـە نوێنـەر سەرگـوزەشتەی ژیـانییانی بڵاوکردەوەو بایەخی نیشتمانیی و رۆشنبیریدا بەدەوریان .

1 ـ مارف ئەفندی چیاووك

مارف ئەفندی کوڕی علي اصغر ئەفندییە ، نازناوی بە چیـاووك لەناو کـۆمەڵانی خـەڵکیدا دەرچوە ، رۆشنبیـرێکی بەتوانای کوردە لە کۆلیجی حقوق لە ئەستمبوڵ بروانامـەی حقـوقی وەرگرتـوە ، لەبنەچـەدا بۆ هـۆزی باڵك و بنـەماڵەی چیاووك ناوچەی رەواندوز ئەگەڕێتـەوە . پاش دامـەزراندنی حکومەتی عیراق چیاووك بوو بە حاکم و لەم ڕێگەیەوە کەوتـە خزمەتکردنی گەلەکەی . زۆر نووسینی بە نرخ و کتێبی نایابی هەیەو داناوە بە کوردێکی دڵسۆز ناسراوە .

2 ـ اسماعیل بەگی رەواندوزی :

اسماعیل بەگ بۆ نەوەی محمد پاشای کوڕی سعید بەگی عبدالله پاشا ئەگەڕێتەوە . باپیری وەختێ کە وەکیلی متصرفی سلێمـانی ئەبێ بـۆ کۆمـەڵانی خەڵکی سلێمـانی بەتێکـڕایی خزمەتێکی کوردایەتی بێهـاوتای کـردوە . خۆشی لە دەوری پێشووی ئەنجومەنی نوێنەراندا چ بەقسەکردن لە ئەنجومەندا بێ یا بە نـووسین لە رۆژنـامەکـاندا بـۆ گەل و وڵات درێغی نەکردوە . بۆیە لە هەموو روویەکەوە جێگای شانازی و مایەی بەرزی گەل و وڵاتە .

3 ـ **محمد صالح بەگی محمد علي بەگ** :

حمـە صالح کـە بە رۆشنبیـرو دنیا دیـدە ناسـراوە لە بنەچەدا بۆ بنەماڵەیەکی کـۆنی سلێمانی ئـەگەڕێتـەوە ، ئەم بنەماڵەیەی کە لە خزمەتکردنی وڵاتدا ناویـان دەرچووە . ناوبراو لە دەورەی پێشووی (1925)ی ئەنجومەنی نوێنەرانـدا لەگەڵ مامۆستا ئەمین زەکی بگدا لە خزمەتکردن بۆ گەل هیچ درێغیەکی نەکردوە .

4 ـ **محمد بگ فتاح بگ جاف** :

حمە بگ جاف یەکێکە لەسەرۆکەکانی عشرەتی جاف ... گەنجێکی خوێنـدەوارو لێهاتـوی کوردە .. عشـرەتی جاف و نەوەکانی وەکو عشرەتێکی گەورەو بەناوبانگی کورد لە مێژوودا ناوی دێ ... ناوبراو خزمەتی بۆ کورد ئاشکرایە خـۆی کە لە مجلس تأسیسی عیراقدا نوێنەر بووە لەسەر شاری سلێمانی تواناو خزمەتی بۆ گەل دیاربووە .

5 ـ **صبری بگ حاجی علي ئاغا** :

صبری بگ بە خوێندەوارێکی کورد ناوی دەرکردوە . لە بنەچەدا بۆ بنەمـاڵەیەکی کـۆنی سلێمانی ئـەگەڕێتـەوە . لە کۆلیجی حقوق بروانامەی وەرگرتوە . یارمەتیدانی و کۆمـەك کردنی صبری بگ بۆ قوتابخـانەکـانی سلێمانی و پشتگـرتنی کـۆمەڵی زانستی بـە نمـوونـەی خـزمـەتکـردنی لەپێنـاوی رۆشنبیری و گەلدا دائەنرێ .

6 ـ **عبدالله ئەفندی مفتی** :

عبدالله ئەفندی کوڕی عبدالرحمن ئەفندی مفتییە . لە قوتابخانەی علمیەدا پێگەیشتوەو لای مامۆستای گـەورە ملا ئەفندی قوتابی بـووە ، ماوەیـەك ئەرکی مفتییـەتی گرتـوتە ئەستۆ ، ماوەیەکی تریش سەرۆکی شارەوانی هەولێر بـووە . ناوی بە دنیادیدەو زاناو دانا لەناو کۆمەڵانی خەڵکی هەولێردا دەرچووە .. لە هەموو روویەکەوە لە خزمـەتکردنی بـۆ گەل درێغی نەکردوە .

7 ـ **جمال بابان** :

جمال بابان بۆ بنەماڵەی بەناوبانگی بابان ئەگەڕێتەوە ، لەکوردستاندا ناوی بەخوێندەوارو رۆشنبیـرو کوردپـەروەر دەرچووە . لە کۆلیجی حقوق دەرچووە . لە ساڵی 1924دا کراوە بە حاکم .. یەکێك بوو لە دامەزرێنـەرانی کۆمـەڵی زانستیی کوردان . ساڵی 1926 لە سلێمانی . ئیتر پێویست بە پیاهەڵدان ناکا .... لە هەموو روویەکەوە پایەو پلەی بەرزو گەورەیە .

8 ـ **سیف الله بگ** :

سیف الله بگ کوڕی عزت بگ وەزیری داخلیەی دەوڵەتی عوسمانی و برازای سعید پاشا ، وە لەسـەرێکی تریشـەوە لە دایکەوە بۆ بنەماڵەی بابان ئەگەڕێتەوە . پیاوێکی رۆشنبیـری کوردە . لە منداڵیەوە لە ئەستمبوڵ و ئەورووپادا ژیاوە . زۆری خوێندوە لەبەر ئەوە گەلی کورد ئومیدی گەورەی پێی هەبووە .

9 ـ **محمد سعید** :

سعید ئەفندی لە خانەدانەکانی کفرییە لە دەرچووانی کـۆلیجی «حقوق»ە . ئـامۆزای متصرفی کرکـوك عمر نـظمی «بگ»ەو لەدەوری پێشووی ئەنجومەنی نوێنەراندا خزمـەتی تایبەتی پێشکەشی کۆمەڵانی خەڵکی کردوە .

بەهات قەرەداغی

# بارودۆخی « هونەری وەرگێڕان » بۆ کوردی

ئەوی ئاشکرایە بزووتنەوەی وەرگێڕانی بەرهەمە ئەدەبی و فەلسەفی و زانیارییەکانی میللەتان بۆسەر زمانی کوردی ، چاکترین نیشانەی خواستو ئارەزووی بەرەوپێش بردن و پڕکردنەوەی گەنجینەی بێنازی کتێبیکوردییە . لەم بوارەدا هەوڵدان بەردەوامە بەلام ئەوی جێی داخە هێشتا ڕێو شوێنێکی زانستیانە بۆئەم ئەرکە پیرۆزە لەلای خۆمان دیاری نەکراوە و زۆربەی هەوڵو تەقەلاکان لەچەندین لایەن و چمکیانەوە لاوازو بێهێزو کاڵوکرچن .

لێرەدا وەك ئەرکێکی سەرشانم ،وای بەپێویست دەزانم کە ، بەرلەوەی دەرکی دادگای ئەدەبی لەهەندێ لەو بەرهەمە وەرگێڕاوانە بگرم ، چەند بنەڕەتییەکی زانستیی هونەری وەرگێڕان بخەمەڕوو . شایانی باسیشە کە بۆ ئەم پێشەکییە کەلکێکی زۆرم لە کتێبی « فن الترجمة في ضوء الدراسات المقارنة » ی دکتور صفاء الخلوصي وەرگرتووە بەهیوای ئەوەی لەم بناغەیەدا بەردێك دابنێم .

## وەرگێڕان چییە ؟!

هونەرێکی بەرز و پیرۆزە ، ئەرکی وەرگێڕاندنی وشەو ماناو شێوەو فۆرمی داڕشتنی گرتۆتە ئەستۆی خۆی ، لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر . ئەمەش لەباروودۆخ و ئاستێکی وادا کە چێژو تامو ئیقاعی دەقە نوسراوەکە ببەخشێ بەخوێنەر »
لێرەوە دەتوانین ئەم سێ بنەڕەتییە دەستنیشان بکەین لەبواری ئەم هونەرەدا : ـ

**١ـ پێویستە پارچە وەرگێڕراوەکە وێنەیەکی ڕوون و تەواوی ئەو بیروڕایانە بێ کە لەناوەڕۆکی دەقە نوسراوەکەدایە .**

**2 ـ پێویستە تائەتوانرێ لە ڕێ وشوێن وشێوەی داڕشتنی دەقەنوسراوەکە لانەدەین .**

**3 ـ پێویستە پارچە وەرگێڕراوەکە لەسەر زمانی خوێنەرو لەگوێی گوێگردا تام وچێژو ئیقاعێکی ئەوتۆی هەبێ کەئەگەر لەهی دەقەنوسراوەکە زیاتر نەبێ کەمتریش نەبێ .**

## وەرگێڕی سەرکەوتوو کێیە ؟ !

ئەو نووسەرەیە کە دۆخو بارێکی ئەوتۆ دەگونجێنێ بۆ خوێنەر تیا ، هەست نەکات بەرهەمێکی بێگانە بەزمانەکەی خۆی دەخوێنێتەوە ، بەجۆرێکی وا کە بەرلە وشەو زاراوە ، هەست وهۆشو سۆزی نووسەرو نوسراوەکە وەربگێڕێ . بەڕاستگۆیی ، بێ سڵکردنەوە ، لەناخەوە ، هەست وهەڵچوون وداچوونەکانی خۆی تێکەڵ بە کەفوکوڵی نووسەرەکە بکات . ئەو چەندژانی لێ هاتووە ئەمیش ئەوەندە ژان بیگرێ .. ئەو چەند ئاسۆی خەیاڵ وئەندێشەی بەربڵاوبووە « کاتی نووسینی بەرهەمەکە » ئەمیش بگاتە ئاست وپلە وپایەی ئەو ، تاوا دەکات پارچە نوسراوەکە جارێکی دی سەرلەنوێ ، بەهەموو جوانکاریەکیوە ، بەزمانی زگماکی خۆی دەنووسێتەوە . ئەوی شیاوی باسە لێرەدا ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو « وەرگێڕ » خۆیگەیاندە ئاستی ویژدان وئەندێشە وبیری نووسەر چیدی پێویستی بەوەنییە بە شێوەیەکی میکانیکی وئەکادیمی پەیڕەوی ئەو بنەڕەتیانە بکات کە لەمەوپێش باسمان لێکردن ، بەڵکو ئەوسا بنەڕەتییەکان خۆیان خودی خۆیان دێننەدی !

وەرگێڕ ئەگەر نەیتوانی « گۆشە تاریك وڕوونەکانی »

ماناو ناوەرۆك وبۆچوونەكانی دەقێكی نوسراو بدۆزێتەوەو دەستنیشانیان بكات ، هەرگیز پێشی ناكرێ «گیانی» ناوەرۆكەكە بگوێزێتەوە بۆناو « لەشی (قالبی) » دەقی وەرگێرراوەكە . بەوپێیە پارچەیەكی وەرگێرراوی لاوازو گێرو بێپێزمان چنگ دەكەوێت ، چونكە ئەگەر بێتو وەرگێر واتێبگات كە ئەركی سەرشانی تەنها ئەوەندەیە كە كۆمەڵێ وتوو وێژ ووشەو زاراوە وڕووداو لەزمانێكی ترەوە بكات بەزمانەكەی خۆی وبەس ئەوا بێ یەكودوو دەست لەناوەرۆكو گیانی دەقەنووسراوەكە بشۆ .. كاتێ كە وتوو وێژو وشەكانی نێو دەقەنوسراوەكە دادەڕێژینە ناوقاڵبی زمانی وەرگێڕەوە «گیانی» ناوەرۆكەكەی بەبائەچێت وبەهەلمئەبێت . جا ئەگەر فریانەكەوین «گیانێكی» نوێی پێ ببەخشینەوە ئەوا دەبێ هەزار ڕەحمەت بۆ گیانی پاكی بەرهەمە وەرگێرراوەكە ڕەوانەبكەین !! وەرگێڕرانێكی وەها زۆرجار لەشان وشكۆو سەنگی نووسەری دەقەكەش كەم دەكاتەوە !

## چەشنەكانی وەرگێڕاندن كامانەن ؟!

سێ ڕێگا هەیە وڕەچاوكراون لە وەرگێڕاندا لەلای گشت میللەتان ، ئەوانەش :

**یەكەم** : وشە بۆ وشە ... یان دێڕ بۆ دێڕ . ئەم ڕێگەیەش زیاتر بەرهەمەكە دووچاری بێپێزی وبێگیانی دەكات ، كارێكی وادەكات ، كە كەمكەس هەبێ ورە بەرنەداو دەس لە خوێندنەوەی دەقەكە هەڵنەگرێ .

**دووەم** : مانا بۆ مانا .. ئەمەش زۆرجار وەرگێڕ تووشی هەڵەیەكی گەورە دەكات كاتێ كە هەندێ وشەو دەربڕینی نێو دەقە نووسراوەكە پشت گوێ دەخاو بایەخێكی تەواوی ناداتێ ، كەڕەنگە هەموو تەوژموو گوڕی بڕگەو بیرۆكەكە (فكرة) بڕژێتە قاڵبی ئەووشەو دەربڕینەوە .. واتە ئەو دەربڕینە پاشگوێ خراوە ، دوایین زرمەی ئیقاعی ئەو كۆپلەیە بێ .

**سێیەم** : ڕێگەیەكی مامناوەندە ، دارەكە لەهیچ سەرێكیەوە ناگرێ و لە ناوەندیەوە دەستی دەداتێ . هەر لەبەرئەوەشە كە لەهەردوو ڕێگەكەی تر سەركەوتووترە . بۆئەم مەبەستەش زۆر گرنگە كە تێبینی چەند خاڵێكی ڕچاوكراو بكرێ ، ئەوانەش :

أ ـ بۆیەكەم جار دەقەكە بخوێنرێتەوە وكورتەی ماناو ناوەڕۆك ومەبەستەكەی ئاشكرابێت .

ب ـ لیستەیەك بەو وشەو زاراوە ودەربڕینانە پڕبكرێتەوە ، كە ، ماناكانیان لەلای وەرگێڕ یەكلایی نەبوونەتەوە وساخ بكرێنەوە .

ج ـ دەقەكە بۆجاری دووەم بخوێنرێتەوە[1] ئەوسا دەستدەكرێ بە وەرگێڕاندنی دەقەكە ، پەرەگراف بە پەرەگراف ولەسەرخۆ وبەوردی ، ئەوجا ئەو بەشانەی كەتەواو دەبن وازیان لێدەهێنرێ تا نەختێ مێشك ر-ـرونی وەرگێڕ دەحەسێتەوە .

د ـ دەست دەكرێ بە توندو تۆڵكردنی باروبارگە ، واتە لەم قۆناغەدا وەرگێڕ دەستكاریەكی چاكی ئەو بەشە دەكات كە تەواوی كردووە ، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەردەقە نوسراوەكە . وەرگێڕی چاك ئەوەیە كە لەم قۆناغەدا هەردەم لەخۆی بپرسێ : ئایا ئەگەر خۆم ئەم دەقەم بنووسیبایە ، بەدارشتنی ئەم بڕگەیە یان بەشێوەی ئەم دایلۆگەو بە دانانی ئەم وشەیە لەم جێیەدا ، ڕازی دەبووم ئایا هەر بەهەمان شێوە ئەم دەربڕینەم دەهێنایە كایەوە ئەگەرهاتوو وەڵام بە ـ نەء ـ بوو ئەوا پێویستە سەرلەنوێ دەستكاریكی چاكی ئەو بەشانە بكرێت تا ئەوساتەی وەرگێڕ خۆی بەتەواوی لێی ڕازیدەبێ و بە بەرهەمێكی شەوژان وبیركردنەوە وئەندێشەی خۆیی دەزانێ . ئەمە وادەكات كە وەرگێڕ تا ئەوساتەی ئەوئاواتەی دێتەدی ، خۆی ڕەخنەگرێكی دڵڕەق بێ بەسەرخۆیەوە .

هـ ـ لە دواقۆناغدا ، دەقەنووسراوەكە و پارچە وەگێڕاوەكە دەخرێنە دووتای تەرازوو ، تا هاوسەنگی یەكتر دەردەچن ، ئەوەیش بە وردەكاری ورتووشكردن وهاویشتنی دوایین فلچەی ناسكو وریای وەرگێڕی هونەرمەند . ئەوسا دەبینین چ تابلۆیەكی قەشەنگ دێتە دنیاوە ! ئەوسا تێدەگەین وەرگێڕان چ هونەرێكی بەرزە و چ زانستێكی بەنرخ وبایەخە !!

## وەرگێراوی ڕۆمانی « خەندەلێو»

با لێکۆڵینەوەکەمان بە وەرگێڕراوێکی مامۆستا ڕەئووفی ئەحمەد ئالاّتی دەستپێبکەین کە بریتی یە لە ڕۆمانی «خەندەلێو» «المشوّه» ی نووسەری فەرەنسایی گەورە « ڤیکتۆر هیگۆ » ، دیارە وەك کاك ئالاّنی خۆی لەدەست پێشکەریەکەدا وتوویە ، لە تێکستە عەرەبی یەکەوە ، کە « أميل خليل بيدس » وەرگێڕیتی ، ئەم « خەندەلێو » ە کوردی یە ، هاتۆتە دی .

بەم بۆنەیەوە شایانی باسە کە وەرگێراوە کوردیەکانمان ، زۆربەی هەرە زۆریان لە زمانی دووەمەوە وەرگیراون

بۆ نموونە : گێلەپیاو لە فارسیەوەو خویشی تورکی یە ، خەندەلێو لە عەرەبی یەوە ، خـۆی فەرەنسی یـە ، پیرەمێـردو زەریـا لە عەرەبی یەوەو خۆی ئینگلیزی یە .. هتد ...

ڕاستی یەکەی ـ خەندەلێو ـ یەکێکە لەو وەرگێڕراوانەی کە ، ئەگەر بهاتباو وەرگێرەکەی پرس و ڕایـەکی بە بـرادەرو دۆستانی ئەدەبی ی خۆی کردباو برێك زیاتر خۆیی پێوە ماندوو کردبا ، ئێجگار سەرکەوتوو دەبوو .. بەلام ...!! والێرە بەدواوە هەندێ لەو باری سەرنج و نیشانەی پرسیارانەی کە ڕوویەڕووی « خەندەلێو » دەبنەوە ، دەخەمە ڕوو و دەبێ مامۆستا ئالاّنیش لەم پرکێشیەم ببوورێ .

۱ — ئەوەی گومانی لێ ناکرێ ئەوەیە کە ، داتاشین و بەدی هێنانی وشەو زاراوەو دەربڕینی نوێ و زیندووکردنەوەو بووژاندنەوەی پووکاو لەبیرچووەکـانیان ، کـارێکی ئێجگار پیـرۆزو گرنگـە . خزمەتێکی گەورەیە سەبارەت بە زمانی کـوردیی ڕەوانمان . بەلام ... بارو کارەو بارو جێی خۆی هەیە لەلای من هەڵەیە پیـاو شاکـارێکی وەك شاکـارەکەی هیگـۆ بکـاتـە « حـەقـلـی تەجاروبی » خۆی و ئەسپی وشەو دەربڕینە داتاشـراوەکانی خۆیی تیا تاو بدات !

لە خەندەلێودا ژمارەیەکی زۆر لەم وشەو دەربڕینانە ، بـەلووتی خوێنـەردا دەتەقێنەوەو وای لێ دەکـات وەڕس بێ و ڕۆمـانەکـە بە کـارێکی زۆر ئاڵۆز تێبگـات ، بەوچـەشنە ورە بـەردەداو دەست لە خـوێنـدنـەوەی هـەڵدەگـرێ . دەبـوایـە « خەندەلێو » بە زمـانێکی‌تر ، زمـانێکی ناسـراوو ڕەوان‌تر ، زمـانێکی کوردەواریـانـە ، مـانـاو نـاوەرۆکی ـ المشـوّه ـ ی بخستایەتە بەردەستی خوێنەری کورد ، نەك کارێکی وا بکات کە ، بـۆ ئەوەی لە یـەکێ لەو وشانـەی کاك ئـالاّنی تێبگـەیت ، بگەڕێتەوە سەر تێکستە عەرەبی یەکەی !! بزانیت ئەم « وشە ـ مەتەڵە » لەچی یەوە وەرگیراوە !

بـۆ نموونـەش وا هێندێ لەو « وشـە ـ مەتـەڵانە » لە لیستەیەکدا دەخەمە پێش‌چاو ، بابزانین لەسەرژمێریەکـدا ، چەند کورد ، چەند خوێنەری کورد لێیان حالی دەبێ و دەتوانێ لە قسەکردنیا بەکاریان بێنێ ؟ :

ـ بەردەتراوك / بەلاس / کەنگرەلاشك / بەتێزی / ناوازان / مینەپۆلەکان / کلەوە / دردۆمی / هاڕژن / تۆسن / چرژا / بەشەپریۆیکەوە / قاچاندی / کەبرۆلە / سپی‌واشی / بریسو / بوونەوەر / هولەهول / ئەمباز / بەدفەرجام / هەڵە ڕۆسکاند / جەفەنگانە / ئەترەش / شوومتە / شریخەی شـەپرێـوی / دەجێنێ / تێدا پلمیاوە / شەقەتۆڵە / سەهەندە / وەریووە / کۆزیلکە / سێچە دەکا / دەشی قریژم / هەڵە ڕۆسلێ / دەنگی بورشت / باریگا / هۆڕاق / جووتە مێمل / بژێو / لێبوك ... هتد !! ـ

**۲ ـ لاپەرە «5» ی ـ المشوّه ـ :**

« والأرواح الشـاردة تـذهب وتجيئ ، كمـا كـانت تلكم الأشباح المستخفية في جنح الليل الدامس تغدو وتروح ، وتُنْقَل الى ظهر السفينة تلك ، صناديق محملة بالطعام والماء والألبسة »

لاپەرە «6» ی ـ خەندەلێو ـ :

**« گیانە تاراوەکان لەژێر باڵی شەودا ، دێن و ، وەك چەند تارماییەکی و ڕوژاو سەبارەت بەچەند نهێنیەك .. چەنـد سندووقێکی تفاق بۆ سەر کەشتییەك دەگوێزرێنـەوە . » بروانە چەند جار «چەند» بەکار هاتووە ؟! ئەمە لەکاتێکدا کە لەسەرتاپای ئەو لاپەڕەیەدا ببڕای ببڕای ـ «بعض» یان «عدد من» ـ بەکار نەهاتووە . پاشان لە عـەرەبی یەکـەدا ئاشکرایە کە باسی دوو شت دەکات ، یەکەمیان : « ئەو گیانە تاراوانەیە » و دووەمیان : « تارماییـەکانـە » ، ئەوان دێن و دەچن و ئـەمـانیش لەژێـر بـاڵی شـەودا خـۆیـان**

**شاردوتەوەو هاتوچۆ دەکەن ـ جگە لەمانەش دیارە کە ئەو تارماییانەن سندوقەکان دەگوێزنەوە بۆ سەر کەشتی‌یەکە ـ کەچی لەلای کاك ئالانی وانی‌یە .. ئەوەتا گیانە تاراوەکانی لەژێر باڵی شەودا شاردەوەو بەمەشەوە ناوەستێ هەر لەخۆیەوە دەیانشوبهێنێ بەچەند تارمایی‌یەکی وروژاو سەبارەت بەچەند نهێنی‌یەك .. ئنجا گواستنەوەی سندووقەکانیش دەخاتە پاڵ « نادیارێك » «مجهول» و دەڵێ « دەگوێزرێنەوە » ! سەرەڕای ئەمانەش لەبارەی رەوان‌بێژیەوە ، دەربڕینێکی زۆر وشك‌و بێ‌تامە !**

**3 – لە لاپەڕە «6» ی هەردوو لادا :**

« ونظر الى السماء المكفهرة كأنـه مكلوم يستجير بـالله » « بە ناسۆرەوە سەیری ئاسمانێکی گرژ دەکاو لە قووڵایی دەروونی‌یەوە لە یەزدان دەلاڵێتەوە »

بڕوانە دەربڕینە عەرەبی‌یەکە لە ـ گێڕرانەوەی ـ رووداوەکە زیاتر چی‌ی‌دی نەکردووەو بەگشتی ڕستەکە لەباری ڕابووردوو دایە ، کەچی کاك ئالانی وەك چۆن « دەرهێنەرێکی » شانۆیی تێبینی‌و سەرنجەکانی ئەدا بە ئەکتەرێك ، بەو جۆرە باسی ئەو رووداوەمان بۆ دەکات ، کە لەوە دەچی هێشتا ڕووی نەدابی‌و ئەم‌ / شوێنی بۆ دیاری دەکات !! جگە لەوە « السماء المكفهرة » بە مانای « ئاسمانی گرژ » نایەت ، ئەمە لەلایەکی‌ترەوە کورد ، هیچ کوردێك ، ناڵێ‌و نەیگوتوە ـ ئاسمانی گرژ ـ پاشان ئەگەر مەبەستێش ئەوەبێ کە وەرگێڕانێکی ـ حەرفی ی ـ السماء المكفهرة ـ بکرێت ، ئەوا چاتر وایە بزانێ کە بەمانای ـ أشتَدَّ ظلامهُ ـ دێت ، واتە ـ ئاسمانێ کە تروسکایی لێ بڕا بێ ـ یان ـ ئاسمانی تاریکە شەوێك ـ یان ـ ئاسمانی تاریکە شەوێك ـ ئاشکراشە کە لێکچواندنی مناڵەکە یە ـ مكلوم يستجير بالله ـ گەلێ جیاوازە لە : « بە ناسۆرەوە .... لە قووڵایی دەروونی‌یەوە لە یەزدان دەلاڵێتەوە » !!

**4 – لە هەمان لاپەڕەدا : « واستخرط يبكي »**

« کوڵی گریان لە قورگیدا وێستا »

لێرەشدا بە هەڵەدا چووە ، چونکە « استخرط يبكي » یانی « اشتَدَّ بكائه » واتە : « دایە پرمەی گریان » .

**5 – هەمان لاپەڕە :** و وطّنوا النفس على « قهره واذلاله » .

« .... ئەو مندالە بتاسێنن‌و شەپرزەی بکەن . »

هەڵەیەکی ڕوون‌و ئاشکرایەو دەبوایە بیگوتایە :

«.... مل کەچ‌و ڕسوای بکەن . »

**6 – لاپەرە حەوتی هەردوولادا :** « بل نفر نفور القالي الخائف ، وارتّعد خوفاً منهم وارتعش فزعاً »

« بگرە وەك کابرایەکی ترساوی ڕق هەستاو ، قێزی لێ کردوونەتەوە » . بەر لەهەموو شتێ «کابرا» نی‌یەو مندالێکی دەساڵانە ، پاشس ئەوەش «نفور» بە مانای « قێزکردنەوە » نایەت‌و بەڵکو وشەی «قێز» خۆیشی لەوە دەچێ لەهەویری ـ تَقَزُّز ـ ی عەرەبی گونکی بۆ گیرا بێ .. « نفور» واتە « خۆ بەدوورگرتن » « نفر من الطعام » مانای « لە خواردنەکە کشایە دواوەو قەرەی نەکەوت ، یان ، توخنی نەکەوت » نەك ـ قێزی لێ‌کردبێتەوە . جگە لەوانەش ، ئاشکرایە کە داڕشتنەکە هیچ ڕەوانیەکی تیا نی‌یەو مۆسیقاکەی نامۆیە بەگوێ‌ی کوردو لەسەر زمان تەڕو پاراو نی‌یەو بەهیچ جۆرێکیش ئەوەندەی دەربڕینە عەرەبی‌یەکان ئیقاعیان توندو تۆڵ نی‌یەو ڕات ناچڵەکێنن ، نات هەژێنن !!

**6 – لەکۆتایی لاپەرەی شەشدا ئەم دووسێ دێرە هەیە ، کەچی لە کوردیەکەدا پەڕیوەو لەوە دەکات کاك ئالانی بە ـ حشو ـ و زیادەی دانابێ لەبەر ئەوە «قارسی» کردووە !**

**« وحاول أن يتكلم ، حاول أن يعبِّر عن شعوره ، بَيَد ان لسانه الجم داخل فمه ، فما نطق نبس ، إنما وجف قلبه ووجب ، وشهر بالدّوار ، وشعر بالبوار ـ » !**

**7 – لە لاپەڕە حەوتی ـ المشوّه ـ دا : « وجعل يرقى الصخور ويتسلق المرتفعات » ـ لاپەڕەی هەشتی ـ خەندەلیو ـ : « دەبوەوە بەسەر کوچك‌و کەلکدا .. تل دەبوەوە بە تەلان‌و هەڵدێردا » . ڕاستترو کوردی‌تر دەبوو گەر بیگوتبا : « بەسەر تاشەبەردا سەردەکەوت‌و بە بەرزاییدا هەڵدەگەڕا » ، ئیتر نازانم چۆن وای بۆ هات بڵێ : « بەرز**

**دەبوەوە » ؟ تۆبلێی هەر لەبەر ئەوەی ـ یرقی لە رقّیّ ـ یەوە هاتووەو بەمانای ـ بەرزبوونەوەو ـ بلندی ـ دێت ؟!.**

**8 — لەبەشی دووەمدا لەلاپەڕە 12 ی «المشوّە» دا :**
« ودنا رئیس العصابة من الربّان ، فأبتدره الأخير قائلا : » لە لاپەرە 13 ی ـ خەندەلێو ـ دا : « لەو کاتەدا سەرەك جەردەکان ، خێرا لە دەریاوانەکە نزیك بوەوەو پیّ ی گوت : » خـوێنەری بـەرێز ! سـەرنج بـدە ! لەپاش ئـەم ڕستـەیـە ، لە هـەردوو تێکستەکەدا ، دەمە تەقێیەك هەیە لە نێوانی ، دەریاوانەکـەو سەرەك جەردەکان‌دا .. جا ئـەگەر سـاخ نەبێتـەوە کامیـان دەستپێشکـەری دەکـەن لەم دەمـەتـەقـێیـەدا ، ئـەوا سەرانسەری مەبەستو ناوەرۆکی قسەکان بە شێـواویو بە پێچەوانەوە تێـدەگەیت . لەو ڕستـە عەرەبیـەی سەرەوەدا ، ئاشکراو دیارە کە دەریاوانەکەیە دەستپێشکـەری دەکات لە قسەکردنـدا ، کەچی کـاك ئالانی جلەوی قسـەکانی داوەتـە دەست سەرەك جەردەکان !!.

**9 — لەلاپـەڕە 17 ی ـ المشوّە ـ دا :** « فمضت تشق العبـاب کسکران ثمل لن یعتم أن یسقط من الاعیاء »
**لە لاپەرە 18 ی ـ خەنـدەلێو ـ دا : « ئـەویش دەستی بە قەلبەزو بڕین کرد ، بەچەشنی سەرخۆشی ڕاهاتوو ؛ کـە تاخۆی مرو کەیل بکا جلەو ی هۆش‌و گۆشی لەدەست ڕەها نەبیّ » لەڕووی دارشتنەوە ، درێژە پێدانێکی ئاشکرای ناسازی پێوە دیارە . لەڕووی مەبەستوماناوە ، لەگەل تێکستە عەرەبیەکەدا ، تەواو پێچەوانەی یەکدین !! ئەو دەلیّ : ئـەوەندە نـابا ـ لن یعتم ـ دەکـەویّو لەسەردەم دەچەقیّ ، کەچی کاك ئالانی بەوە قایل نابیّو (ناهێلیّ جلەو ڕەها بکاو بکەوێت) !!**

**10 — لە لاپەڕەی 18 ی ـ المشوّە ـ دا :** « وارسل بصره علیٰ سجیته یرود مجاهل الظمات.
لە لاپەڕی 19 ی ـ خەنـدەلێو ـ دا : « بـە مۆنیـەکەوە سەرنجی ئەو پەلە هەورانەیدا کە بەسەریانەوە کەبرۆلەیان کردبوو » دیسانەوە کاك ئالانی دەکەوێتەوە هەلەیەکی زەقەوە : وا « عـلی سجیتـە » ی دەکـات بـە « بـەمـۆنیـەکـەوە » . ڕاستی‌یەکەی بە مانای ـ علیٰ فطرتە ـ علی طبیعتە ـ دێت . واتە ـ جلەوی بۆ چاوی شل‌کرد ـ یان ـ بەدەم دالغەوە چاوی گێڕا ـ لەم بارەشدا «ترکیز» نامێنیّ بۆیە «سەرنج» یش نادرێت !. یا ئـایا ئـەم « پەلە هـەورانەی » لەکـوێوە هـاتن‌و چوا زووش فریاکەوتن «کەبرۆلە» بەسەریانەوە بکەن ؟ خۆ هەموو دەزانیین کەوا شەوێکی ئەنگوستە چاوەو ئاسمانیش تروسکایی لیّبڕاوە ، ئیتر ئەم سەرنجانە چی‌بوون وا لەم ڕەش پۆشیەدا ، ئەم پەلە هەورە ناسك‌و جوانانەی ، کە بوون بەکەپرۆلە ـ بەدی کرد ؟؟!

**11 — لە لاپەڕەی 29 ی ـ المشوّە ـ دا :** « إنّنـا ماص ون الیٰ المجهول ، فلنکفّر عن زلّاتنا بالصلاة »
**لە لاپەڕە 29 ی ـ خەندە لێو ـ یشدا کاك ئالانی دەلیّ :**
**« با بیر لە ڕابووردووی ناهەموارمان بکەینەوە .. نوێـژ بکەین » !!. من دلنیام کـە کاك ئـالانی ـ ماضـون ـ ی بە ڕابووردوو ـ لێکداوەتەوەو ، ـ فلنکفّر ـ یشی ـ بە ـ فلنفکّر ـ خوێندۆتەوە ، بۆیە کردوویە تە ـ بابیر بکەینەوە ـ !!**

**12 — لە کۆتا یی ئەم سەرنجانەمدا ،** دێمە سەرگـەورەترین هەلەی کاك ئالانی لەم وەرگێڕراوەدا بـڕوانە لاپـەڕە 29 ی ـ خەندەلێو ـ دێڕی «14» : « ئەی پیاو خراپان ! ئەمڕۆکە بابتان ئەسپی بەختتانە ! »
لە لاپەڕەی 29 ی ـ المشوّە ـ دا دەلیّ :
« أیهـا الأشقیاء الذین کبـابکم فرس الحـظ فغدوتم مجـرمین سفّاکین »
«کبابکم» بریتیـە لە « کبا + بکم » واتـە (اسقطکم) یـانی : « ئەی بەدبەختان ، لە ئەسپی بەخت گلان‌و بوون بە تاوانکارو خوێن‌ڕێژ » کەچی کاك ئالانی بە پەلە «کبابکم» ی کردووە بە ـ کەبابتان ـ !.

جا لەبەر ڕۆوناکایی ئـەو سەرنجـانەو گـەلیّ سەرنجی تریش ـ کە ئەوانە نموونەیان بوون ـ گەیشتمە ئەو بڕوایـەی وەرگێڕان لای ئێمە بە کارێکی سووك‌و ئاسـان لەقەلەم دراوە لەکاتێکدا مەسەلە تەواو بە پێچەوانەوەیە .

«1» ، ئەگەر هاتوو بەرهەمە کە شیعربوو ، پێویستە چەندجارێك بەدەنگی بەرز یان بەدم پارچە مۆسیقایەکی گونجاوەوە ، بخوێنرێتەوە ، تابەتەواوی ئیقاعی وێنـە شیعریـەکان لەمێشکی وەرگێردا تۆماردەبیّ .

# سێ نامەی ناظم حیکمەت



**احمد محمد اسماعیل**
**لە تورکییەوە کردوویە بە کوردی**

گەلێ لە ئەدیبو زانلو سیاسییەکانی ئەم دونیایە بێجگە لە کلوە سەرەکییەکانی خۆیان ، هەندێ شوێنەواری دیکەیان بۆ نەتەوەکانیانو مرۆڤایەتی لە پاش خۆیان بەجێ هێشتون ، نرخێکی تایبەتیان تێدایە . لە لایەکەوە دەبنە کەرەسەیێکی چاك بۆ لێکۆلینەوەی ژیانو بەرهەمی ئەو زاتانە ، لە لایەکی تریشەوە رۆشنایی دەخەنە سەر ئەو رۆژگارو سەردەمانەی کە تیایا ژیلون، هەروەها دەبنە هۆی پەردە لابردن لەسەر گەلێ قوژبنو نهێنی شاراوەی تر . یەکێ لەو شوێنەوارانە : « نامە نووسین »ە ، کە ئەدیبو شاعیرو زاناکان لە گەڵ هاوچەرخو دۆستە نزیکەکانی خۆیاندا دەیلن گۆڕییەوە .

**« نازم حیکمەت »یش بێجگە لە شیعرو شانۆگەریو رۆمان ، گەلێ نامەشی بۆ بەجێ هێشتوین ، کە بۆ «منەوەر »و « نورخان کمال » و « عرفان امین »و «د. گالینا کولاسنیکوڤا»ی ناردوون ، سەرەڕای ئەوەی نامەکان خۆی لە خۆیا پارچە نووسینێکی ئەدەبی جوانن ، گەلێ لایەنیش ڕوون دەکەنەوە .. ئەوانەیتا ئێستا بە عەرەبی کراونو بلاوکراونەتەوە بەشێکی یەکجار کەمی ئەو نامانەن .**

« عابدین دینۆ » هونەرمەندێکی ئاوارەو هاوڕێیەکی نزیکی ناظم حیکمەت بووەو نامەیەکی زۆریان بۆ یەکتر نووسیوەو زۆرتر دەربارەی شانۆو وێنەکێشان دەدوێن .

من لێرەدا تەنها سێ نامەی « ناظم حیکمەت »م لە کتێبی (Nazim Hikmet, yayinlanmamis eser|er)(1) وە وەرگێڕاوە .

ئومێدەوارم لە فرسەتێکی کەدا دەست بۆ ئەوانی کەش درێژ بکەم . هەرچونێك بێ سوودێك هەر دەبەخشن .

## نامەی ( 1 )

### 12 ئازار 1958 ، وارشۆ ـ سۆبەر

گیانەکەم عابدین

ئەمڕۆ بەجارێ دوو نامەتم پێگەیشت . زۆرم پێ خۆش بوو . وابزانم دوو رۆژ لەمەوبەر بوو منیش نامەیەکم بۆ ناردی ، کە دوو شیعری کورتی تێدایە، بەر لەو نامەیشمە ، سێ کتێبی تازەی خۆمم ـ کە لە سۆڤییت چاپکراون ـ بۆ هەناردی .

ئومێدەوارم بەر لەم نامەیەم هەمووت بەدەست گەیشتبێ ، ئەو شتەی لەگەڵ « فلیب گیرار » دا دەربارەی نواندن بیرتـان لێکردۆتەوە ، خرۆشانەمی‌و منیشی خستۆتە سەر خولیای ئەو بیرکردنەوەیە ، ڕاکێشانم پێ جوانە ، بەڵام بەلای منەوە ، یەکێک لەو شەش تابلۆیانە ، یاخود بابەتی تابلۆی حەوتەمین ، ئەم لایەنانە فەرامۆش نەکات : یەکێک لە خاسییەتە گرنگەکانی ئەم چەرخەی ئێستامانە ئەو ناکۆکی‌و ململانە ترسناکەیە کـە لە نێوان خودو سایکۆلۆجی‌و جۆری ژیانی مرۆڤەو لـە نێوان زانیاری‌و پێشکەوتنی بێ سنووری تەکنەلۆجی‌دا هەیە ، لـە لایەکەوە ئەستێرەکان دەخرێنە ژێر ڕکێفی مرۆڤەوە ، ئـەتۆم پارچە پارچە دەکرێ ، زۆر نابا چارەی شێر پەنجە دەدۆزینەوە. لە لایەکی کەوە چ ئەورووپاییەکان چ ئاسیاییەکان چ ئەفریقاییەکان‌و چ ئەمریکاییەکان تاکو ئێستاش ڕوحی چەرخەکانی ناوەڕاستەو بگرە ڕوحی چاخی بەردینیش لە ناخیاندا دەژی . تا ئێستا زیاد لە 80٪ ڕووتەو برسین ، لە 70٪ی ئـەم خەڵکـە نەخوێندەوارن . ئەم ناکۆکییە بەهێزە ــ کە لە نێوان تەکنیک‌و ڕوحی ئینسانەدا هەیە ــ وابزانم لە هیچ دەورێکدا بـەم جۆرە نەبووە . ئەم ناکۆکییە بەتینە مەگەر پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیا چارەی بکات ، هیچ ڕێگایەکی کە نییە . ئا ئەمـەیە کـە من دەمەوێ تێکەڵ بە تابلۆکان بکرێ .

ئەم بابەتە چۆن لەسەر شانۆدا دەر دەبڕدرێ ؟ مۆڵەتم بدەرێ تا نامەیەکی کە . تاکو بیری لێ بکەمەوە . چونکی لـەم ڕووەوە گەلێ بیرم کردەوە ، بەڵام با باشتر بیری لێ بکەمەوە ، بەڵێنەکەم دێنمەدی .. ئێستا دەست بۆ خاڵێکی کە درێژ دەکـەم ، وا بزانم بێجگە لەوەی کە شانۆ کەڵک لە پانتۆمیم‌و سـێزک وەردەگرێ ، گەلێ لایەنی دیکەش هەیە . ڕەگەزەکانی شـانۆ میللییەکانی لای خۆمان‌و شانۆی کلاسیکی ئاسیاش سـوود بەخشن . پار من لە « براغ »دا « کات ژمێری قولەکـەی براغ »م نووسی . بەگشت توانایەکی پانتۆمیمی ئەوێوە دەسکاری هەندێکیانم کردو سوودم لێوەرگرتن . قارەمانی شانۆگەرییەکە کچێکی کەڕو لاڵی جوو بوو کە بەدرێژایی دراماکە لە نوانـدنی پانتۆمیم بەردەوام بوو ، هەندێ جار کلاسیک ، هەندێ جاریش ڕیالیست ، یانی جوڵانەوەی واقعی‌و راستەقینەی کەڕو لاڵێک چۆنە ئەناوا ، هەندێ جاریش ئەو شتانە کە بـە زەینیا گوزەر دەکات بە « مەکنیتۆفۆن » لە کاتێکدا ئەو خـەریکی پانتۆمیمی خۆی بوو دەمان بیست .. بێجگە لەمەش چەند دیمەنێکی هەر بە پانتۆمیمی ڕووت نیشاندرا . بۆ وێنە : دیمەنی ئافرەتێک‌و دزێک لەناو بازاڕدا .

دەبێ شانۆگەرییە میللییەکانمان لەیاد نەکەین ، شـتێکی بەکەڵک لە شانۆگەریی کلاسیکی چین ببینین‌و بەکـاری بهێنین . ئەو شتومەکانەی کە لەسەر شانۆدا نەبن بـە جوڵانەوەو دەنگی ئەکتەرەکان بهێنرێنە دی .. بۆ وێنـە سەبەتەیەک لەسەر شانۆدا نییە . ــ هەروەکو سـەبەتەکە هەبووابێ ــ سەری سەبەتەکە هەڵدەگرێ ، پیاوێک لەناویا خۆی شاردۆتەوە ، جوڵانەوەی پیاوی ناو سەبەتە نەبووەکە چـۆن دەبێ ... هەر کە هێنایانەوە وارشۆ ڕووسییەکەیت بۆ دەنێرم . دەقە تورکییەکەیم لەلا نییە . باشیان وەرگێڕاوە ، بابەتەکەشی سەرنج ڕاکێشە . لەوانەیە لەوێ سوودێکی هەبێ . بەدڵتان بووو ڕەواجی هەبوو دەتوانرێ یەکسەر لە ڕووسییەوە بکرێ بە فەرەنسی . هەروەها دەقی شانۆگەرییەکی ترت لە وارشۆوە بۆ دەنێرم . ئەویش شانۆگەری « ببم یان نەبم » کـە پێـرار نووسیومە . تورکییەکەی‌و دەقە ئەسـڵییەکەیت بۆ دەنێرم . یوسفەو منەوەر(2) باشـیان وەرگێڕاوەو ، ناردوویانە بـۆ « ئەراگۆن » دەڵێن نەگەیشتۆتە دەستی‌و وون بووە . بۆ کچەکە

دەنووسم ئەگەر نوسخەیەکی کەی هەبێ ئەوا بۆ «دۆبجنسکی» بنێری ، چونکی نامەیان لە نێوانیدا هەیە . «دۆبجنسکی»یش بە تۆی بدا . بێگومان منەوەر ئەوە نانووسێ کە بدرێ بـەتۆ .. ئیحتمالی خوێندنەوەی « شیعرەکانی پراغ »م لەگەڵ پیشاندانی تابلۆکانت پێکەوە دڵی خۆش کردم .

چاک دەکەی کە یارمەتی گۆڤاری « ایتالیا » دەدەی . چی‌تر بڵێم . برای شیرینم . ڕەنگە لە دوکتوردا نەیەم بۆ پاریس ، پروفیسۆرو پسپۆڕەکان کە چاودێریم دەکەن ناهێڵن بێ پرسی دوکتۆر یەک هەنگاو بنێم . بەڵام مەسەلەی لەمـە گرنگتـر مەسەلەی « ڤیزەیە » ، لەلایەک ڤیزەی فرنسا ، لەلایـەک ڤیزەی دوکتۆرە سوڤیتییەکە . ئەگەر دەستی کەوت ئـەوا پێکەوە دێین ، ئەگەریش نا ، ئەوا واز لە هەموویان دێنم‌و بـە تەنیا دێم . ئەگەر ماهو نەمردم‌و پاریس تاریک دانەیەتەو شتێکی کوتەو پڕ ڕوو نەدات ، ئەوا لە کۆتایی مایسدا چاومان بەیـەک دەکەوێت . هەر کە چوومە پراغ بگرە بەر لەوەی بکەومە ڕێ ، ئەدرێسی خۆمت بۆ دەنووسم . چاوی تۆو گوزین ماچ دەکەم . ئەم نامەیەم لەوانەیە لە ( 17 )ی ئەم مانگەدا بەدەستت بکات ، من لە ( 20 )ی مانگدا بۆ براغ دەڕۆم . مانای وایە وەرامی ئەم نامەیەم لە براغ وەردەگرم . نەک جارێ ، هـەزار جـار حەسرەت .

## نامـەی ( 2 )

## ڕۆژو سـاڵی پێوە نییـە

ملەوستا

نامەکەت گەیشت ، هەواڵی بـەزنجیرە بڵاوکردنـەوەی

رۆمانەکەی « کەمال »و(3) رازانەوەی بە وێنەکانی تۆم پێ گەیشت ، هەروەها بە وەرگێڕانی رۆمانەکەی یەشار کەمالو شیعری شاعیرەکانمان ، بۆ فرەنسی دڵ خۆش بووم . ئێمەی تورك بە رەسمو ئەدەبیاتو شیعرماندا ئەمڕۆ لە جیهاندا لە ڕیزەکانی پێشەوەدا جێگە بۆ خۆمان دەگرین . ئەوەشم زۆر پێ خۆش بوو کە شیعرەکانم دەسی‌داوە بە نیتالی بکرێن . بە کورتی نامەکەت وەك سنوقێکی تژی خۆشی وا بوو کە کردمەوە ئاوێنە زیوینەکانی ناوی تیشکیان بە رووومەتمادا . ئەگەر نەمرین لە سەرەتای مانگی مایسدا بەیەك دەگەین . دوا نامەم لە وارشۆوە بۆ ناردی ، رەنگبێ بە دەستت گەیشتبێ . (وەرگێڕانەکەی منەوەر یەکجار نایابە ، لە خۆشیدا وەخت بوو شێتبم ) گیانی برا ، تۆ تەماشاکە دەمەوێ چی بپرسم : شانۆگەرییەکان سەرنجی رانەکێشاوی . ڕای خۆتم بۆ نەنووسیوی ، گەر پێت خۆش بووبن یا ناخۆش ، دەمەوێ بە روونو ئاشکرا گوێم لە ڕاکانت بێ . کتێبە روسییەکان لەگەڵ خۆمدا دەیانهێنم . ئیڤان ئیڤانوڤیچ چاپ کرا یانە ؟ . ( زۆرم پێ خۆش بوو کە کتێبەکەم ڕەواجی هەبووە ) . وا سێ پارچە شیعری خۆمت بۆ دەنێرم . دووانیان تازەنو ئەوی کەیان کۆنە .. تۆو گوزینو هەموو دۆستو برادەران لە باوەش دەگرم . چاوەڕێی نامەتم .

## نامەی ( 3 )

## رۆژو سالی لەسەر نییە

گیانەکەم گوزین ، دینۆکەم

گەر هەڵمواسن ، سەرم ببڕن ، ناوم لەدەفتەر بسڕنەوە، بڕواناکەم ڕۆژێ ئێوەم لەبیر دەرچێ ، بم بەخشن ، داوای لێبوردنتان لێدەکەم ، سەفەری یەك لە دوای یەکمو نەخۆشی بوونە هۆی دواکەوتنی نامەکانم . بەڵام هەرچی بڵێن هەقتانە. چونکی نە ئەمیانو نە ئەویان رێگا لە نووسینی دوو دێڕ ناگرن. ئێستاش لووتم وەك کانی خوڕەی دێ . چەند رۆژێکە سەرمام بووە، نە دەتوانم لەناو جێگەدا بمێنمەوەو نە ئەوەتانێ بتوانم هەڵسم . بە کردنەوەی پێشانگاکەی دینۆ کەیف خۆش بووم . شتێکم دەربارەی هونەری « عونی » خوێندەوە ، زۆریان وەسف کردووە ، ئەمەشم پێ خۆش بوو ، ئاە .. خۆزگە دەزانن چەندتان شانازی پێوەدەکەم ، کە لە ماڵەوە تاباۆکانت پیشان میوانەکانم دەدەم با دەچێتە لووتمەوە . چەند شیعرێ تازەم نووسیوە ، باش نین . ئەم سەرمایەم لەسەر بڕوات ، بۆتانی دەنێرم... گیانەکەم دینۆ ، کێ دەزانێ ئێستا خەریکی چەند شتی جوان جوانی . بیستومە « گوزین » « انجەممەد »ی وەرگێڕاوەتە فرەنسیو بە چاپ گەیندراوە، چی دەبێ دانەیەکیم بۆ بنێرن . گیانەکەم ئینسانەکانم چۆن دەبینن . ڕێزم هەیە بۆ پرتاڤو کوڕەکەیو دۆستانی . کە لەوێ گەڕامەوە پێت ووتم کتێبەکانت بۆ دەنێرم . ناردوونن ؟ ، نە گەیشتوونەتە دەستم ، ئەگەر نەتیش ناردوون ، بیانێرە . ئومێدەکەم ئەمسالیش بتوانم بێم . مەسەلەی ڤیزەو پارە دەمێنێتەوە .

بزانن لەوێ هەندێ لە شیعرەکانم (شیعرەکانتان بۆ دەنێرم) لە گۆڤارەکەی «سارتر» دەرفەتی بلاوکردنەوەیان‌نابێ ( ! ! )(4)، یاخود یەکێ لە شانۆگەرییەکانم بخرێتە سەر شانۆ . ئاخ لە دەست ئەم شانۆگەرییە بێ ناز کەوتوانەی من . وەڵلاهی ئەو شانۆگەریانەی کە لەوێ پەسەند کراون دەخوێنمەوە ناگەنە ئەمانەی من .

هەرچۆنێ بێ ، سەلام دەکەم لە خاتو دینۆ ، لە فلیب، لە تزارا ، ئافرەتێکی سکپڕ هەبوو ، ئێستا منالی بووە سەلامی لێ دەکەم . سەلام دەکەم لە ئەراگۆن ، لە کلود رووا ، لە سارتر، لە ڤیرکورس‌یش .

. . . . . . .

. . . . . . .

کارتێکم بۆ تزارا ناردووە ، دەزانم بۆ تەرجومە کردنی کارتەکە بۆلای تۆ دێ ...

شیعرەکانی پاریسم بۆ هەفتەیەك پشت گوێ خست ، سەر لەنوێ دەستم پێ‌کردەوە . تۆ هەرچی دەڵێی بڵێ . شانۆگەرییەکانم لە شانۆگەرییە بە ناوبانگەکانی ئەوێ کەمتر نین . ئەوەی « ادموڤ »م خوێندەوە ، من ئەمانەم چەند ساڵێك لەمەوبەر لە « کەللە سەردا » ووتووە . بتەوێو نەتەوێ دەست لە شانۆ هەڵناگرم ، تا ئەو کاتەی پەسەندیان دەکەی . سەلام بۆ هەمووان .

**پەراوێز**

**1 ـ ئەم کتێبە لە سالی 1977دا لە ئەستەموڵ چاپکراوە ، بریتیە لە دوو شانۆگەرییو دوو سیناریوو چیرۆکێکی منداڵانو چەند پارچە شیعرێكو هەندێ نامە ، کە تا ئەوکاتە بلاو نەکرابوونەوەو هەندێکیشیان بە رووسی نووسراوەو کراون بە تورکی ، یەکێ لە سیناریۆکانو شانۆگەرییەکم کردووە بە کوردی .**

**2 ـ ئەم منەوەرە خێزانەکەی نییە .**

**3 ـ وا بزانم مەبەستی ئۆرخان کەماله .**

**4 ـ ( ! ! ) لەلایەن منەوە دانراوە .**

# چەند سەرنجێکی سەرپێیی دەربارەی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی

● حەننا ئەنتوان
هەولێر 1983/2/1

بەرگی نۆهەمی ساڵی 1982ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کورد»م خوێندەوە ، کە تایبەتی بوو ، بە چارە سەر کردنی گیروگرفتەکانی نووسینو ڕێنووسی زمانی کوردی .

لە پێشەکی گۆڤارەکەدا ، وا دەردەکەوێ ، کە لە ئەنجامی ئەو بانگەوازەی ئەو لیژنە تایبەتی‌یەی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عیراق پێش ماوەیەك پێکی هێنابوو ، ئەو بانگەوازەی کە بەسەر ڕۆشنبیرو پسپۆڕو زمان زانەکانی کورددا بڵاو کرابووەوە بە هیوای بەستنی کۆڕێکی فراوان «بۆ لێکۆڵینەوەو چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی ..»[1] بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە ناوەڕۆکی پێشەکی‌یەکە پیشان درابوون ، کۆڕەکە دوا خرا بۆ هەلێکی‌ترو «وا پەسند کرا کە ئەو بابەتانەی بڕیاری خوێندنەوەیان لەسەر درابوو ، لە ژمارەیەکی تایبەتی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو بکرێنەوە تا بکەونە بەردەستی خوێندەواران‌و هەرکەس لە ئاستی خۆیەوە لێیان بکۆڵێتە وەو ڕاستی‌و چەوتی ئەو بیرانە دەسنیشان بکا کە لەو وتارانەدا هەن ..»[2]

بەراستی ئەوەی کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کورد» دەربارەی خزمەت کردنی ڕێنووسی زمانی کوردی کردوویەتی ، کارێکی زۆر بەکەڵك‌و سوود بەخشەو مایەی شانازیی هەموو کوردێکی دڵسۆزی زمانەکەیەتی‌و ، سوپاسی بێ پایانمان بۆ ئەو زمان زان‌و مامۆستایانەی کە بە چالاکی‌و دڵسۆزی‌یەوە بەشداری‌یان لە نووسینی ئەو باس‌و لێکۆڵینەوە بەنرخانەدا کردووە .

لێرەدا منیش وەك مامۆستایەکی خانەنشینی قوتابخانەی

سەرەتایی کە پتر لە سی ساڵ لەناو گیرو گرفتی نووسینی
کوردیدا ژیاوم ، ئەگەر بشێ بڵێم : «بامنیش بەرەی خۆم
بهاوێمە مزگەوت»و چەند تێبینیو سەرنجێکی تایبەتی خۆم
دەربارەی ئەم مەسەلە گرینگەی زمانی کوردی پیشان بدەم ،
بەڵکو بتوانم ، لە ئاستی خۆمەوە ، بەشدارییەکی بچووک لە
خزمەت کردنی زمانو رێنووسی کوردیدا بکەم .

جاری پێشەکی دەڵێم : ئەو باسەو لێکۆڵینەوانەی
گۆڤارەکە - لە دوای پوختە کردنیان - دەشێن ببن بە
دەستوورێکی پەیرەو کراو بۆ رێنووسی کوردی ، بە تایبەتی
باسەبەنرخەکەی «دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف» چونکە
زۆر بە وردیو لەسەر ربازێکی زانستیانە چارەسەری
گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی کردووەو هیچ کەلێنو
کەلەبەرێکی ئەو گیروگرفتانەی نەهێشتوتەوەو هەمووی
چارەسەر کردووەو بە بەڵگەو نموونە هێنانەوە لێیان دواوە .

بەلام ئەوەی لەکاتی خوێندنەوەدا سەرنجی راکێشام ،
ئەوە بوو کە زۆربەی نووسەرە بەرێزەکان هەوڵیان نەداوە زمانی
کوردیو رێنووسەکەی بەرەو ئاسانکردن ببەن .. لە بارەی ئەو
رێبازەشیان ، من هیچ رەخنەیەکی وەهام نیە ، بەڵام ئەوە
نەبێ ؛ وای بە پەسند دەزانم هەندە گوێ بە وردە گیروگرفتی
زمانەکەمان نەدەین . چونکە هەر وەك هەموومان دەیزانین ،
هیچ زمانێك لە جیهاندا نیە ، لە گیروگرفت رزگاری بووبێ .. جا
ئێمە چۆن وا بە کوتو پڕی دەتوانین هەموو گیروگرفتێکی
گەورەو بچووکی زمانی کوردی ببڕین . ؟

بۆ نموونە ، با سەرنج بدەینە نووسینی «همزه ، ظ ،
ض » لە زمانی عەرەبیدا ، تا ئێستا نووسەرە عەرەبەکانو
عەرەبی زانەکان ، ئەوەی شارەزاییکی زۆری لەو زمانەدا
نەبێ ، هەمیشە لەکاتی نووسیندا تووشی هەڵەی رێنووس
دەبێ .. هەروەها لە زمانی ئینگیزیشدا - کە زمانێکی
جیهانیە - ئەویش گیروگرفتێکی زۆرو زەوەندی رێنووسو
فۆنەتیکی هەیە ، وەك هەندێ پیتی دەنووسرێن ، بەلام
ناخوێندرێنەوە ، وەك جووتە پیتی «GH» لە وشەی «NIGHT» داو
پیتی «K» لە وشەی «KNIFE»دا ، یاخود هەیە چەند پیتێکی وەك
«Tio» بەدەنگی «ش» دەخوێندرێتەوە ، وەك لە وشەی
«Nation»دا ، هەندێ دەنگی وەهاشی هەیە بە دەنگی «ژ»
دەردەبڕێ کەچی چ پیتێکیان بۆ ئەو دەنگە دانەناوە ، وەیا
جووتە پیتی «PH» بە دەنگی «F» دەردەبڕێن ، ئەگەرچی پیتی
«F»یش لە زمانەکەیاندا هەیە .. هتد .

بێگومان ئەمانە هەموویان گیروگرفتن ، بەلام
ئەمریکاییەکان کە بەهەمان زمان دەدوێن دەنووسن ، ئەوان
هەوڵیان داوە شێوەی زمانەکە لەکاتی نووسیندا ئاسان بکەن .

جا ئێمە بۆ گرێی تازە بۆ زمانەکەمان پەیدا بکەین ، یان
بۆچی وردە گرێکانی بکەین بە «گرێ کوێرە .. ! ! ؟» خۆ ئەگەر
لە مامۆستاکانی زمانی کوردیو قوتابیەکانمان بپرسین ، ئەوان
وەرامی لەبارو راستیان لەلایە ، چونکە لەناو جەرگەی
گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردیدا دەژین .. خۆزگە
دەستەیەکی زۆریش لە مامۆستاکانی ئەلفو بێی کوردی
بەشدارییان لەو پرۆژەی گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردیدا
بکردایە ، چونکە ئەم مەسەلەیە ، بابەتو گیروگرفتی رۆژانەی
ئەوانە . وە من ئەوکات ، لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی ئاگاداری
بانگەوازەکەی کۆڕی زانیاری نەبووم ، دەنا بە لەقەلەقیش
بوایە شتێکم هەر ئامادە دەکرد .

ئێستاش با بێینە سەر نووسینی هەندێ دەنگی زمانی
کوردی ، بە پیتی عەرەبی ، لەوانە دەنگی «و»ی درێژ واتا :
«وو - ن» ، بەلامەوە ئەم دوو «وو»ە بۆ واوی درێژ ، لە
کرمانجی خواروودا خۆی چەسپاندووەو پێویست بە دەسکاری
کردن ناکات ، وەك لە وشەکانی «بووك ، دوور .. هتد»
دەردەکەوێ .

دەمێنێتەوە (و)ە تایبەتیەکەی شێوەی کرمانجی
ژووروو ، بۆ ئەویش (و)ی کەشیدە لەسەر «وَ»ی بۆ بنووسرێ
وەکو «بویك - بوَك»و «دویر - دوَر» ، نەك هەوڵ بدرێ پیتێکی
تازەی بۆ دابنرێت .

واوێك یا دووان : هەرچەندە دکتۆر «ئەورەحمانی حاجی
مارف»ی بەرێز بەڵگەی دوو «و»ی هێناوەتەوە ، لەو کاتەی کە
دەکەوێتە سەرەتای وشەوە وەکو «حوشتر - ووشتر» و
«گوتن - ووتن»(٣) . بەلام بۆ ئەوەی زمانەکەمان تووشی
گیروگرفتی تازە نەکەین ، باهەر بە واوێك واز بێنین ، چونکە لە
فۆنەتیکدا سووکەو بۆ هەردوو بەشە شێوەی - کرمانجی
سەرووو کرمانجی خواروو - دەگونجێ .

هەروەها ئاشکراشە کە وشەی کوردی بە (ر)ێی قەڵەو

دەست پێ دەکات ، بەڵام پێویستیش ناکا دوو (ر)ی بۆ دابنێن ، خۆ قەت بە «ڵ»ی قەڵەویش دەست پێ ناکات .. جا بۆچی هەمان مامڵەتیش لەگەڵ «وو ـ ن»ی سەرەتای وشەدا نەکەین . ؟

دیسانەوە ، بەلای منەوە ، پێویست ناکات ، لە جیاتی «ك ، گ» دوو پیتی تازە بدۆزینەوە ، لەو حاڵەتەی کە بکەونە پێش بزوێنی «ی ، ێ ، وی ، وێ» وەك : «کێل ، گێلاس ، کوێر ، گوێز .. هتد» ، چونکە ئەم جۆرە دەنگە هەر لە هەندێ ناوچەی کرمانجی خوارووداا دەردەکەوێو دیاردەیەکی گشتی نیە بۆ هەموو شێوەکانی زمانی کوردی ، بە تایبەتی لە کرمانجی ژووروودا دەنگە نەژادەکەی خۆی پێ دەدرێ ، بە پێچەوانەی دەنگی دیفتۆنگی «وو ـ ن»ی کرمانجی‌ی ژووروو کە فۆنەتیکێکی تایبەتی هەیە . هەر وەك لە ناوچەکانی کرمانجی خوارووشدا دەنگێکی تایبەتی دەدەنە (كوگ)ی پێش ئەو بزوێنانەی باسمان کردن ، جگە لەوەش «کە زانیمان دەنگی (گ) لە وشەی (گەڕ)و (گێڕ)دا لەگەڵ جیاوازی شێوەی تەلەفوزکردنیشیاندا ، هەر یەك فۆنێمن ، ئەوە ئەو هەڵەیە ناکەین کە وێنەی جیاوازیان بۆ دابنێین .»[4]

لە باسەکەی «دکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم»دا ، هەندێ مەسەلەی راناوی (لکاو) هەڵدەسەنگێنین . لە وانە (ێ)یە ، بە تایبەتی لەو کاتەدا کە بەناوەوە دەلکێو دەبێ بە پاشگر . دکتۆر ئیبراهیم چەند نموونەیەکی بۆ ئەم جۆرە (ێ)یە هێناوەتەوە ، وەك ئەمانەی خوارەوە :ـ

«دوێنێ زوو گەیشتمە هەولێرێ .»

«ئاوی رژاندە ناو پەقرەجێ .»[5]

لێرەدا دکتۆر ئیبراهیم (ێ)ی (هەولێرێ)و (پەقرەجێ)ی بە راناوی لکاو داناوە ، بەڵام هەرچەندە بیرم لێکردەوە قەناعەتم نەهات کە ئەو چەشنە (ێ)یە راناو بێ !!

بۆ نموونە : کە دکتۆری بەڕێز دەڵێ : «نوێنەرەکان رۆیشتنە کەرکووکێ .»[6] بۆچی (ێ)ی پاشگری (کەرکووك) راناو بێو بۆ نەڵێین تەلەفوزێکی تایبەتیە بە هەندێ ناوچەی تایبەتی کوردستان ؟ بەڕای من ئەو (ێ)یە کە بە فرمانەوە لکا ئەوسا بە راناو دادەنرێ ، هەروەك :

ئەو پارەی پێم بوو دامێ .

بەردێکم پێ بوو هاویشتمێ .

چونکە ئەگەر ئەو (ێ)یە کراوەیە بە ناوەوە لکا ، ئەوا لەجیاتی (ێك)ی تاکی نەناسراو بەکار دێ : «پەقرەجێ ـ پەقرەجێك .. هتد» ، بەڵام کە بەناوی ناسراوی وەك : «شارو وڵات»ەوە لکا ئەوا تەنیا لکە شێوەیەکی ناوچەیەکی بچووکی کرمانجی خوارووە ، بەم جۆرە دەدوێنو (ێ)ی کراوە دەخەنە دوای هەموو ناوێك کە لە کۆتایی رستەوە بێت .

وە لەبارەی نووسینی ژمارەکانی کوردی لە (11 — 19) ئەو شێوەیەی لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە ، لەکاتی خۆیدا پەسند کرابوو ، هەر ئەو شێوەیە لە شێوەکانی‌تر ئاسانترو لەبار ترە[7] ، بۆ نووسینو تەلەفوز کردنیشی ، وەك ئەم جۆرە نووسینەیان «یازدە ، دوازدە ، سێزدە یا سیازدە ، چواردە ، پازدە یا پانزدە ، شازدە ، حەڤدە ، هەژدەو ، نۆزدە .» نەك (ن) یێکیان بۆ زیاد بکرێ یا دالەکان قووت بدرێن .

لە دواییدا ، دووبارە تکام وایە کە هەموو لایەك ، بە تایبەتی زمان زانەکانمان ، هەوڵی ئاسانکردنی نووسینو رێنووسی زمانی کوردی بدەن .. [وابزانم کە بنووسین (نیە ـ قوتابیان) هەر نەبێ لە (ی)یەك رزگاریمان دەبێ .. !!] .

ئیتر چاوەڕوانی بەستنی ئەو کۆڕە فراوانەین ـ بەزووترین کات ـ کە کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد ـ ی بەڕێز بڕیاری لەسەر دابوو ، بۆ ئەوەی ئەو بابەتانەی کە لە گۆڤارەکەدا نوسراون لەوێ زیاتر روون بکرێنەوەو پتر شی بکرێنەوەو لەسەریان بدوێین ـ خۆزگە کۆڕێکی فراوانیش ببەسترابە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رێزمانی کوردی ـ لەگەڵ سوپاسمدا .

پەراوێز

1 ـ پێشەکی بەرگی نۆهەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کورد» ساڵی 1982 ل : 3 .
2 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : 3 .
3 ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ـ بەرگی نۆهەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ «دەستەی کورد» ساڵی 1982 ل 42, 43 .
4 ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : 18 .
5 ـ د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عراق ـ دەستەی کورد ـ ب : 9 : ل : 455 .
6 ـ د. ئیبراهیم عەزیز ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 455 .
7 ـ نووری عەلی ئەمین ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 399 .

# ڕێــزمــانـــی ڕانـــاوی لـــکــاو

1 ـ ئه ـ تان ـ نێر ـ ین (ئێمەئێوەئەنێرین)

بەرکار بکەر



2 ـ ئه ـ تان ـ نارد ـ ین (ئێوەئێمەتانئەنارد)

ئەم دوو ڕستەیە لە قاڵبی ووشەیەکدا داڕێژراون هەردوو بریتین لە (بکەر) و (بەرکار) و (فرمان) بکەر و بەرکار تیایانا بە ڕاناوی لکاو دەربڕاون

ڕستەی یەکەم ـ کاتەکەی داهاتووە

ڕستەی دووەم ـ کاتەکەی ڕابردووە

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە گۆڕینی کاتی فرمانەکە دەوری (بکەر) و (بەرکار)ی ئاڵ و گۆڕکرد .

ئـەم ووتارە هـەوڵدانێکـە بـۆ ڕوون کـردنـەوەی ئـەم دیاردەیەی زمانی کوردی و داڕشتنی ڕێزمانەکەی

لە زمانی کوردی (خواروو) بکەر و فرمان ڕێك ئەکەون لە کەس و ژمارەدا . واتا بکەر لە چ کەس و ژمارەیـەکدا بێت ، فـرمانیش ڕانـاوێکی لکاوی سـەر بە هـەمان کـەس و ژمارە وەرئەگرێت . بۆڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە ئەبێ ڕاناوە جودا و لکاوەکان بە پێی کەس و ژمارە لەبەر چاوا بن .

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

وێنەی ژمارە -١-

هەر چەندە جیاوازیی نێوان کۆمەڵی (1) و (3) تەنیا لە کەس سێیەمی تـاکدایـە . بۆ مـەبەسێ شیکـردنەوە جیـایان ئەکەینەوە[1].

جۆر و کاتی فرمان دەور ئەگێڕن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکـاو . (مەبـەست لە جۆری فـرمان تێپـەڕ یـا تێنـەپـەڕە .

مەبەستیش لە کاتی فرمان ، ڕابردوو یا داهاتووە .)

چۆنیەتی دەرکـەوتنی ڕاناوی لکـاو لە گەڵ فـرمانـا بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە .




وێنەژمارە (2)

واتا ـ گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێپەڕدا بوو کۆمـەڵی یەکەم وەرئەگرێ .

ئێمە نسی ـ مان .

ك1 ك1

ئەوان خوارد ـ یان .

گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێنەپەردا بوو بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لە گەڵ بکەرا کۆمەڵی دووەم وەرئەگرێ .

د . وریا عمر امین
بەشی کوردی ـ زانستگای بەغدا

ئەوان نووست ـن .
3ك 3ك

ئێمە نووست ـ ین .
1ك 1ك

گەر فرمانەکە لەکاتی داهاتوودا بوو .. چ تێپەڕ بێ چ تێنەپەڕ کۆمەڵی سێیەمی لەگەلا دەرئەکەوێ بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا .

ئەو ئەخو ـ ا ت .
3ت 3ت

ئێمە ئەنوو ـ ین .
1ك 1ك

بۆ هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن یەکەم ـ سەیری وێنە ژمارە (2) ئەکەین بە پێی کات و جۆری فرمانەکە کۆمەڵەکە دەس نیشان ئەکەین ئنجا بە پێی کەس و ژمارەی بکەرەکە ، بە یارمەتیی وێنە ژمارە (1) ڕاناوە لکاوەکە ئەدۆزینەوە بۆ نموونە لە :

ئێمە نارد ـ .

(نارد) کە ڕەگی فرمانە ، لە ڕووی جۆرەوە (تێپەڕە) و لە ڕووی کاتەوە (ڕابردووە) . بە پێی وێنە ژمارە (2) ڕاناوی لکاو ئەبێ لەکۆمەڵی یەکەمەوە وەرگیرێ . (ئێمە) کە بکەرە لە کەسی (یەکەمی کۆ) دایە . بەرامبەرەکەی بەپێی وێنە ژمارە (1) ، (مان)ە . ئەلکێنرێ بە ڕەگی فرمانەکەوە و ڕستەکە ئەبێ بە :

ئێمە نارد ـ مان .
هەروا لە :
ئەوان ئەنوو ـ .
(نوو) ڕەگی داهاتووی (نووستن)ە . لە ڕووی جۆرەوە (تێنەپەڕە) ، لە ڕووی کاتەوە (داهاتووە) بە هۆی وێنە ژمارە (2) ڕاناوی لکاو ئەبێ لە کۆمەڵی (سێیەم)ەوە وەرگیرێ . (ئەوان) کە بکەرە لە کەسی (سێیەمی کۆ) دایە ، بە پێی وێنە ژمارە (1) بەرامبەرەکەی (ن)ە . ڕستەکە ئەبێ بە :

ئەوان ئەنوو ـ ن .
3ك 3ك .

یەکێ لە تایبەتییەکانی کۆمەڵی یەکەمی ڕاناوە لکاوەکان واتا کۆمەڵی (م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان) ئەوەیە شوێنی لە ڕستەدا ئەگۆڕێ بە پێی قاڵبی ڕستەکە .
ئەگەر ڕستەکە بەرکاری ڕاستەوخۆی هەبوو ڕاناوی لکاو بەمەوە ئەلکێ وەك لە :

ئێمە گوڵ ـ مان بۆ ئێوە ئەنارد .

کەی ڕستە بەرکاری ڕاستەوخۆی نەبوو ئەوسا ڕاناوی لکاوی کۆمەڵی یەکەم بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ .

ئێمە بۆ ئێوە ـ مان ئەنارد .

بە لابردنی بەرکاری ناڕاستەوخۆش ، پرپۆزیشن ئەبێ بە پەناگەی .

ئێمە بۆ ـ مان ئەنارد .

بە لابردنی پرپۆزیشنیش پێشگر ئەبێ بە پەناگەی :

ئێمە ئە ـ مان ـ نارد .

کەی پێشگریش نەبوو ، ئەوسا بە ڕەگی فرمانەوە ئەلکێ .

ئێمە نارد ـ مان .

بەکورتی [کۆمەڵی یەکەمی ڕاناوە لکاوەکان بە یەکەمی ئەم بەشانەی ڕستەوە ئەلکێ بەم ڕیزە :

1 - بەرکاری ڕاستەوخۆ (2)
2 - بەرکاری ناڕاستەوخۆ
3 - پرپیوزیشن
4 - پێشگری یەکەم
5 - ڕەگی فرمان        یاسا ژمارە(1)]

[کۆمەڵی دووەم و سێیەم هەمیشە بە ڕەگی فرمانەوە ئەلکێن        ..... یاسا ژمارە (2)]

جگە لە دەوری (بکەری) ئەم ڕاناوە لکاوانە دەوری (بەرکاری)ش ئەبینن . بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و (ناوی‌خاوەن) ئەشێ بە ڕاناوێکی لکاو جێگیر بکرێن .

لە بەر ئەوەی باس باسی دەوری بەرکاری‌یە بۆیە تەنیا ئەو ڕستانە ئەگرێتەوە کە فرمانەکانیان تێپەڕە .

وەك لە سەرەوە ڕوون کرایەوە ، کۆمەڵی یەکەم لە گەڵ ڕابردووی تێپەڕ و کۆمەڵی سێیەم لەگەڵ داهاتووی تێپەڕا دەوری بکەری ئەبینن . کۆمەڵی دووەم و سێیەمیش وەك یەکن تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا نەبێ .

بۆ دەوری بەرکاری ڕاناوە لکاوەکان دابەش ئەکەینە کۆمەڵی (A) و (B) بەم جۆرە

| B | | A |
|---|---|---|
| ٣ | ٢ | ١ |
| م | م | م |
| یت | یت | ت |
| ات/ێت | - | ی |
| ین | ین | مان |
| ن | ن | تان |
| ن | ن | یان |

وێنەی ژمارە -٣-

کۆمەڵی (A) کە دەوری (بکەری) لە ڕابردوودا ئەبینێ ... دەوری (بەرکاری) لە داهاتوودا ئەبینێ .

کۆمەڵی (B) کە دەوری (بکەری) لە داهاتوودا ئەبینێ ... دەوری (بەرکاری) لە ڕابردوودا ئەبینێ .

دەرکەوتنی ڕاناوە لکاوەکان وەك دەوری (بکەری) و (بەرکاری) لە گەڵ فرمانی تێپەڕا لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە :




بۆ جێگیر کردنی کردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ یا ناوی‌خاوەن بە ڕاناوێکی لکاو ئەم هەنگاوانە ئەگرینە بەر :

1 - سەیری ڕاناوە لکاوەکە ئەکەین کە دەوری بکەری بینیووە لە کامە کۆمەڵ بوو بۆ بەرکاری ڕوو لە کۆمەڵەکەی تر ئەکەین . واتا - گەر لە کۆمەڵی (A) بوو بۆ (بەرکاری) ڕوو لە ( B ) ئەکەین و بەپێچەوانەوە .
2 - بە پێی کەس و ژمارەی ئەو بەشەی جێگیر ئەکرێ - بەیارمەتی وێنە ژمارە (1) ، ڕاناوێکی لکاو هەڵئەبژێررێ .
3 - بە پێی یاسا ژمارە (1) و (2) شوێنی ڕاناوەکە لە ڕستەکەدا دەس نیشان ئەکرێ .
بۆ نموونە لە ڕستەی :

ئێمە تۆ بۆ ئەو ئەنێرین .

بەرکاری ڕاستەوخۆ (تۆ) یا ناڕاستەوخۆ (ئەو) یاهەر دووکیان بە یەکەوە ئەشێ بەڕاناوی لکاو جێگیر بکرێن .
1 - ئەو ڕاناوە لکاوەی دەوری (ڕێکەوتن) واتا (بکەری)ی بینووە (ین) لە کۆمەڵی (B)یەوەیە . واتا - بۆ بەرکاری ڕوو لە کۆمەڵی (A) ئەکەین .

2 - (تۆ) كه له كەسی دووەمی تاكدایە (ـت) بە پێی وێنە ژمارە (1) لە کۆمەڵی یەکەم بەرامبەرەکەی (ت)یە . ئەم (ت)یە شوێنی (تۆ) ئەگرێ .

3 - بەپێی یاساژمارە (1) . (ت)کە لە کۆمەڵی یەکەمەوەیە دوای لابردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ . بەم جۆرە ڕستەکە ئاوای لێ دێ :




ئێمە بۆ ئەو ـ ت ئەنێرین .

کە بەرکارە ناڕاستەوخۆکە بە ڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێ :




ئێمە تۆ ـ ی بۆ ئەنێرین .

گەر فرمانی ڕستە کاتەکەی ڕابردوو بێ :

1 - کە بەرکاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێت




ئەوان بۆ تۆ ـ یان نارد ـ م .

ب - کە بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو دەرئەبڕێ .




ئەوان منیان بۆ نارد ـ یت .

بۆ جێگیرکردنی ناوی خاوەن بە ڕاناوێکی لکاو سەیری ئەم ڕستەیە بکە :

**تۆ ئوتومبیلەکەی منت فرۆشت .**

(من) کە ناوی خاوەنە ئەشێ بە هەمان پەیڕەو بە ڕاناوێکی لکاو جێگیر بکرێ .

1 - ئەو ڕاناوەی دەوری بکەری بینیووە (ت) لە کۆمەڵی (A)یەوەیە . چونکە فرمانەکە ڕابردووی تێپەڕە .

2 - ناوی خاوەن (من) لە کەسی یەکەمی تاکدایە لەکۆمەڵی (B) بەرامبەرەکەی (م) ە .

3 - بە پێی یاسا ژمارە (2) کۆمەڵی (1) و (2) لە ڕاناوە لکاوەکان هەمیشە بەرەگی فرمانەوە ئەلکێن بەمجۆرە ڕستەکە ئاوای لێ دێ .




تۆ ئوتومبیلله‌كه‌ت فرۆشتم .




تۆ كتێبه‌كانت لێ وه‌رگرتن .

[(ی) كه ده‌وری به‌ستنی ناوی خاوه‌ن به به‌ركاری راسته‌وخۆوه‌ی بینی دوای لاچوونی ناوی خاوه‌ن ده‌وره‌كه‌ی نامینێ و لا ئه‌چێ .]

[گه‌ر به‌ركاری ناڕاسته‌وخۆ به‌ڕاناوێكی لكاو جێگیر كرا ... پریپۆزیشن (به) ئه‌بێ (پێ) و (له) ئه‌بێ‌به (لێ) .....

یاسا ژماره (3) ]




ئێمه قسه‌كه ـ ت پێ ئه‌ڵێین .

به‌ركاری ڕاسته‌وخۆ و ناڕاسته‌وخۆ ئه‌شێ هه‌ردووك پێكه‌وه به‌راناوی لكاو جێگیر بكرێن .

أ ـ گه‌ر فرمانه‌كه له كاتی داهاتوودا بێ هه‌ردوو ڕاناوه لكاوه‌كه به پریپۆزیشنه‌وه ئه‌لكێن به‌م جۆره

**پریپۆزیشن ـ به‌ركاری راسته‌وخۆ ـ به‌ركاری ناڕاسته‌وخۆ**

یاسا ژماره (4)




ئێمه بۆ ـ ت ـ ی ئه‌نێرین .

ب - گەر فرمانەکە لە کاتی ڕابردوودا بێ .. هەردوو ڕانـاوە لکاوەکان بە ڕەگی فرمانە وە ئەلکێن بەم جۆرە .

### ڕەگیفـرمان - بـەرکاریڕاستـەوخـۆ - بـەرکـاری ناڕاستەوخۆ

**یاسا ژمارە (5)**




تۆ بۆت نارد - ن - ین .




من بۆ - م نارد - ن - یت .

(جێگیر کردنی هەردوو بەرکار پێکەوە بە ڕاناوی لکاو زۆر کەمە لە قسەکردنا)

کەی دوو ڕاناوی لکاو بە یەکەوە بە ڕەگی فرمانەوە لکان یـەکێکیان دەوری (بکـەری) و ئەویتـر (بەرکـاری) ببینی ریز بوونیان بەم جۆرە ئەبێ .

### ڕەگیفرمان - بکەر - بەرکار

**یاسا ژ (6)**




من ناسی - م - ن .

تەنیا گەر (بکەر) لە کـەسی سێیەمی تـاکدا بێت . لەم حاڵەتەدا ریزبوونیان بەم جۆرە ئەبێ

### ڕەگیفرمان - بەرکار - بکەر

**یاسا ژ (7)**




ئەو ناسی - ین - ی .

بە جێگیر کردنی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەی أ و ب بە
پێی ئەو یاسایانەی پێشکەش کران ڕوون ئەبێتەوە بۆ و چۆن
دەوری (بکەر) و (بەرکار) ئاڵوگۆڕ ئەبێ/گۆڕینی کاتی
فرمانەکە :







## پەراوێزەکان

(1) - وەك دەرئەکەوێ ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی کۆمەڵی سێیەم خۆی بە (ات) یا (ێت) دەرئەخا . ئەگەر ڕەگی کاتی داهاتووی فرمانەکە بە (ۆ) یا (ـە) کۆتایی هاتبێ ئەوە ڕاناوە لکاوەکە قاڵبی (ات) ئەگرێتە خۆ ، دوای ئەوەی (ۆ) ئەبێ بە (و)ی کونسونانت و (ـە) ئەتوێتەوە




من ئەخۆم ← ئەو ئەخوات
من ئەکەم ← ئەو ئەکات

**لە هەموو حاڵەتێکی تردا ڕاناوەکە خۆی بە (ێت) دەرئەخات .**

ئەو ئەمرێت .
ئەو ئەچێت
ئەو ئەنووێت ... هتد

(2)- یا بەو ووشانەی لە زانستی زمانا بە Quantifier ناو ئەبرێن وەك (زۆر ، کەم هەندێ ... هتد) وەك :

من زۆر - م قسە پێ ووت .
ئێمە هەندێك - مان دیاری بۆ هێنا .

## سەرچاوەکان .


1 — Amin, W.O (1979) ((Aspects of the Verbal construction in kurdish)) London university .

2 - ئەمین ، و.ع (1981) «ڕاناو لە کرمانجیی خواروودا» ڕۆژنامەی هاوکاری ژ 616 و 637

3 - کۆڕی زانیاری کورد (1976) «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی» .



سوپاس بۆ

کاك عەزیز ڕەشید حەریری کە لەم ووتارەو ئەوەی لە ژمارە دووی کاروان بڵاوکرابیەوە ئەرکێکی زۆری کێشا ..

سەلاحەدین سالح مەجید

# دەربارەی فلیمەکەی «یەلماز گۆنای»..

# «ریگە - یۆل»

کاتێ کە لە ژمارە (3)ی گۆڤاری کاروانی خۆشەویستدا لەژێر ناوونیشانی هەواڵێکی هونەری باسی فلیمە کوردی‌یە تورکی‌یەکەی (یەلماز گۆنای)م خوێندەوە ، منیش حەزم‌کرد زیاتر بە خوێنەرانی کوردی بناسێنم ئەویش لە ژمارەیەکی گۆڤاری (الدستور) باسێکی لەسەر نووسراوە بەلام بە داخەوە لەبەر ئەوەی بەرگەکەی نەماوە نازانم چ ژمارەیەکەو هی چ ساڵێکە ! بەلام زیاتر وای بۆ ئەچم کە هی ساڵی 1981 بێت .

ئەم مرۆڤە زیرەکە گەرچی نەیتوانیوە بەزمانی خۆی فلیمێ دەربکا ، بەلام پشتی لە گەلەکەی نەکردووەو بەزمانی ئەو وولاتەی تیادا ئەژی توانیویەتی فلیمێ دەربارەی گەلەکەی خۆی ، کوردی تورکیا تۆماربکا ، کە لە میهرەجانی (کان) لە فەرەنسا خەلاتی زێرینی پێ دراوە ... ئەم فلیمە کە لە شاری پاریسا نیشان ئەدرێ ریزی خەلکەکەی نزیکەی کیلومەترێک بووە بۆ بلیت برین بۆ تەماشاکردنی . ناوی فلیمەکە (یۆل)ەو گۆڤاری (الوطن العربي) ووتویەتی ئەم فلیمە بە هەلە پێی دەووترێ تورکی ، راستر وابوو پێی بووترێ کوردی یان تورکی ـ کوردی ، چونکە ناوەرۆکی چیرۆکی فلیمەکە دەربارەی کوردەکانی تورکیایە .. نوێنەری گۆڤارەکە لە فەرەنسا دەلێ : ئافرەتێکی فەرەنسایم دی ووتی : حەفتەی دوو جار ئەم فلیمە ئەبینم‌و لێی بێزار نابم .. سەرەتای فلیمی (یۆل) بە گۆرانی‌یەکی کوردی‌و دیمەنی بەندیخانەیەك لە نزیك




شاری ئەستەمبولەوە دەست پێ ئەکات ... ئەمە گۆڤاری (الوطن العربي) بلاوی‌کردووەتەوەو گۆڤاری کاروان لەژمارەی (3)ی ساڵی 1982دا کردوویەتی بە کوردی ... گۆڤاری (الدستور) دەلێ :

یەلماز گۆنای ناوێکی گەورەیە لە جیهانی هونەری تورکی‌ی تازەدا . لە ساڵی 1937 دا لە گوندێکی بچووك لە نزیك شاری (اضنە)وە لە خوارووی رۆژهەلاتی تورکیا لەدایك‌بووە . ئەم ناوچەیەش بە بەپیتی‌و بەکشتوکاڵ ناسراوەوە بە دەوڵەمەندی لەرووی ئابووری‌یەوەو بە چاقی بنچینەیی دائەنرێ بۆ بەرهەم هێنانی لۆکە ، هەروەها بەوە ناسراوە کە ژمارەی دانیشتوانی لە زیادبوونێکی بەردەوامدایە . پیاوان بە زۆری چەك لە گەڵ خۆیاندا هەڵ‌ئەگرن‌و لە نێو زنجیرەیەکی شەڕدا دەژین .

یەلماز کوری جوتیارێکی کوردەو باوکی حەوت منالە ، هەر لە لاوێتی‌یەوە لە ئیشێکەوە چووەتە ئیشێکی تر ، جووتیاری‌و گۆشت فرۆشی‌و چەندەها ئیشی دەستی تری کردووە . ئەمەش وای لێ‌کرد کە بتوانێ ئەوەندە کۆکاتەوە تاکو خوێندنی پێ تەواو بکات‌و یەکەم گۆڤاری ئەدەبیش دامەزرێنێ . حقوقی لە زانکۆی ئەنقرە تەواوکردووە ... ئابووری لە زانکۆی ئەستەمبوڵ ... لەگەڵ زۆربەی کەسانی سینەمایی بەیەك گەیشتن لەوانە سینەمایی بە ناوبانگ عاتیف یەلماز کە هانی‌دا بۆ ئەوەی وەکوو ئەکتەرێ بچێتە سینەما ئەمە ساڵی 1958 بوو کەچی لەگەڵ ئەوەشا هەر بە دانەری سیناریۆو نووسەر مایەوە .



له ساڵی 1961دا چیرۆکی یەکەمی بڵاوکردەوە بە ناوونیشانی (هاوکێشەیەك بە سێ نەزانراو) ئەمەی بۆ بە پروپاگەندەیەکی چەپرەوی دانراو پەل کێش کرا بۆ بەندیخانە بۆ ماوەی (18) مانگ .

دوای تەواوکردنی ئەو ماوەیە ساڵی 1963 گەڕایەوە سەر کاری سینەمایی و پاڵەوانییتی زیاتر لەچل شریتی تایبەتی ی فلیمی ملیۆدرامی بازرگانی کرد کە بنچینەی بەرهەمی فلیمی تورکی پێك هێناوەو ژمارەی ئەکاتە 300 شریت لە ساڵێکا ... لە سینەمای بازرگانیدا پێنج ساڵ ئیشی کردووەو لەو کاتەدا دەرهێنانی ئەخوێندو خۆیشی سیناریۆی ئەنووسیەوە .

لە ساڵی 1968دا کە ئەو لە گەشانەوەی هونەریدا بوو شۆڕشی قوتابیان لە جیهاندا هەڵ گیرساو ئەمەش کارێکی زۆری کردە سەر دەروونی یەڵماز و پاڵی پێوەنا بۆ نووسین و دەرهێنانی فلیمە کۆمەڵایەتیە قووڵەکەی بە ناوونیشانی (بەڕێزهان) ، ئەویش چیرۆکی خۆشەویستی هەڵ گەڕاوەیەو ڕوو بەڕووی دەرەبەگایەتی ئەبێتەوە لە ڕۆژهەلاتی تورکیاو بەغەم و پەژارە کۆتایی پێدێت .

دوای ئەم فلیمە ئەزموونەکانی هەر بەم جۆرە دەڕۆیشت ، وەك فلیمی (گورگەکان برسین) .. ساڵی (1970) فلیمە بە ناو بانگەکەی (هیوا) یەکەم بریتی جیهانی بینراوی بۆ هونەرمەندی تورکی بە دەس هێنا . لە فلیمی هیوادا وازی لە بابەتی یەك پاڵەوانی هێناو پاڵەوانێکی ڕاستەقینەی لە دڵی خەڵکەکەوە بە دەس هێنا تا چیرۆکەکەی بە خۆشی کۆتایی پێ نەیەت وەکو داوا لە سینەمایی میلۆدرامی ئەکرێ .....

ئینجا فلیمی (سبەینێ ڕۆژی کۆتایی یە)ی بەرهەم هێنا ئەویش فلیمێکی پۆلیسی یەو باسی قۆناغی مانگرتنەکەی

ساڵەکانی 1971 — 1972 ئەکات کاتێ تورکیا یەکەم شەپۆلی بەترسی ناسی لەکاتی هەراو هۆریاکەی هێرشی سوپای تورکیا بۆ سەر (قووبرس) . لە ئازاری ساڵی 1971دا یەڵماز بەندکرا لەبەر ئەوەی هانی کۆمەڵە ڕادیکاڵی یەکانی دابوو ، حوکمی دوو ساڵ بەندی بەسەرا بڕا ... لەو کاتەدا دوو چیرۆکی نووسیووەو هەندێ سیناریۆو فلیمی (هەڤاڵ)ی لە دوای دەرچوونی لە بەندیخانە دەرهێنا ، ئەم فلیمەش باسی ئەو دەرکەوتنی دژایەتی یە ئەکات کە کۆمەڵگای تورکیای لە یەك جیاکردەوە ، باسی دوو هاوڕێی کۆن ئەکا کە لە دوو خێزانی جووتیار بوون و هەردووکیان لە شار یەکیان گرتۆتەوە یەکێکیان لافی بورجوازیەتی لێ ئەدا ئەوی تریان هێشتا هەر بە دوای کارەکەی خۆیدا دەگەڕا لە نێوان زنجیرەیەکی پڕ لە دوو دژایەتی چیرۆکەکە بە غەم و پەژارە کۆتایی دێ ...

**لە دوای ئەوە فلیمەکەی تری دەستی پێکرد بەناوونیشانی (دوو دڵی) کە ئەویش چارەی گیرو گرفتەکانی کرێکارانی لۆکە ئەکات لە گوندەکەی خۆی . بەڵام ئەم فلیمەی کۆتایی پێ نەهات چونکە جارێکی تر یەڵماز فڕێ درایە بەندیخانەوەو ئەم جارە بە تاوانبارکردنی بەکوشتنی یەکێ لە فەرمان ڕەوای شارو حوکمی (18) ساڵی بەسەرا بڕا .**

لە بەندیخانەش هەر ئەی نووسی یەوەو بە هاوڕێ یەکانی ئەووت تاکو فلیمەکانی دەربهێنن لەوانەش (زەکی ئۆکتان) کە فلیمی (مێگەل)ی دەرهێناو ناوبانگی جیهانی بەر بڵاوی دەرکردو لە زۆربەی ئێستگە تەلەفزیۆنی یە ئەورووپی یەکان و لە هۆڵەکانی سینەماکان لە پاریس و لەندەن و بەرلین و لە زۆربەی میهرەجانەکانی وولاتەکان پیشان دراو ژمارەیەکی زۆری لە پاداشت بەرکەوت ...

ئینجا فلیمی (دوژمن)ی دەرهێنا ئەم دوو فلیمەش چارەی گیروگرفتە بنچینەیی یە دیاری یەکان ئەکەن بۆ مرۆڤ لە کۆمەڵگایی تورکیدا ئەمەش هەر زەکی ئۆکتان دەری هێناوە کە یەکێکە لە هاوڕێ نزیکەکانی یەڵماز گوناو لە فلیمەکانی دا لەگەڵیا وەستاوەو هەر هاوڕێی بووە بە درێژایی ساڵانی تێکۆشانی ڕامیاری و هەوڵدانی هونەری پێکەوە ... یەڵماز گونای لەو دیو دیواری بەندیخانەوە سیناریۆیەکانی ئەدایە زەکی ئۆکتان .



- ئەنوەر قادر ر[illegible]ید -

# سەرچاوەی هونەر

ئەگەر بێتو بمانەوێ لە دەرگایەکی ئاواڵەکراوەوە و ( بەشێوەیەکی زانستیانە ) بچینە مەیدانی بەرینی هونەرەوە ، ئەوا پێویستە لە بناغەیەکی پتەوەوە دەست پێ بکەین‌و بەو نیازەی ( بەپێی تواناو زۆر بەکورتی ) بتوانین هەندێ لە لایەنە ئاڵۆزەکانی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتی‌یە مەزنە شی ی بکەینەوەو لەو روانگەیەوە هونەرو هونەرمەندانی نەتەوەکەمان هەڵسەنگێنین .

**هونەر بەپێی تیووری رەنگوانەوە « شێوەیەکی خودی‌یە لە واقیعی مەوزوعی » . کەواتە پێویستە لە بنەڕەتەوە پەیوەندی‌یەکانی بەرهەمهێنان‌و شێوەی پەیوەندی‌یەکانی کۆمەڵ دەسنیشان بکرێ‌و جەمسەری گلۆڵە ئاڵۆزەکە بدۆزرێتەوە . پێویستە ئەو راستی‌یەش بزانین کە کاتێ بمانەوێ تیووری هونەر بدۆزینەوە دەبێ مێژووی شیتەڵ بکەینەوە چونکە ( نە تیووری هونەری بە بێ مێژووی دەزانرێ‌و نە مێژوو ەکەشی بەبێ تیووری هونەر دەنوسرێ [1] )** . کەوابێ پێویستە بگەرێینەوە بۆ سەرەتا . سەرەتای پەیوەندی‌یەکانی کۆمەڵ لە بەر رۆشنایی پەیوەندی‌یەکانی بەرهەمهێنانەوە .

هونەر وەك هەموو هوشیاری‌یەکی کۆمەڵایەتی‌تر مێژوویەکی گرێدراوی هەیە بەلایەنەکانی ژیانی کۆمەڵەوە بۆیە پێویستە بزانرێ هونەر لەچی‌یەوە هاتووەتەکایەوە و چۆن بووە بە پێداویستی‌یە کی ژیانی کۆمەڵ‌و ئەو داهێنانە مەزنە لە کوێوە هەڵقوڵاوەو ئەرکی سەرشانی چی‌بووە .

هونەر وەك ( ئاوێنەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی ) ، پاش کارکردن هاتووەتە کایەوە ( مدبەستمان ئەو کارانەیە کە پێویستیان بە ئامیرە ) کە دەڵێین ئەو کارەی ئامێری تیا بەکار دەهات مەبەستمان گۆڕانی شێوەی فسیۆلۆژی مرۆڤە بەو جۆرەی ئیستا هەیەو ، بە پێوە دەوەستێ‌و دەستی بەکار دەهێنێ بۆ دروستکردنی جۆرەها ئامێرو بەردەوامی ژیان . هەرەها وشەو پاشان زمان هاتە کایەوەو بە پێ ی پێویست کێشەی نێوان مرۆڤ‌و سروشت هاتە کایە .

**دەوترێ سەرەتای سەرهەڵدانی هونەرلە سیحرەوە بووە بۆ سەلماندنی ئەم رایەش ئەو سیحرەی لە دەمارەکانی بوونی مرۆڤایەتیدایە ، هەستی ناتوانایی‌و هێزی توانا لە هەمان کاتدا دەهێنێتە کایەوە ، ترساندن لە سروشت‌و توانای زاڵ بوون بەسەریدا . ئەمە گەوهەری رەسەنی هەموو هونەرێکە [2] )** .

بەکارهێنانی سیحر بۆ زاڵبوونی مرۆڤە بەسەر سروشتدا ، چونکە کاتێ خەیاڵ فراوان دەبێ‌و بەهۆی هێماو وشەو وێنەوە دەگات بە گۆرەپانی بەرینی خەیاڵ‌و بە ئامێرەکانی سیحر خۆی نزیکتر دەکاتەوە لە سروشت‌و بە هۆیەوە دەتوانێ ژیانی مسۆگەر بکا ، هێزێکی مەزنی بەرەنگار بوونەوەی لا دەرەخسێنێ . کەواتە مرۆڤ ( بە هۆی سیحرەوەو پێویستوویەتی زاڵبێ بەسەر دەورو بەرو پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەکان [3] ) . ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەتایی ( لە قۆناغی خۆیدا کارێکی مەزن‌بووەو ناتوانین لەگەڵ قۆناغەکانی ئێستادا بەراوردیان بکەین ) ، فێربوونی لەناو خۆیدا حەشارداوەو هەر لەو سەرەتایەوە توانیویە زانیا ری خۆی زیاد بکاو بەرەنگاری دوژمن بێتەوەو پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌یەکانیش بەهێزبکا . کەواتە ناتوانین بە هیچ جۆرێك هونەر ( تەنانەت سەرەتای سەرهەڵدانیشی ) لە پێویستی‌ی مرۆڤ جیا بکەینەوە ، هونەر دیاردەیەکی کۆمەلایەتی‌یەو لە ناو کۆمەڵەوە هەڵقوڵاوەو زانیاری‌یەکانی مرۆڤی زیادکردوە . بە هۆی هاوارەوە توانیویەتی دوژمن بترسێنێ‌و سەماو ( طقوسە ) تایبەتی‌یەکانی وای لەمرۆڤی ئەو سەردەمە کردوە کە بە خەیال بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵ‌بێ‌و خەیالیش ( وەك رەنگدانەوەی واقیع ) زیاتر توانیویەتی پەرە بە هێزی مرۆڤ بداو مافی مانەوەو بەردەوامی‌ی ژیانی بۆ مسۆگەرتر دەکا . نەخشەکێشان‌و وێنە نەخشاندن جۆرێك بووە لە فێرکردن ( کاتێ وێنەی درندەیەکیان کێشاوە توانیویانە زانیاری خۆیان لە بارەی ئەو درندەیەوە زیاتر بکەن [4] .

لەلایەکی ترەوە دەوتریّ هونەرو بنەرەتی سەرهەلّدانی لە ( یاری ) یەوەیە ئەم رایەش بە ئاسانی رەت ناکریّتەوەو بەو شیّوەیەش بنیاد نانریّ وەك ( شیلەر ) و ( کانت ) خستوویانەتە قالبی فەلسەفەوەو لەکارو پیّویستی ژیان دوورەپەریّز گرتوویانە ( وەك راکردنیّك لە ولاّتی دەستوورو یاسای پیّویستو نوقوم بوون لە تەرمایی ناوەوەی خودی مرۆڤ ) . بناغەی پتەوی هونەر لاسایی کردنەوەی واقیعە . رەنگدانەوەی واقیعە لە خودی مرۆڤدا ( بەهەموو پەیوەندییەکانی ژیانییەوە ) . بەلاّم نابیّ ئەوەمان لەیاد بچیّ کە لە سەرەتادا مرۆڤ مەبەستی تیّگەیشتن بووە لە بەرانبەرەکەی ( سروشت ) بۆ زالّبوون بە سەریدا ، نەك تیّگەیشتنو شیتەلّدنی خودی ، چونکە پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان لەوە سەرەتایی تربوونکە پەیوەندی بەرهەمهیّنان دەکا . مەبەست لەسەرەتاوە یوونو بەردەوامیی ژیانبوو ، پەیوەندی بەکارکرنو ژیانی مرۆڤەوە هەبوو ، هۆی طقوسی تایبەتییەوە ویستوویانە ئاژەلّو گیانەوەرەکانی تی راکیّشن بۆ ئەو جیّیەی تیا ژیاون ( بەهۆی لاساییکردنەوەی گیانەوەرەکەوە ) تەنانەت ( ئەو خەتو خالّو کوتاندنو بەکارهیّنانی خۆجوانکردنانەش بۆ ترساندنی دوژمنو خۆپاراستنبووە لە میّشو مەگەز[5] ) . کەواتە هونەر لە بنەماوە پەیوەندی بە ژیانی کۆمەلاّیەتییەوە بووە ، هەر ئەو پەیوەندییەش وەك پیّویست هیّناویەتییە کایەوە . دەبینین لە ناوچەیەکدا جۆریّك گیانەوەر یان رووەگ خۆراکی سەرەکیی ئەوانە بووە کە تیایدا ژیاون ، پاشان ( دوای چەند قۆناغو پەرەسەندنو بارگۆرینی پەیوەندییە ئالۆزەکانی کۆمەلّ ) هەر ئەو گیانەوەرە بوە بە ( تۆتەم[6] ) ی وەچەی داهاتوویانو کۆمەلّگای تۆتەمیی بە هۆی قوربانیو پەرستنی تۆتەمی تایبەتی خۆیانەوە ( وەك فیلّیّك ) توانیویانە ئیسراحەت بە دلّی خۆیان بدوەنو بەهۆی خەیالّیشەوە بگەن بەو ئەنجامەی کە ناتوانن بە زەبری هیّز ئەنجامی بدەن . تەنانەت ئەو وەچەیەی تۆتەمی هەبووە وای زانیوە رەچەلەکی رەسەنی خۆیان لەو تۆتەمەوە دەستی پیّکردوە . لیّرەدا دەمەویّ هەندیّ لایەن لە بیر نەکەین لە کاتی باسکردنی سەرەتای سەر هەلّدانی هونە ، لەراستیدا زانستو ئاینینو رەشت وەك دیاردەی سەربەخۆ دەگەریّنەوە سەر هەمان سەرچاوەو پەیوەندییەکی دیالیکتیکی لە نیّواندیانا هەیە . هەر وەك چۆن قۆناغە ئالوگۆڕ کەرەکانی کۆمەلّیش ئالۆزو بەیەکا چووەو ناتوانین بلّیین لە قۆناغی کشتوکالّدا راوکردن نەماوە ، یان راوکردنی سەرەتایی لە قۆناغی راوکردنی پیّشکەوتووتردا نەماوە ، نەلّکو چەند هۆیەکی تر هەیە ئەمانەی بەیەکەوە بەستوەتەوەو هەمووشیان بە هۆی میّژووی کۆمەلّگاکانەوە لە یەك جیا دەکریّنەوە . بۆ نموونە دەبنیین ( تۆتەم ) سەرەتایەکی زۆر کۆنی ئایینییەو لەو طقوسە تۆمیانەدا سەمای تایبەتی کراوەو لاساي گیانەوەرە سروشتییەکان کراوەتەوەو بەو نیازەی بتوانن هەمووشتیّ لە بارەی تۆتەمەکەیانەوە بزانن ( لە قۆناغي خۆیدا بۆ ئەوەی بتوانن راوی بکەن ) بەوە گوزەرانی ژیانیان باشتربووە ، هەمان گیانەوەر کە سەرچاوەی ژیانیان بووە ( پاش چەند قۆناغیّك ) بووە بە هیحایەکی پیرۆزد بووە بە تۆتەمیانو پاشان سیحری لیّ پیّك هاتووە لەسەر ئەو بیرەی ( ئەگەر بەخەیالّ بتوانیت زالّبیت بەسەر واقیعدا ئەوە بەراستی دەتوانی بەسەریدا زالّبیت ) کەواتە سیحر ( وەك بەلّگەی کارکردن راستییەکی بەنرخمان بۆ دەسنیشان دەکا ، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بە هۆی هەلّویّستی خۆیەوە دەتوانیّ واقیع بگۆڕیّ ) . ئەمەشیان کۆلّەکەیەکی پتەوی ترە دەخریّتە پالّ سیحر کە سەرەتای سەرهەلّدانی هونەر بووبیّ .

ئەستاتیکای ئەو قۆناغە قالبیّکی تایبەتیی وەرگرتبووبەو شیّوەیەی رژیّمەکەی لەسەر بنیاد نرابوو . کۆمەلّگا بوو بوو بە دووبەشیی سەرەکییەوە ( سەربەست ) و ( کۆیلە ) ، کۆیلە بە مرۆڤ دانەدەنرا . بەلاّم سەربەستەکانیش بوو بوون بە چەند چینیّکەوە . راستە توانای مرۆڤ بە سەر سروشتدا سەرکەوت وەك دراکۆمیّر ئەسنیّوف دەلّیّ ( مرۆڤ لە نیّچیری چارە نووسەوە بووبە سەرکردەو گەورەی سروشت[12] ) . بەلاّم کیّشە مەزنهخکەی مرۆڤایەتی هەر لەم قۆناغەدا هاتە کایەوە لە نیّوان مرۆان مرۆڤو مرۆڤ ، سەربەستو کۆیلە . کاتیّ بازرگانیو کشتوکالّ پەرەیان سەند . ئە وتیرەو هۆزانەی لە جەنگدا هیّرشیان دەبرایە سەرو هەندیّکیان لیّ دەگیراو دەکران بەکۆیلە پەیوەندی کۆیلەو خاوەنەکەی بەم شیّوەیە بوو ( کۆیلە مولّکی تایبەتی خاوەنەکەی بوو ، دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی رەفتاری لەگەلّ بکا ، کۆیلە هیچ مافیّکی شارنشینی ( الحقوق

المدنية ) نی‌یه . خاوه‌نه‌كانیان ده‌توانن به ئاسانی بیانكوژن بێ ئه‌وه‌ی هیچ سزایه‌ك بدرێن . ئه‌مه وای كردوه كه خاوه‌نه‌كانیان په‌نا به‌رنه به‌ر سزاو ئازار دانیان‌و به‌و شێوه‌یه تواناو هێزیان نه‌ده‌ما ، ئینجا كه كه‌لكیان نه‌مایه ده‌یانكوشتن‌و كۆیله‌ی تریان ده‌خسته جێگایان . كۆیله‌شیان له رێی جه‌نگه‌وه زۆر ده‌ست ده‌كه‌وت بۆیه هه‌میشه واگیركردن به‌رده‌وام بوو [13] ) .

هـونه‌ری ئـه‌م قۆنـاغه زۆر قـه‌رزاری كۆیله‌كـانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌یه ، بۆ نموونه ئه‌و شانۆ گه‌وره‌و په‌رستگا نـایابـانه ئه‌نجام نه‌ده‌درامه ئه‌گه‌ر شان‌و قۆڵی كۆیله‌كان نه‌بوایه ، یان ئه‌هرامه‌كانی میسری چۆن بنیاد ده‌نرانـه ئه‌گـه‌ر هه‌زاره‌هـا كۆێنی خۆیان به سه‌ردا نه‌رشتایه . به‌ڵام ئه‌مه وا ناگه‌یه‌نێ كه سه‌ربه‌كان یه‌كسان‌بوون ، به‌ڵكو به پێچه‌وانه‌وه ئه‌مـانیش له چه‌ند چینێـك پێك هـاتبوون ( هـه موو گـه ل كرابـوو به سێ چینه‌وه) ( بێ ئه‌وه‌ی هیچ گرنگی بده‌ن به تیره‌و هۆزو فراتیر ) چینی یـه‌كه‌م بـه‌گزاده eupatrides ( النبـلاء ) و چینی دووه‌م چێنـه‌ران yeonores ( الزراع ) و سێ‌هه‌م كـارگه‌ران demiuryes ( الحرفیین ) . هه‌رو ها به‌گزاده‌كانه ده‌یـانتوانی له هــه‌موو كارێكی میریدا كار بكه‌ن [14] ) .

**له پێناوی به‌رژه‌وه‌نـدی تایبـه‌تی چینی به‌گـزاده [ ( خـاوه‌ن كـۆیله ) ئـه‌وانـه‌ی بـه هـۆی جـه‌نگـه‌وه ( عه‌سكه‌ری‌یه‌كان ) یـان پیاوه ئـاینی‌یه‌كـان ] هونـه‌ر ته‌رخانه‌كرا بۆ به‌رگـری له‌و به‌رژه‌وه‌نـدیانـه‌و ده‌بنین سه‌ركرده‌كانی سوپـا ئه‌و پـه‌ڕی گرنگیـان پێ ده‌دراو بۆ ستایش‌و پیاهه‌ڵدانیان به‌یت ( ملحمة ) هاته كایه .**

پـاش گـۆڕانكـاری له چـۆنـایـه‌تی پـه‌یـوه‌نـدی‌یـه كۆمه‌لایه‌تی‌یه‌كان‌و گۆڕانكـاری له شێوه‌ی بـه‌رهـه‌مهێنـان له هه‌مان قۆناغدا شێوه‌ی تیا گۆڕرا . گۆڕانكاری‌یه‌كی مه‌زن هاته كـایه‌وه . گیـانداره‌كـان گـۆڕرانـه‌وه بـه شێـوه‌ی مـرۆڤ . خواوه‌نده‌كان به پێی گۆڕانكاری بیری نوێ شێوه‌ی مرۆڤیان وه‌گرت‌و نه‌زرو قوربانی ( به‌شێوه‌ی پێویست ) هاته كایه‌وه‌و خواوه‌نده‌كان ره‌وشتی مرۆڤیان وه‌رگرت‌و هـونه‌ری كـلاسی‌ی سه‌ری هه‌ڵدا .

نیگار كێشان‌و پـه‌یكه‌ر تـاشی‌و شانـۆی ئه‌م سـه‌رده‌وه شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی وه‌رگرت بۆ ناوه‌رۆكێكی جیاواز ، چـونكه رێبازی ( ره‌مزی كۆنی ئایینه‌كان ) گۆڕانكاری‌یه‌كی ئه‌و تۆی تیابوو كه پێویست بوو بابه‌تی هونه‌ر به تاكه كه‌سی واهێنه‌ر ( له كۆمه‌ڵ دانه‌بچڕاو ) بگۆڕێ بۆ ناوه‌رۆكی نوێ كه پێویستی به شێـوه‌یه‌كی نـوێ هه‌یـوو پێ‌ی ده‌ربڕێ . ئـه‌ویش هونـه‌ری كلاسی‌ی بوو . چونكه به‌یته‌كانی هۆمیرۆس‌و شیعری هیسێودو چیرۆكه‌كانی ئیزۆب نه‌یانده‌توانی شان‌به‌شانی قۆنـاغی نوێ برۆن .

هیوادارم له نووسینێكی تردا بتوانم ( به‌پێی توانـا ) هه‌ندێ له رێبازی كلاسی‌ی بدوێم له‌سه‌ر هه‌مان بناغه‌و رێبازو له هه‌مان روانگه‌وه .

### سه‌رچاوه‌و په‌راوێز

1 — اسس علم الجمال الجزء الاول تعريب الدكتور فؤاد مرعي ل10
2 — الفن والاشتراكية تأليف ارنست فيشر ترجمة جورج طرابيشي ل55
3 — معجم علم الاجتماع تحرير البروفسور دينكسن ميشيل ترجمة احسان محمد الحسن ل101
4 — اسس علم الجمال الجزء الاول ل310
5 — هه‌مان سه‌رچاوه ل311
6 — تۆته‌م ( Totem ) گیانه‌وه‌رێكه له شێوه‌ی گیان‌له‌به‌ر یان رووه‌ك یان به‌شێك له گیان له‌به‌ر یا رووه‌ك ، كه‌واته بوونه‌وه‌رێكی سروشتی‌یه یا دیارده‌یه‌كی سروشتی یان هێما ( ره‌مز ) ی ئه‌و شتانه‌یه كه ده‌بن به روخساری تایبه‌تی هه‌ندێ كۆمه‌ڵنشین له كۆمه‌ڵگایه‌كی دیاری كراودا ( معجم علم الاجتماع ل300 )
7 — اسخيلوس واثينا تأليف جورج طومسن ترجمة صالح جواد الكاظم ل21
8 — الفن والحرية تأليف هونور اروندل ترجمة حسن الطاهر زروق ل11
9 — اسخيلوس واثينا ل419
10 — الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور جورج كونتينو ترجمة سليم طه التكريتي وبرهان عبد التكريتي ل348
11 — ملحمة گلگامش طه باقر
12 — الادب وقضايا العصر ترجمة عادل العامل ل63
13 — لمحة عن تطور المجتمع منذ بدء التأريخ ل19

# لەنەریتە کۆنەکانی کوردەواری

## ژن بە ژنی ...

لە کۆنی زەمانەوە ژن بەژنێ زۆر باوی هەبوو لە ناو کوردەواریدا وە هەتا بەشی سێیەمی سەدەی بیستەمی زایینی لە زۆربەی زۆری دێهاتەکانی کوردستاندا پەرەی سەندبوو .

هەموومان باش دەزانین کە گەلێك باوكو براکان کچ یان خوشکی خۆیان بەژن بەژنێ نەبووایە نەیان دەدا بەشوو لەو سەردەمەی باسی دەکەین هۆی هەرە گەورەی ئەو رەوشتەش ساکاریەتی کۆمەڵو بێ سامانی یەتی بوو ... وە پاش رێکەوتن بۆ ژن بە ژنێو گواستنەوەی بووك زێڕو جلو بەرگی جوانو کەلوپەلی ناو ماڵ بە پێی توانا ئامادە دەکرا ، ئاهەنگی شاییو هەڵپەرکێ حەوت شەوو حەوت رۆژ دەگەڕا ، لە هەر دوو لادا هەر لایەك لە خزمو کەسو کارو ناسیاوانی دێهاتەکانی دەوروبەری دێی خۆیان دەگیراوە ، واتە دەعوەتیان دەکردن بۆ بەشدار بوون لە ئاهەنگی ژن هێنانو گواستەوەی بووك ... وە لە رۆژێ بڕیار دراودا بۆ گواستنەوەی بووك چەند سەر مەڕو

## چیرۆکی فۆلکلۆری

تۆمارکردنی عباس عبدالله یوسف

چیرۆکی بازێرۆکی ، نیسكو نۆکێ نیسك چوو ، کورەکی بوو لە کێ دێ ، لە ناو دەرێ ، چ پێ دادەن ، جلی کەرێ ، چ ناو لێنێن حوتك موتك چ بەردەنێ ، سەوتوتك ، قەلەك هات تێ رووهات بردیە شکەوتا تاری تاری ، تێی دابوو میری شاری ، میری شاری ، حمبەربوو ، پێنسەت سواری لە دووبوو ، هەمووی کۆرەو کەچەربوو ، پیرەژنا پەلنگەکی هەراتە سە سنگەکی ، خەراپی کرد گوندەکی ، لەسە قوتکە بەنەکی کیسەر هەربەزێیو کوننێ ، پەتورکی گۆتۆ ژننێ ، وەدەوە قوتە رممێ ئەچمە دورێ هەرزانە ، ئەکوژم نێریو بەرانە ، سەرو پێچك لۆجیرانە دونگو مەڕ لۆ مێوانە ، دایکێ ئەگۆ هاوار لەمن ، خۆشکێ گۆ سراو لەمن ، بکوژن سەیی مەزن ، ئەحمەد بەگو زێرین بەگ ، هەردوکیان پیاوی چەلەنگ ، لە برباسیان کردە دەنگ ، (برباس) هاتن پەقونجی شەرە لەسەر برنجی ، ئەحمەد بەگی هاوارکرد ، چەخماخی لێ سوارکرد سەتو پێنجەی مردارکرد ، دایکا دنیا دینکردی ، هەسپێ خۆی لۆزین کردی

( کارکم دڕا چم پێ نەبرا )

تێبینی / 1 – ئەم تێکستە لە گوندی (جۆنەلە) ی سەر بە ناحیەی خەلیفان تۆمارکراوە

2 – ئەم چیرۆکە بۆ منداڵان دەوترێو بە نزمە ئاوازێکی زۆر خێرا

3 – ئەم چیرۆکە سەرواداره (قصة مقفاة) .

فەرهەنگۆك

---

کێ دێ = لە کوێوە .
تاری = تاریك
حمبەر = ناوی کەسێکە ، رەنگە (عومەر) بێت
پە = بە
پێنسەت = پێنج سەد
لە سە = لە سەر
کە چەر = کەچەڵ
قوتکە بەنەکی = پارچە بەنێك
کیسەر = کیسەڵ .
هەربەزێیو = چووە
وەدەوە = بمدەرێ
دۆرێ = دۆڵ
برباس = (بلباس) ناوی هۆزێکی کوردە
چەخماخی لێ سوارکرد = تفەنگی لێ سوارکرد
هەرات = هەلات ،
کوننی ، ژننی ، رممی = کون ، ژن ، رم
سە = سەگ
کارك = جۆرە پیلاوێکی زۆر کۆنە ، جاران لە کوردەواریدا لە پێستەی رەشەولاغ ( گا ، چێل ) پاش خۆش کردنی دروست دەکراو لە پێ دەکرا .



● مولود بێخاڵی ●

پەرەوور دەکوژرایـەوە بۆ چێشتی بـووك ... دەستە دەستـە پیاوان نانیان دەخواردو ئافرەتێکی زۆر بـەشدار دەبـوون بۆ لێنانی ئەم چێشتـەو برنـجو ڕوونێکی زۆرپێشرو ئـەم چێشتە تەرخان دەکراو دووکەڵی ئاگری چێشت لەگەڵ تۆزی سواران تێکەڵ دەبوو وەك تەمی باران بەری ئاسمانی دەگرتو دایكو باوکی زاوا لەگەڵ خزمو کەسانی چاوەڕێی هاتنی بووکیـان دەکرد ، وە ئەگەر بووك بەبێ تەنگو چەڵەمە بگوزرابایەوە دایکی زاوا بە سەماکردن پێشـوازی بووکی دەکـرد . لە دەستەکی کەوگیری چێشتی هەڵدەگرت ، وە لە دووەمیش گەسکی ناو ماڵ بە مانای ئەوە هەردەم خۆم خواردنتان بـۆ ئامـادە دەکەم وە نـایەڵم نـاو ماڵیشتـان پیسبێت . ولەهـەمـان کـاتـدا بـووك دەرازرایەوەو جلو بەرگی بووکێنیو تارای بووکێنی یان بەسەر دادەدا بارگەو کەلو پەلی ناو ماڵ دەپێچرایەوەو بـە کۆتـایی هاتنی لەدارو دەستەکی بووك وولاغێکی ئەمینو خۆشڕەو بە ڕێشمەی گوڵینگەدار وەك بوك بۆ بووکەکە دەرازانـدرایەوە ، سـواران چوار دەوری بـووکیان دەداو دەستیـان دەکرد بـە مەشقی سوار سوارانێو تۆز بەری ئاسمانی دەگرتو خۆشیو پێکەنین لەسەر لێوی هەموو بەشداران جیاواز نەدەبـوەوە جا دەست دەکرا بەڕۆیشتن بۆ شوێنی دەست نیشان کراو بۆ بووك گۆڕینەوە . ئەو کات هیچ ژنێك لەگەڵ بووك نەدەچوو تەنیا بەر بووك نەبێت . جـار جاریش وا دەبـوو خوشکـە بچکۆلەکـەی خـۆشەویستی بـووك بەشـدار دەبوو لەگـەڵ بـەربـووك کـە دەگەیشتنە جێگای دیار کراو بۆ بووك گۆڕینەوە دەستیان بـە شاییو هەڵپەڕکێ دەکرد لە جوانترین شوێنی نێوان هەردوولا . لە پاشان وورده وورده خۆیان بـۆ گۆڕینـەوەی بووك ئـامادە دەکرد . ئەو کاتە کاتێکی زۆر ناسكو ناڵەبارەو خوا دەزانێت چی ڕوو دەدات هەر لایەك بووکی خۆی بە هەنگاوی ژمار دراو بەرەو پێشەوە دەبا تا ڕوو بە ڕووی یەکتر ڕایان دەگرتن ئەو کاتە یەکێ لە پیاوانی کار پێ سپێردراو لە هەر لایەکەوە دێتو هەوڵ دەدا بووکی خۆی وەرگرێت . زۆر جـار لەو کاتـەدا لە نێوانیاندا دەبوە مشتو مر . ئەویان دەیەوێت پێش بووکی خۆی وەرگرێت ، ئەوەکەی تریش دەڵێت تۆ هەنگاوێکی تر بووکی خۆت بێنە پێشترو تەسلیمی بکە تا بووکی خۆت وەرگریت ، کاتێکی زۆر دەبرایە سـەر بۆ ئـەم ئاڵو گـۆڕیە . لە ئـەنجامـدا نە دەگەیشتنە هیچ تەنیا توندی قسە نـەبێت ... وە لە قایمـەی

قسەدا لاوانو پیاوانی ئـامادە بـوو هەر کـۆمەڵێـك پـاشتو لایەنگیری ردێن سپی خۆی دەکرد دەمـە قاڵێ لە نێـوانیانـدا دەگەیشتە دەمەتەقێی ناکۆك ، هـەستی هەر دوولا بـریندار دەبـوو دەگەیشتـە شەڕە دەست . چـەند میملێـك لە نێـوان هەردوولا ئەوەیـان بە هـەل دەزانیو ئەو شـەڕە دەستەیـان دەکەیاندە شەڕە چەك خۆشیو شاییو زەماوەند ئەبوو بە ئازارو ناخۆشی . بووکیان بە هەناسە ساردیو بە فرمێسکی چاو بەرەو ماڵی باوکی دەگێردرایەوە . بەڕاستی ڕەوشتێکی ناکۆكو ئاڵۆز بوو ، بچێتو نەگـەڕێتەوە . چـونکە گـەلی جاریش ئـەنجامی شەڕەکە دەگـەیشتە زامـداریو کوشتنو چـەند زەلامێـك لە هەردوو لا لەناو دەچوو لەسەر چیو بەهۆی چی ؟ . چونکە ژن هێنان هۆیەکی گەلێ گرنگە بۆ تێکەڵاو بوونی دوو بنەماڵە نەك ناکۆکی .. هەر وەکو باوە لەناو کوردەواریدا خزمت کێیـە ؟ یەکسەر وەڵام دەداتەوە « هێشتا ژنم نەهێناوە » بۆیە ئەبێ ئەم ژن گۆڕینەوەیە ببێتە هۆی بەتین کردنی دوو بنەماڵە نەك ببێتە تەگەرە بۆ خراپ کردنی چەند ماڵێكو پەیدا کردنی دوژمنایەتی لەنێو دوو عەشیرەتی ناوچەکە وە دەبێ ژن گواستنەوە ببێتە هۆی بەتین کردنی برایەتیو خزمایەتی بۆ ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکەو پەرەپێدانی نەك کاول کردنی چەند بنـەماڵەیـەكو تێکدانی برایەتی دانیشتوانی چەند دێیەك ئەبێ ئەم جۆرە ژن هێنانە ببێتە ئاڵقەیەك دوو بنەماڵە بیگەیێنیتە یەك بۆ هێنانە دێی گەلی ئامانج بۆیە پێـویستە هـەر کۆسپێـك لە ڕێگای ئـەم ژن هێنانەدا هەبێت لە ڕەگو ڕیشەدا هەڵبکێشرێت . وە بـەهۆی بڵاوبوونەوەی شارستانێتی ، ئەم کارەساتانەی باسمان کرد بەرەو نەمان چووە .

ئێستاکە بووك گواستنەوەو گۆڕینـەوە گەلێـك جیاوازی هەیە لەگەڵ سالانی کۆندا بۆ گۆڕینەوەو گواستنـەوەی بووك چەند ئۆتۆمۆبیلێك ڕیـز ئەکـرێتو یەکێکیـان دەرازاندرێتـەوە بەنەخشو نیگاری جوانو تارای زەردوو سووری پێوە دەکەن کە نیشانەو مانای ئەوەیـە ئەم ئـۆتۆمـۆبیلە هەڵگری بووكو زاوایە ... ئینجا خزمو دۆستانی بووكو زاوا بە ژنو پیـاوەوە بەشداری زەماوەندی گواستنەوەی بووکەکە دەکەن بەهەستی ئەوەی کە ئەم تێکەڵاویە دەبێتە هـۆی تێکەڵاو بـوونی منداڵی

هەردوو بۆیە پێویستە هەموومان هەوڵ بدەین ئەگەر پاش ماوەی کارەساتی ژن بەژنی مابێت لە ناوی ببەین ئەمەش بەدانان بەمافی ئافرەتە لە چوارچێوەی کۆمەڵدا بۆ ئەوەی بتوانێت زاڵ بێت بەسەر هەموو مەترسی یەکی ژیانە .

---

# بەلـــــوورە

**لە زۆرمان ئاشکرایە کە زۆربەی دانیشتووانی ناوچە شاخاویەکانی کوردستان بەتایبەتی دانیشتووانی ئەو شارو دیهاتانەی کە دەکەونە دامێنو نیزیک شاخە بەفراویەکان ـ بەلورە زۆرباش دەزانن .**

بەلورە نیشانەی بەهارە لە کوردستان پاش ساردو سەرمای سەختی زستان کە بەفر دەیەوێت بتوێتەوە رەنوی لەدۆڵەکاندا دەست بەهاتنە خوارەوە بکات شیوو روبارەکانی ناو دۆڵە بەفراویەکان سەریان بەکەڤ سپی ی شەپۆلی ئاوی بەفرین دادەپۆشن لوتی بەفری رەنوەکان هەڵدەلوشن و دەیکەن بە ئاو لەهەمان کاتدا ناوچە بەفراویەکانیش قان ـ قان (یان پارچە ـ پارچە) ی رەشیان لێ پەیدادەبێت پێ ی دەڵێن بەڵەکایەتی لەو قانانەدا پێش زەویەکانی تر گوڵو لالەزار دەست بەشینبون دەکەن وە لەگەڵ گەزنگی رۆژی نەورۆزدا هەست بە گۆرینی وەرز دەکرێن ، هەوا خۆش دەبێت ، بەفر روو لەتاوانەوە دەکات ، دەستە دەستە کچو کوری ئەو شارو دێهاتانەی کە دەکەونە ناوچە شاخاویە بەفراویەکان خۆیان ئامادەدەکەنو بە جوانترین بەرگ خۆیان دەرازێننەوە بۆ کۆکردنەوەی رێواسو گیزبەلەو جەوروکەو سی ی بسکولە . وە هەرکە گەیشتنە هەرێمی تایبەتی هەریەک لەوان خەریکی کۆکردنەوەی بەرکەوتوی نوی دەبێت پەرتەی لێدەکەن هەریەک بەلایەکدا دەروات خول دەخونەوە بۆ ئامانجی خۆیان . بەراستی ئەو کاتە جوانترین وێنەی دیمەنی ناوچەکان دەرئەکەون چونکە کچو کور بە جلو بەرگی زەردو سوور تێکەڵاوی سەوزایی زەویو شینایی ئاسمان دەبن وە کەلەیەك بەرز دەبن دەستدەکەن بە گوتنی گۆرانی لەسەر شێوەی بەلورە .

**بەلورە بریتیە لە دانانی هەردوو ئانگوستی گەورەی دەست لەسەر قورگ وەگێرانی نزمە گۆرانیەکی تایبەتی بەم جۆرە هەمویان ووردە ووردە کۆدەبنەوە بۆ گەرانەوە بەرەو ماڵ پاش رابواردنێکی خۆش لەناو گوڵو گوڵزاری داوێنی چەشمانی چیا .**

بە ئاهەنگی شایی و مەیلانە وە کە خور روی بەرەو ئاوابونکرد بەرەو ماڵ دەگەرێنەوە . وە گێرانی ئاهەنگی بەلورە تەنانەت نەبەستراوە بەس بەناوچە شاخاویە بەفراویەکان بەڵکو لە زۆرترین هەرێمی ناوچەکانی شارو دێهاتی کوردستاندا هەیە هەر هەرێمێك بە شێوەی تایبەتی خۆی گوتمان لەناوچە شاخاویە بەفراویەکان رێواسو گیزبەلەو جەوروکەو سی ی بسکولە کۆدەکەنەوە وە لە ناوچەکانی تریشا کەنگرو ترشۆکەو پیفۆکوو سەوزایی تری وەرزی بەهار کۆدەکەنەوە زۆرجار کچو شۆخانی هەرێمی خواروی شاخان کە دەگەرێنەوە دەبینین هەریەکێك رستەیەك گوڵو گوڵزاری رەنگاو رەنگی بەهار لەسەر سەری خۆیاندا دائەنێن وە کورەکانیش رستەی پیفۆکی سپی کراو وەك خەریتەی فیشەك لەسەر شانەوە بۆ ژێر باڵ دەی ئاڵێنن ، چەند رۆژێکی بەهار بەم جۆرە ئەبەنە سەر لەدوری هەموو کەموو کورتیەك

بەلام بەداخەوە بلاوبونەوەی شارستانیەت ئەو خووە جوانانە ووردە ووردە بەرەو نەمان دەبات بەڵکو لەزۆر لە ناوچەکانیشدا نەماوون . هەرچەندە شارستانیەت سوودی هەیە بۆ پێشخستنی مرۆڤایەتی ئەگەر بێتو روشنبیرانو نووسەران ئاگادار نەبن کە لێ خورەووشتی جوان لەناو دەچێت بۆیە پێویستە هەریەکێك لەسوچی خۆیەوە هەوڵبدات بۆ وەبیر هێنانەوەو بوژانەوەو ژیاندنەوەی ئەو رەووشتو نەریتە کۆنانەی کە بەلای میللەتەوە پەسندن



# هەندێ یاری فۆلكلۆری

# كە لە كوردستاندا باوبوون

عبدالله بابە علی

كوردستان هەر لە كۆنەوە جێگاو مەڵبەندی یاریو وەرزش بووە ، چ لە كاتی راوكردنو چ لە كاتی پاڵەوان بازیو ... هتد هەر وەها لەبەر درێژی پشووی زستان ، هەندێ یاریی فۆلكلۆری تا ئێستاش هەر باون كە والێرەدا هەندێكیان باس دەكەین . ئەم یارییانە لە زۆربەی ناوچەكانی كوردستاندا هەنو هەبوونو دەكرێو كراونو هۆیەكەش دەگە ڕێتەوە بۆ ئەوەی كە خوێندنی (مەلایەتی) لە زۆربەی دێیەكانی كوردستاندا هەبووەو (فەقێ) دەوری هەبووە چونكە فەقێكان بە دوای خوێندندا گەڕاونو لە گەڵ خۆیاندا ئەم یاری یانەیان گەیاندوە بەو ناوچانەی كە چوون ...

**١ – یاری (قاشوانێ) شەقان** : ئەم یارییە لە زستانو سەرەتای بەهاردا دەكرێ بە زۆریش پاش باران . خەڵكی دێ ئەوانەی كە دەیانەوێ یاری بكەن هەر یەكەیان دارشەقی خۆیان بە دەستەوە دەگرنو لە گۆرەپانێكی نزیك دێ كۆ دەبنەوەو لە نێوان خۆیاندا دەبن بە دوو بەشەوە ، مەرجیش نیە هەر دوو بەشەكە وەك یەكبن .

دوو كەس وەك دەم سپی تەڕو وشك هەڵ دەدەنو كاملا بردیەوە ئەولایە (گۆ) دەكەوێتە لای . بە ئەمسەرو ئەو سەری گۆرەپانەكە دەوترێ سەر (هۆڵ) . لە هەر سەر هۆڵێك زەلامێكی لێهاتو باشو یاری.كەر دادەنێن بۆ پارێزگاری سەر هۆڵ . یەك دوو كەسی تریش كە لەش سوكو زۆر بەزبێت لای راستو چەپ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە هۆڵ سەر هۆڵ بكەن پێیان دەڵێن بن هۆڵ .

یەكێك لە بن هۆڵەكە یەكەم جار لە گۆیەكە دەدات ... بەم شێوەیە یاری دەست پێ دەكاتو ئەم یارییەش مەترسی زۆرە . جاری واهەیە سەری تێدا دەشكێو پێ لە چێ دەچێو دەشكێ ، چونكە گۆیەكە لە دار دروست دەكرێ . بۆیە یاری كەرەكان دەبێ زۆر بە ژیرانە یاری بكەن تا گۆیان پێ نەكەوێت یا دارشەقیان بەر نەكەوێتو ئازاریان بدرێو ئازار بدات ....

لە كاتی یاری كردنداكاملا هۆڵیان كرد ئەولایە بردویەتیەوەو خۆی بەسەركەوتو دادەنێ ، هەڵدەستن چێ گۆركێ دەكەنو دوو بارە یاری گەرم دەبێت ئەختیارو پەك كەوتەو جارواش هەیە ئافرەتو مندالانیش لە دەورو بەریان رادەوەستنو تەماشای یاری كەران دەكەنو كیژۆلانیش جار



جار وەك تەماشاکەر لە لایەکەوە رادەوەستن . کە یاری تەواو دەبێت ، هەرکەسە روو لە ماڵی خۆی دەکاو شەویش لە گوێ ئاگردانەکان دەگێردرێتەوە .

**2 – یاری تۆپی دەست** : ئەم یارییەش هەر لە پشووی زسنان سەرەتای بەهاردا دەکرێو تۆپێك لە لباد دروست دەکرێو بە بەنی موو بە (شوژن) جوانو پتەو دەدوورێو پڕ دەست دەبێت . پاش باران خەڵکی دێ روو لە گۆرەپانێکی قەراخ دێ دەکەنو دەبن بە دوو بەشەوە ، هەر بەشەیان مەرج نیە وەك یەكبن . کاملا بردیەوە لە تەرو وشکەکە ئەو لایە تۆپیان لە دەستدا دەبێت هەڵدەستن بە دارێکی تیژ بازنەیەك هەڵدەقەنن بازنەکەش دەبێت ئەوەندە گەورەبێت کە تۆپ هەڵدەدەن بگاتە ئەوسەرو نەگات ، ئەویش بۆ ئەوەیە کە ئەوانەی کەوتوونەتە ناو بازنەکە بتوانن توپ لەوانەی دەرەوە بگرنەوە .. دەست دەکرێ بەیاری کردن . ئەوانەی تۆپیان پێیە لە دەرەوەی بازنەکە دەبنو ئەوانەی تر لە ناو بازنەکە دەبن . ئەوانەی دەرەوەی بازنەکە تۆپ بۆ یەك هەڵ دەدەنو ئەوانەی ناوەوە هەوڵ دەدەن تۆپەکە بگرنەوەو بیخەنە دەست خۆیان ... خۆ ئەگەر هاتو چەند جارێك ئەوانەی ناو بازنەکە نەیان گرتەوە یەکێ لە وانەی دەرەوە بە هێزو توانای خۆی تۆپێ ئاراستەی یەکێ لە وانەی ناو بازنەکە ئەکاتو کور ئەو کەسەیە کە نەهێڵێ تۆپی پێ بکەوێتو خۆی لە بەر لابەرێ ، چونکە ئەوەی تۆپی بەر دەکەوێت سەرەڕای ئەوەی کە ئازاری دەبێت ، هەموو یاری کەرانو تەماشاکەران گاڵتەی پێ دەکەنو پێی پێ دەکەنن . بۆیە دەبێت یاری کەرەکانی ئەم چەشنە یارییە زۆر ژیرو ئاگاداربن ... ئەگەر هاتو یەکێ لە یاری کەرەکانی ناو بازنەکە لە ئاسمان تۆپەکەی گرتەوە ، ئەوا تۆپ دەکەوێتە دەستی ئەوانەی ناو بازنەکەو ئەوانەی دەرەوە دێنە جێیان بەم شێوەیە یاری درێژە دەخایەنێو خەڵکی دێیەکەش بۆ سەیران لە دەورو بەریان کۆدەبنەوەو تەماشای یاری دەکەن .

**3 – یاری یەك بازد** : ـ ئەم یارییەش هەر لەکاتی زستانو سەرەتای بەهاردا دەکرێو چەند کەسێك روو دەکەنە شوێنێ نەختێ نەرمو بێ بەرد . جێگایەك دیاری ئەکەنو یاڵنگە کلاشێك دادەنێنو ئەوانەی باز دەدەن ماوەی 50 مەترێك دەکشێنەوەو بەراکردن دێنو یەك باز هەڵدەدەن . چەند جارێك بەم شێوەیە کێ لە هەموویان پتر رۆیشت ئەوا ئەو کەسە بردویەتیەوەو دەبێت بە پیکەنێنو لە ناو خۆیانداو دەگەڕێنەوە بۆ ناو دێ .



**4 – یاری سێ بازد** : ـ ئەم یارییە وەك یاریی یەك بازد وایە ، تەنیا لە باتی ئەوەی یەك بازد هەڵ بدرێ ئەم جارە سێ بازد هەڵ دەدەنو کێ زۆر بڕوات ئەو کەسە سەر دەکەوێت .





**5 — یاری گورزو بن‌مێخە** : ـ کاتێ کە بەهار لە کوردستاندا دێ‌و دەشت‌و چیا بەرگی رەنگاو رەنگ دەپۆشێ ، کچان‌و ژنان لە لادێ کاندا جۆرە یاری یەك دەکەن پێ‌ی دەڵێن یاری (گورزو بن‌مێخە) گیژۆڵان‌و ژنان ئەم یاری یەیان زۆر خوش دەوێ‌و زۆر ئارەزوی دەکەن کاتێ کە هەتاو گەرم دەبێ روو دەکەنە جێگایەك کە دڵگیربێ‌و گوڵ‌و گ... گیای زۆر بێت ... سنگێك دادەکوتن‌و پەتێکی لێ گرێ دەدەن ، هەر لە سەر سنگە کە یا دەسکێ گوڵی کێوی جوان یا تورمەیەك دادەنێن پێ‌ی دەڵێن سەر شار .

ئەوانەی کە یاری دەکەن هەر یەکە گورزێك ئەهۆننەوە بە تۆڵەکە یا گوڵە زەردە یا بە هەر گیایەك کە نەختێ باڵای بەرزبێت . ئافرەتێکی گورج‌و گۆڵ سەرەکەی تری پەتەکە بە دەستیەوە دەگرێ‌و گوایە پارێزگاری سەر شار دەکات ، بە دەوری شارەکەیدا دەسورێتەوە ، بە دەسێکی گورز با ئەداو بە دەستەکەی تری سەرە پەتەکەی گرتووە نایەلێ کەس بێت دەسکە گوڵی سەر شار بەرێت . ئەوانی تریش دێن دەسکە گوڵ بەرن ، پارێزگاری سەر شار بە گورزەکەوە دێت گورزێکی لێ دەدا . ئەوانیش بە دەوریدا رادەکەن‌و هەڵ دەبەزنەوە بە گورز لێ‌ی دەدەن ئینجا ئەگەر یەکێك

لەوانە گورزی پارێزگاری شاری بەرکەوت ، پێ‌یدەوترێ (خوچا) وتێدەکەوێت‌و دەبێ بچێتە جێگەی پارێزگاری پێشوو .



**6 — یاری کێڵ‌و بەرد** : ئەم یاری‌یە لە زستان‌و سەرەتای بەهاردا دەکرێ . یاری‌کەرەکان دەبن بە دوو کۆمەڵ هەر لایەکیان نزیکەی 50 هەنگاو لە دووری یەکەوە . بەردێك لە پێشەوە دەچەقێنن‌و پێ‌ی دەڵێن (مەلا) . لە پشت مەلا بە دوو هەنگاو بەردێکی تر دەچەقێنن پێ‌ی دەڵێن (مەلاژن) . لە لای راست‌و چەپی مەلاژن دوو بەردی تر دەچەقێنن پێ‌ی دەڵێن (قرگە) . قرگەکانیش نزیکەی دوو هەنگاوێك لە مەلاژن دوورن بەلام لە ریزی مەلاژنان ئەوانەی کە یاری دەکەن دیسان تەرو وشك لە بەینی خۆیاندا دەکەن‌و کام لا بردیەوە ئەو لایە لە پێشا بەرد لە لایەکەی تر دەگرێ .

هەر کەسە ماق (1) یەردی هەیە کە تێگرێ . ئەگەر بە یەك بەرد لە نیشانی دا ئەوا بەردێکی تر تێ دەگرێ بەلام دەبێت لە بن مەلای لای خۆیەوە لە مەلای لای تر بگرێ‌و دەبێت مەلا بخات . ئەگەر مەلا خرا ئەو دەتوانێ لە مەلاژن‌و قرگەکان بگرێ ... مەرج وایە لە پێشا مەلا بکەوێ . کە مەلا کەوت ئەوسا سەربەستە مەلاژن یا قرگەکان . جا کێ دەستی

راست بیّ و هیّزی باش بیّت و بەردەکانی کە دەی هاویّ بیانخا ئەوا مانای وایە یاری کەریّکی باشەو دەست راستە .





7 – **راوە ژوژك** : دانیشتوانی کوردستان، بە تیّکرا نارەزوو هەوەسی بەراو دیّت جاچ راوە ئاسك یا کەرویّشك یاسویّسك یاکەو ... هتد

زوّر جار ئەگەر یەکیّکی غەریب بە میوانی لە دیّیەکا بیّت و بزانن نەختیّ (کیّلە پیاوە) دەست دەکری بە باسی راوو راوشکارو گالتەو قسەو پیّکەنین و پیّی دەلیّن بابچین راوە ژوژك بکەین ئەگەر هات و ئەو کەسەی ووتمان کیّلە پیاوە دەلیّت بابچین بەو شەوە حەزی پیّ دەکا ئەوانیش روو لە دەرەوەی دیّ دەکەن جوالیّکی دەدەنە دەست و دەلیّن تو دەرکی جەوالەکە بگرەوەو ئیمەش تەنەکە لیّ دەدەین و پاش چەند ماوەیەك جەوالەکە پر دەبیّت لە ژوژك ، ئەو نەشارەزایەش بە دیار جەوالەوە رەق دەبیّتەوەو ئەوانی تر رواَدیّ دەکەن بە نوّرە یەك یەك دەچنە دەرەوەو تەنەکە لیّ دەدەن تا جەوال گرماندو دەبیت واش دەزانیّ کە راستە ژوژك روی تیّ دەکا ... ئەو جا یەکیّ دەچی بەدواياو دەیهیّنیّتەوە دەبیّت بە پیّکەنین و گالتەو قسەی خوّش ...

8 – **کلاویّن ـ کالە مستیّ** : پیّشان لە بەر نەبوونی رادیّوو تەلەفزیوّن و گرام ... هتد خەلکی دیّ هاتەکان شەوانی دریّژی زستانیان بە گوّرانی و لاوك و مەتەل و یاری .. بەسەر دەبرد .

کلاویّن خوّشترین یاری بوو لە ناویاندا زوّر کەس ناوو شوّرەتیان بە کلاویّن دەردەکرد ئەوانەی کلاویّنیان باش بزانیبوایە شەوان میوانداری لە دیّیەکی تر دەکرد یا دەچون بوّ دیّیەکی تر بوّ کلاویّن کردن ..... دانیشتوان دەبوون بە دوو بەشەوە هەلدەستیّ (9) کلاو دادەنیّن ئەلقەیەك دیّنن یا تەرو وشك دەکەن یان هەرلایەك لە پیّشا بشاریّتە وە لایەکەی تر (9) خالی دەبیّت یان لە ناو سیّ کلاوا دەشارنەوەو لایەکەی تر ئەگەر ئەلقەکەی دوزیەوە ئەلقە دەکەویّتە دەستی .

ئەو لایەی کە ئەلقەکە دەکەویّتە دەستی یەکیّکی شارەزا لە ناویاندا ئەلقەکە لەبن (9) کلاوەکە دەشاریّتەوە وای دەشاریّتەوە کە هەستی پیّ نەکەن لەبن کام کلاو دای ناوە جا یاخوّی دەشاریّتەوە یا چاوی خوّی دەگریّ ... بوّ ئەوەی نەك بە چاو ئەلقەکە بدوّزنەوەو بزانن لە ناو چ کلاویّکە . لای دوهەم لە پیّشا هەلدەستن مەزنە لیّ دەدەن هەر یەکە مەزنەی خوّی دەلی وای لیّ دیّ هەر (9) کلاوەکە بەوە دادەندریّ کە ئەلقەکەی تیّدا یە سەیر ئەوەیە ئەلقەکە یەکە بەلام مەزنە (9) یە . دەبیّت بە پیّکەنین و قسەی خوّش و چەپلەو گوّرانی .... دەست بوّ هەر کلاویّك ببریّ یەکیّك دەلیّت نەکەی ئەلقەکەی تیّدایە .....

لە پیّشا گولیّك لیّ دەدریّ ئەگەر لە ناو گولەکە بو ئەوا ئەلقە دەکەویّتە دوستیان ئەگەر نا لە دوو گولّ گولیّکیان رویشت . ئەگەر ئەلقەکە لە کلاوە فت کراوەکان بیّت ئەوا چەند کلاو مابیّت ئەوەندە ژمارە وەر دەگرن و ئەو گولەی کە ماویانەو بوّ دوایی هەلیان گرتوە دیتە سەری واتە ژمارەیەك زیاد دەکەن یاری دریّژە دەکیّشیّ تا دەگەنە (100) هەرلایەك گەیشتە (100) مانای

بردیەوە .... هەڵدەستن (6) کڵاو دادەنێن پێی دەڵێن (سینیو زەرف) لەم شەش کڵاوە (3) یان گولەو (3) یان فتە ... کە (6) کڵاوەو کە دەشاردرێتەوە بۆلای بڵێن دۆڕاو هەر گوڵێك لێ بدەن ئەگەر ئەڵقەکەی تیا نەبێت (25) ژمارە لە نمرەکانی دێتە خوارێ جا سنیو زەرف سامناکە هەر کەسی زۆر ئـازانەبێت نـاوێرێ دەست بۆ کڵاو بەرێ . خۆ ئەگەر هات لای دۆڕاو ئەڵقەکە لە گوڵەکەیابو لای تری ( 25 — 50 ) خاڵی لێ دێتە خوارێ ... هتد بەم پێیە یاری درێژە دەکێشی کام لا دوو جار بردیەوە ئەو لایە سەر دەکەوێ زۆر جار ئەم یارییە لەسەراومێوژو مرشلا دەکرێ وەك گرەو ...

ئێمەت دەوێ مێردت پێ بکەین کوڕەکەش شەرم دەیگرێو یا دەڵێت ... کە دەست نیشانی کرد ئەوسا بە هەمویان باوەشی لێ دەدەنو هەر شوێنێ بویان رێ بکەوێت بە قرنچكو بـە شەق لێدان تا دەیخەن . خۆ کوڕە هەرچەنی بە هێزو تواناشبێت چۆن دەتوانێ خۆی لە چنگ ئەو نێرە حەیناتە خۆ ی رزگاربکات .... جار واش هەیە شەروالی لە پێ دەکەنەوە بە دڕکە زەردەو شەکەرۆك بەو شتانە لە لاران و لەشی دەدەن تا گیانی لە خلتانی خوێن نقوم دەکەن بێ ئەوەی گوێ لە هاوارو ناڵانەوەی کوڕە بگرنو دەیکەن بە پێکەنینو گاڵتە بە سەریاو لەو چوڵە بەجێی دێڵن ... زۆر جار کوڕی وابووە تووشی میرکچ بووە ئەمەندەی تێ هەڵداروە چەند مانگ لە ناو جێدا کـەوتووەو بێ ئـەوەی حسابێکی بۆ کرابێ یا بۆ کچەکان کرابێ ...

زۆر جار وارێك دەکەوێت پیاوێك 5 — 6 کچی عازەبی هەیە و لە گەڵیان دەڕوات بۆ دەشتو تووشی کوڕێك دەبێت هەر بۆ پێکـەنـین کیسـەکـەی لەبـەر پشتی دەردەکـاو جگـارەیـەك دەپێچێتـەوەو دای دەگیرسێنێو ڕوو لە کـوڕە دەکاو بـە بزە پێکەنین دەڵێ نایەیت میرکچێك لە گەڵ کچەکانم بکەیت ... هەر بە پێکەنین ئیشارەت بە کچەکانی دەداو وەك لە سەرەوە باسمان کرد وای لێ دەکەن .... ئەوسا لەو چوڵە بە جێی دێڵن .





---

9 — **میر کچ ـ میر کیژ ـ** : لە هەندی ناوچەی کوردستان میر کچ زۆر باوە زۆر جـار لە بەهـار یالە هـاوین کچان پـۆل پۆل دەردەچن بۆ دەرەوەی دێو بۆ ناو گوڵو گوڵزارو بە نیازی گیاو گوڵو کەنگرو تۆڵەکەو رنكو ... هند دیارە کچانیش خۆ بە خۆیان دەست دەکەن بە چەپڵەو گورانیو باڵۆرەو هەلیکسەو حێلانێو ... هتد .

ئەگەر هات کوڕێکیان بینی دەوری لێ دەدەنو قسەی لە گەڵ دەکەنو هەندێ گاڵتەو لە پاشان پێی دەڵێن کام یەکێ لە

ئامادەکردنی
کەوسەر قادر طە

# تایبەتە بە ژن ..

لە کۆکردنەوەیەکدا کە پەیمانگایەکی لێکۆڵینـەوەیی لە ئەورووپا بۆ (500) ئافرەتی کرد ، وا دەرکەوت کە ڕێژەی زۆری ئەو ئافرەتانە هاوسەرێتی هەمان پیاوی خۆیان بەباشتر دەزانن ئـەگەر هـاتو ڕۆژێـك لەڕۆژان میـلی کـاتژمـێر بـەرەو دواوە بگەڕێتەوەو سەرلەنوێ پیاوەکانیان هاتنەوە داخوازییان ، وەئەو لێکۆڵینەوەش بریتی بوو لە چەند پرسیارێك :

● **ئایا تۆ ئافرەتێکی دڵشادی ؟**

-/ 61٪ سەلماندیان کە دلشادن .

● **گرنگترین خەسیەتەکانی پیاوەکەت چی یە ؟**

- وەلامی زۆربەیان ئەوەبوو کە گرنگـترین خەسیـەتەکـانیان هەستکردنیانە بە پەیوەندیی ژن ومێردایەتی ، کە هەر ئـەو هەستەشە سۆزو خۆشەویستی پەیدا دەکا .

● **بـەڕای تۆ گـرنگترین خـەسیـەتی ژن ومێـردایـەتی چی یە ؟**

- 20٪ گوتیان هێنانی منداڵ .

14٪ گوتیان پشوودان و جێگیربوونی وەزعی ئابووری یە .

7٪ گوتیان دەربازبوونە لە زوگورتیەتی و تەنیایی .

● **ئەو شتانە چینکە چاوەڕێی وونبوونت نەدەکرد لە مێردەکەت ؟**

- وەلامی زۆربەیان ئەوە بوو کـە مێردەکـانیان ئـەو هەستو خۆشەویستی یە گەرمەیان نامێنێ کە لەپێش وەیان لەسەرەتای ژن هێنانیان هەیان بوو .

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئافرەتـەکان هـاوسەرێتی ی هەمان مێـردەکانی ئێستـایان بـەباشـتر دەزانن ئەگـەر بێتو سەرلەنوێ شوبکەنەوە .

وەئەوەی جێی سەرنجە کە زۆربەی ئافرەتەکان وەلامی دوا پرسیاریان دابووە کە دەڵێ :

● **چی روودەدا ئەگەر شووت بەهەمان پیاوەکەی خۆت کردەوە ؟؟**

- گـوتیان : شێـوەی هەڵسـوکەوتم دەگـۆڕم و واز لە هەمـوو جـوولانـەوەیـەك دەهێنم کـە دەبێتـە هـۆی گێـروگـرفت لە ژیانماندا !!

## نازداریی و بەناز بەخێوکردن

دەبێ هۆی چی بێ کە هەندێ لە دایك و باوکان یەکێ لە منداڵەکانیان لەوانی تر جیادەکەنەوەو زیاتر روویان دەدەنێ و دەیکەن بە «نازداری باوان» ؟

خۆ ئەو نازدارە هەر شتێـك بشکێنێ ئەوا قـوربانی یـە بۆی .. یا ئەگەر لە نیوەشەویشدا داوای خواردنێك بکات ئەوا باوکی بە بەرگی خەوتنیش بێ دەبێ هەر ئەوکاتە بۆی پەیـدا بکـات .. وە ئەگـەر هەستی بـە کەمـترین ئازاری کـرد ئەوا چەندەها پزیشکی پێ دەچەن ..

**وا لێرەشدا رووداوێکی سەیرتان بۆ دەگێرینەوە :**

منداڵێك بەوپەڕی نازوفیزەوە بـەخێوکـرابوو ، تـا وای لێهات هەڵسوکەوتی زۆر سەیر بوو ، هیچ یەکێ لە کەس وکاری توانای بەرگەگرتنی جوڵانەوەکانی ئەو نازدارەیان نەمابوو .. ناچار باوکی بردیە لای «پزیشکێکی دەروونی» کە هەر لەگەڵ سەیر کردنی پزیشکەکە گوتی : چاری زۆر ئاسانە .. لە هیچ داواکاری یەك بەرەنگاری نەبنەوەو لێی گەڕێن چی دەوێ با بیکات .. هەر خۆی کە دەبینێ کەس بەرەنگاری ناکات ناچار واز دێنێ ..

**باوکی گوتی** : جەنابی دکتۆر .. هەندێ جار داوکاریەکانی زۆر سەیرن باوەڕ بکە داوای «کرمی کوللە» مان لێ دەکات !! دکتۆر دووبارەی کردەوە : بۆی جێبەجێ بکەن و چۆنم پێ گوتی هەر وا بکە !!

باوکە نازدارەکەی هەڵگرت و دوای ماندوو بوونێکی باش لە باخچەکـەی ماڵەوەیـاندا کـرمێکی دەستکەوت و دانـایە بەردەم کوڕەکەی بەلام منداڵەکە بەخاوی ڕازی نەبوو ، بەڵکو داوای سوورکردنەوەی کرد .. یەکسەر بۆیان جێبەجێ کردو (کرمی هەژاریان) بۆخستە ناو قاپێك و لەبەردەمیان دانایەوە !!

ئینجا منداڵەکە گوتی : بابە دەبێ نیـوەی کرمـەکە تـۆ بیخۆی !! هەرچەندە باوکە هێڵنجی دەهات و نەیدەویست بیخوا بەلام کە ئامۆژگاری دکتۆرەکەی بیرکـەوتەوە ، نـاچار لووتی

خۆی گرت و چاویشی نوقاند تا نیوەی کرمەکەی خوارد !! باوکی قوربەسەر هێشتا لە قورگی نەچووبووە خوارەوە کە منداڵەکەی هاواری کردو قاپەکەی فڕێداو گوتی : ئەو نیوەیە ناخۆم ، چونکە تۆ ئەو نیوەیەت خوارد کەمن دەمویست ..

## ئارایشت و کات

زۆر لە ئافرەتان وا لێراهاتوون وەکوو زۆر شتی تر کەلوپەلی ئارایشتکردن بە ژمارەیەکی زۆر هەڵگرن و پاشەکەوت بکەن ..

بەڵام پسپۆرانی جوانکاری ئامۆژگاری ئافرەتان دەکەن کە کەلوپەلی ئارایشت کردن وەك خواردەمەنی ماوەی دیاری کراوی خۆی هەیەو ئەگەر لەو ماوەیە تێپەڕی کەڵکی بەکارهێنانی نامێنێ ..

هەر ئەو پسپۆرانەش دەڵێن ئەو کەلوپەلانە بە هۆی هەندێ لەو میکرۆبانەوە پیس دەبن کە لە ڕێگەی دەم یا پرچ یا پێستی دەم‌وچاو یان بە هۆی دەستەوە بۆیان دەگوازرێتەوە ، هەروەها پلەی گەرمی و ساردی و ڕوناکیش کار دەکەنە سەریان و ئەوپەڕی ماوەی هەڵگرتنی ئەم کەرەستانە نابێ لە (2) تا (3) سال ڕەت بکا ئەویش ئەبێ بە داخراوی بپارێزرێت .

هەروەها بۆ پزیشکانی پێست ئاشکرا بووە کە مانەوەی ئارایشت لە سەر دەم‌وچاو زیانێکی زۆری هەیە ئەگەر لە کاتی خۆی تێپەڕ ببێ ..





## بۆ خاتری خوا لەیەکیان مەکەن !

گۆڤارێکی پزیشکی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا سەلماندوویەتی کە گواستنەوەی منداڵ دوای لە دایك بوونی بۆ ژووری تایبەت لە نەخۆشخانەکان وەیاخود با بڵێین دوورخستنەوەی لە دایکی ، زیانێکی زۆری هەیە بۆ باری تەندورستیی منداڵەکەو لە هەمان کاتیشدا کار دەکاتە سەرباری دەروونی و تەندروستیی دایك ..

هەروەها هەمان گۆڤار گوتویە کە پێویستە دەست لەو کردارە هەڵبگیرێ ئەویش بە دانانی تەختەیەکی بچووك بە تەنیشت تەختەکەی دایکیەوە ، چونکە ئەو منداڵە دەتوانێ هەست بە گەرمایی دایکی بکات کە نۆمانگە لێی ڕاهاتووە . زۆر لە نەخۆشخانەکانی هامبۆرگ ئەم تاقیکردنەوەیان کردوە ئەنجامەکەشی سوودبەخش بووە .



ئامادەکردنی
عەزیز حەریری

# منداڵەکەت

# چۆن فێری قسەکردن دەکەیت؟!

.....زۆربەی زاناکان ئەوە دووپات دەکەنەوەو دەڵێن ؛ هەنگاوی نێوان یەکەمین دەربڕینی ووشە لە لایەن منداڵەوە تا وەکو دەگاتە پلەی دەربڕینی گرانترین ووشە بەو جۆرە گران نی یە کە ئێمە هەر لە یەکەم مانگی تەمەنیەوە بیری لێ دەکەینەوە ؛ بەڵکو ئەوە دەسەلمێنن کە پلەی گەشەکردنی ژیری منداڵو پەرەسەندنی توانستو زەینی بۆ خوێندنەوەو نووسین بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردەکرنە راستو دورستەی منداڵو نەشو نەما کردنی بە شێوەیەکی ڕێکو پێکو تەواو .

هەر بۆیەشە ئەو جۆرە منداڵانەی بە چاکی پەروەردە دەکرێن لە رووی قسەکردنەوە بە توانا دەبنو داناملێنن ؛ هەر وەکو ساغیش بۆتەوە منداڵ هەر لە یەکەم رۆژی ژیانیدا دایك بە یەکەمینو نزیکترین هاوڕێ ی خۆی دەزانێ چونکە یەکەم کەسە کە دەی دوێنێ ، جا بۆیە زاناکان وای بە پەسند دەزانن کە دەبێ دایك بایەخێکی تەواو بدات بە راهێنانی هەستی گوێ لێبوون لای منداڵەکەیو وای پەروەردە بکات کە زوو زوو چاو ببڕێتە سەرچاوەکانی دەنگ ، چونکە هەر تەنها گوێ گرتن بەس نی یە بۆ منداڵەکە ، بەڵکو دەبێ چاوەکانیش رابێن بۆ ئەوەی هەوڵ بدات بە دوای سەرچاوەی دەنگەکەشدا چاو بگێڕێ ..

وە لە مانگی یەکەمدا هەرکە دایك هەست بەوە دەکات جۆرە ئارەزوویەکی پڕ لە بەختەوەری لە رووی منداڵەکەیدا دەردەکەویو خەریکە دەست بە گروگاڵ دەکاتو تاو نا تاویش برگەی کورت کورت دەردەبڕێ ، ئا لەو کاتانەدا دەبێ زۆر بە تەنگ منداڵەکەیەوە بێتو پەیتاپەیتا ووشەی شیرینو خۆش خۆشی بە گوێچکەدا بچرپێنیو وردە وردەیش وەرامی پرسیارو داواکاریەکانی بداتەوە ؛ بێگومان ئەو جۆرە برگانەیش یاخود ئەو دەنگە کورت کورتانەی منداڵ لە نێوان مانگی چوارەمو پێنجەمدا دەبن بەو گۆرانیە ناسكو شیرینانەی کە بەختەوەریو شادومانی دەخەنە نێو دڵو دەروونی تێکڕای ئەندامانی خێزانەوە ..

هەر لەم روانگەیەشەوە باشتر وایە گەر دایك بۆی بکرێ ووشەکان بە شێوەی گۆرانیو بە دەنگێکی تارادەیەك بلندو ئاشکراو ، بە جۆرە ناسکیەکەوە فێری منداڵەکەی بکاتو رای بهێنێت لەسەر وەرگرتنی دەنگی ئەو جۆرە ووشانەی کە لەو تەمەنەدا روو بە رووی دەبنەوە .. گەلێ جاریش منداڵ لە تەمەنی شەش مانگیدا فێری ئەوە دەبێت برگەی هەندێ ووشە دەربببڕێت وەکو « با » و « دا » ئەگەرچی دووبارە کردنەوەو وتنەوەی ئەم جۆرە برگانە مەبەستی تەواویش نادەن بە دەستەوە ؛ جا بۆ ئەوەی ئەو دەربڕینانە چاکتر بنو زیاتر بەهێز بن ، وا چاکە هەندێ کەرەستەو کەلوپەل بخرێتە بەر دەستی منداڵەکەو ناوە ناوەیش بە ئاشکراو روون ناوەکانیان بە منداڵەکە بگوترێو ئەو پەیوەندیەش دیاری بکرێت کە لە نێوان ووشەکەو کەرەستەکەدا هەیە یاخود ئەو ئامێرەی بۆکاری دەهێنێ ؛ هەروەها پەیوەندی ئەو ووشەیەو ئەو کارە کاریگەرەی کە سەرنجی منداڵەکە رادەکێشێ ؛ بە چاکی روون بکرێتەوە ، بۆ ئەوەی لێی تێ بگات ؛ بۆ نموونە زۆر جاری وا هەیە سەعاتی دیوار یا هەر سەعاتێکی تر لە ماڵەوە سەرنجی منداڵەکە رادەکێشێت ؛ جا گەر هاتوو لە سەرەتادا سەعاتەکەی خرابە بەردەستو راهێنرا کە گوێ لە دەنگی سەعاتەکە بگرێ ، لە پاشانیش بخرێتەوە شوێنەکەی خۆی ، یا بە دیوارەکەدا هەڵ بواسرێتەوە ؛ ئینجا پرسیارێ ئاراستەی منداڵەکە بکرێتەوە ، وەك پێی بووترێ : « سەعاتەکە لە کوێیە ؟ » ئەوە ئیتر بێ سێو دوو منداڵەکە گورج سەری خۆی بەرەو رووی شوێنی سەعاتەکە بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی وەرامی پرسیارەکە بداتەوە ، لە پاشدا گەر شوێنی سەعاتەکە بگۆڕدرێ ئەوە دووبارە چاو دەگێڕێ تا وەکو دەی دۆزێتەوە ، ئەوەیشیان لە مانگی حەوتەمی تەمەنیدا دیار دەکەوێت ، گەلێ جاری وایش هەیە هەر لەو مانگەدا کە داوای هەندێ شت لە



منداڵ بکەیت ، بۆی هەیە جێبەجێی بکات وەکو ئەوەی دەستەکانی بجوولێنێ بۆ ئەوەی مەبەستی خواحافیزی بگەیەنێ ؛ ئیتر منداڵەکە یەکسەر ئەو داواکاریە ئەنجام دەدات و دەستەکانی بەم لاو بەولادا بەرز دەکاتەوەو دەیان جوولێنێ . یا کە داوای لێ بکرێ دەست بۆ لووتی بەرێ یا بۆ چاوو گوێچکەی ، یا دەستنیشانی هەندێ شوێنی ئەو بووکە شووشەیە یا ئەوکەل و پەل و یاریانە بکات کە لەبەردەستیایەتی ئەوە بێ سێ و دوو و سڵ کردنەوە هەموو ئەو داوا کاریانە ئەنجام دەدات ..

گەلێ جاری واش هەیە دایك یا باوك بۆیان هەیە وا لە منداڵەکەیان بکەن بکەوێتە جوولەو خولانەوە ئەویش بە هۆی ئەوەی هەندێ ووشەی سادەو کورت و پڕ لە رینەوە بەبەرگوێی منداڵەکەدا بچرپێندرێ و فێری هەندێ کاری وا بکرێ لەگەڵیا بگونجێ و بە دڵی بێ ، وەکو لاسایی کردنەوەی دەنگی ئوتومبێل « ڤڤ ... ڤڤ » یا هی شەمەندەفەر « توو ... توو » یا ئەو کاتانەی خواردنی دەدرێتێ و دەشورێ و جل و بەرگی تازەی لەبەر دەکرێ ..

لێرەدا دەمانەوێ بەو دایکە دڵسۆزانە بڵێین ، گەر دەیانەوێ منداڵەکانیان هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی راست و دروست فێری قسە کردن بکەن ، وا چاکە رابهێندرێن کە هەندێ ووشە بە رێك و رەوانی دەربڕن ، بە تایبەتی ئەو ووشانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی رۆژانەی منداڵەوە هەیە ، بۆ نموونە : « زارت بکەرەوە ، دەستتم بدەرێ ، دانیشە ، هەڵسە ، وەرە ، برۆ ، بخەوە » ، وە زۆر پێویستە کە دایك و باوك منداڵەکانیان بە ناوی تەواوی خۆیانەوە بانگ بکەن ، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە لەسەر شێوازە راستەکە رابێن و ناوی خۆیان بناسنەوەو بیزانن ؛ هەروەها دەبێ منداڵەکە ـ واتە منداڵە بچووکەکە ـ فێری ئەوە بکرێ ناوی ئەندامانی خێزانەکەی بزانێ ، بە تایبەتی گەورەکانیان و . واش فێر بکرێ گەر لێی بپرسی « بابە » کوا ، یا « دایە » کوا ، گورج بە دوایاندا بسورێ و چاو لەو کەسە بکات کە مەبەستە ؛ هەروەها فێری هەندێ ووشەی تر بکرێت وەکو « وا بابە هاتەوە ، وەرە بۆ لام ، ئەو شتەم بدەرێ ، وا مەکە » و زۆر ووشەو دەربڕینی تر کە بەردەوام منداڵەکە بەرچاوی دەکەوێ و بە درێژایی رۆژ بەرەو رووی دەبنەوەو هەستیان پێ دەکات ، ئەمەیش لە مانگی دەیەم و یازدەهەمی تەمەنی منداڵدا دەبێ رەچاو بکرێ ..

گومانیش لەوەدا نیە کە دایك و باوك زۆر بەختەوەر دەبن هەرکە هەست دەکەن منداڵەکەیان بە راست و دروستی و بە رێك و رەوانی قسە دەکاو دەدوێ و چاکیش لە دەوروبەری خۆی شارەزا بووەو زۆر بە جوانی ووشەی « دایە » و « بابە » دەر دەبڕێ و بەسەر زاریەوە خۆشترین ئاوازی بەسۆزو مۆسیقادارەو ئەوەشیان بۆ دەسەلمێنێ کە هەمیشە پەرۆشی یارمەتی و پەروەردەی پڕ لە دڵسۆزی و خۆشەویستی دایك و باوکیەتی ..

ئەوانەی لە پێشەوە باسمان کردن وەنەبێ هەروا بە هاسانی ئەنجام بدرێن بەڵکو پێویستیان بە خۆماندووکردنێکی هێجگار زۆر هەیەو دەبێ دایکان و باوکان بەوپەڕی دڵسۆزی و بە دەروونێکی فراوانەوە ئەو ئەرکانەی بە سەریانەوەیە جێبەجێی بکەن و قەتیش لێی سڵ نەکەنەوەو روو لەو پرسیارو داواکاری و هەڵس و کەوتانەی منداڵەکەیان وەرنەچەرخێنن ، چونکە منداڵ هەروەکو نەمامێکی ناسك وایە چۆنی پەروەردە بکەی ، ئاوا پێدەگاو گەورە دەبێ . نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین کە منداڵ زۆر بە پەلە شت دەچێتە مێشکیەوەو خێرا فێری دەبێت ، جا کەوایە با چاکترین نەخشە بکێشین بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانمان و باشترین رێگەی زانیاریانە بگرین بۆ ئەوەی منداڵانی ئیمرۆو نەوەکانی دوارۆژ بین بەو مرۆڤە خێرخوازو دڵسۆزانەی نەخشەی کۆمەڵگایەکی پڕ لە بەختەوەری رەنگ برێژن و جیهانێکی پڕ لە ئاسوودەگی و سەرفرازی بنیات بنێن ...




خوشك‌و برایانی ئازیز ، وەکو پەیمانمان پێدابوون کە گۆشەیەکی تایبەتی بکەینەوە بۆ بەرهەمی لاوان ، هەر لەبەر رۆشنایی ئەو پەیمان پێدانە ، لەوە بەدوا ئەم گۆشەیەتان وەکو دیارییەکی بەنرخ پێشکەش دەکەین بەو هیوایەی مۆمێکی هەر داگیرساو بێت‌و کز نەبێت ، بۆ ئەوەی لاوە خوێن گەرم‌و قەڵەم بەکارەکانیشمان لەبواری بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بێبەش نەبن‌و ئەوانیش لە کاروانی پڕ شکۆی رۆشنبیری کوردی دانەبڕێن‌و بتوانن ئەوەی لەدەستیان دێ بیکەن‌و ئێمەیش پەیمانی ئەوە دەدەین کە پاڵپشتێکی قایمی ئاوات‌و ئارەزووە پیرۆزەکانیان بین‌و هەرگیز کەمتەرخەمی نەکەین لەپێناوی زیاتر دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی‌و پێش‌خستنی ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردیمان بەرەو بەرزترین لوتکەی داهێنان‌و پێشکەوتن ..

دەبا هەموو لایەکمان پێنووسەکانمان وەکار بخەین‌و بەرەو ناخی ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردی بچینە خوارەوەو لاپەرەکانی گۆڤارەکەمان گۆڤاری «کاروان» بە پاکترین‌و پیرۆزترین ووشەی رەسەنی کوردی برازێنینەوە ، دەبا ئامانجی هەموو لایەکمان خزمەت‌کردن‌و بەرەوپێش بردنی باری رۆشنبیری کوردی بێت ، با خوشك‌و برا ئازیزەکانیشمان بێ سڵ‌کردنەوەو پەیتا پەیتا بەرهەمی چاك‌و بەپێزی خۆیانمان لێ‌نەبڕن ، تاوەکو ئاواتی دڵی هەموو لایەکمان بەربگرێ‌و بێتە بەرهەم ، کوردیش دەڵێ «چەپڵە بەدەستێ لێ‌نادرێ» جا بابزانین خوشك‌و برا لاوەکانمان تا چەند بەدەنگمانەوە دێن‌و چەند دەتوانن ئەم گۆشەیە بە بەرهەمی قەشەنگی خۆیان برازێننەوەو تا کوێ لەگەڵ کاروانا دەبن‌و لێی دانابڕێن ، ئەوەش رۆژانی داهاتوو ساغی دەکاتەوەو دەی سەلمێنێ ..

**بەم پێشەکییە کورتە لێرەدا دەوەستین‌و بەو پەڕی خۆشیشەوە بۆ یەکەمین جار نۆبەرەی گۆڤارەکەتان گۆڤاری «کاروان» : گۆڤاری هەموو ئەدیب‌و نووسەرێکی کوردتان بەدیاری پێشکەش دەکەین هەر بەم بۆنەیەشەوە پیرۆزبایی لەهەموو خوشك‌و برا لاوەکانمان دەکەین‌و بەهیوای بەردەوامی‌و هاوکاری دڵسۆزانەیانین‌و ، فەرموون ئەمەیش چەپکێکی رازاوەی بەرهەمی هەمە جۆری ئەمجارەمان ..**

## نەوروز و هەڤاڵ

*

**اسماعیل ابراهیم**

*

هەیهۆ «نەڤروز» ..
پرسیار کەرێ وەلات و دوز ..
کانێ ی .. کانێ ی ..
لە بەرزە بوی ..
نە دیاری !
تە دابوون نوی پەیمان و سوز
راستە .. راستە
منا زانی ! !
تو بوی چرا
تو بوی شەمال
تو بوی لاو و خورتێ دلسوز .
کانێ ی .. کانێ ی ..
لە بەرزە بوی ..

* *

هەیهۆ «نەڤروز»
پرسیارکەرێ وەلات و دوز ..
کانێ ی .. کانێ ی ..
لە بەرزە بوی ..

- 2 -

هەیهۆ «نەڤروز»
هەیهۆ خەتیر ..
پرسیارکەرێ ب هوش و ژیر
داخازکەرێ ئازادیێ
تو بوی لسەرێ شاهـ و میر
ژتە د رەڤین ..
گەلەك ، بەلێ هەیهۆ فەلەك
تف ل تە بیت
تە چ کرو چ گوتەمە
تە ئێخستین قەیدو زنجیر ...
کرینە دەریایەکێ دا
یا بێ بن و گەلەکا کویر ...
**هەیهۆ «نەڤروز» ..**
**هەیهۆ خەتیر ..**
**قەت نابەرزەبن ناڤ و ژین**
**هەر نەبێژی هاتم ژ بیر ...**

برایێت ماینە غەریبیا
هەر دگەرین
ناڤ ئێل و هۆز

**تێبینی :**

**ئەڤ هۆزانە گەلەك یا درێژ بی لبەر هندێ مە هەر هندە ژێ هەلبژارت بۆ بەلاڤ کرنێ .**

# هەوارگەی گەڕانەوە

گیانی شیرین ؛ هیواو ئارام
پەری دڵی وێڵو شەیدام
کاتێ لە چێژی دیدەنیت
ئۆخەی نەکرد .
لەگەڵ پۆلی کۆترو مەلو هۆزارەکان
بۆ هەواری کڵۆڵەکان ؛ گەڕانەوە
بۆ ژێر باڵو قژی بەروو کشانەوە

* *

چاك دەزانم
کۆچو کۆچ باری غەریبیت
لێناوەو ناگەڕێتەوە
تاکو تەمی بەری ئاسۆم لەبەر چاوا
پەیتا پەیتا نەتوێتەوە
ماچێکی ئاڵ ؛
لەسەر پەرەی شکۆفەی ژین
نەنەخشێنیو ،
پرچی سووری تیشکی هەتاو شانە نەکەی
نەخشەی زبری ناو لەپی هەژارەکانیش ؛
نەسڕیتەوە .

* *

تاکەی وەك بولبولی سەرشێت
هەر ئالودەی لقو چڵ بم
بۆ دیدەنی ئاوارەکان
لەرێگەدا بێمو بچم
تاکەی گڕ بم
تۆش بەنەوای شمشاڵەکەت
هۆرەو حەیرانێ «قایغانم» بۆ هەڵبدەی .
دیوانەی شفەی کوێستانو
لێراوی کەڵە تەزێنم
تاکو هەڵاوی دەروونم ؛ دامرکێنم .

* *

پەی بە گۆنای کێو دەبەمو ؛
مژی حەزم کوڵی سووری دەروشێنێ
چاوی تیژم ؛
پەرەی مێژووی دوێنێو ئەمڕوو
بەیانیش دەخوێنێتەوە
کانیاوی ئەو نبارانەیش ؛
لە چاوتا کۆ دەبێتەوە

* *

گەڕامەوە[1]
پاش چەند ساڵی ڕێبواریما
بۆ پەرستگای یەکەم لانەی دڵداریما
شەکەت نەبووم
حەسامەوە
تاشە بەردی ئەو زوورگانەم
کردە سۆپەر
شەوی تارم گەشاندەوە
لرفەی ناخی بروایەکەم
هەواڵی بۆ کاروان دەبرد
بەڵام گیانە ؛
بە ئاوازی هیوای بەیان
سروودم گوت بۆ ژیانەوە
لەگەڵ خرۆشی سەدای دەنگم
دارو .. دەوەنو .. ڕەزو .. باخ
لەرەگەوە بوژانەوە

● سەباح ڕەنجدەر ●

1982/10/5

«١» شیعرێکی شاعیری لاو «ئازاد دلزار» لە دیوانی «خونچەی سەهۆڵ» بۆتە هەوێنی ئەم کۆپلەیەی هۆنراوەکەم ..



**بەندی علی حسن**

1982/11/28

تەنیا گوڵی جوان گەشاوەی باخم بووی
سۆزو هەستی کڵپە کردووی ناخم بووی

تۆ ترووسکەی ئەو تیشکە بووی کە هیوام
گەش دەبوو پێی لە زیندانی پڕ لە سام

تۆ فریشتەی ئەندیشە بووی کە شەوان
لە دەریاچەی تەنیایمدا خۆی ئەنوان

حەزم دەکرد فرمێسکەکەت لەبری خوێن
بەناو لەشما بچوایە بێ سەرو شوێن

تا کاتی بەکوڵ گریانت لافـاوی
خوێن و فرمێسك قوڵپەی بایە لە تاوی

گەرچی ژیان دەستی غەمی بەکارە
پیری کردووم ، گەر شێوەم هەرزەکارە !!

بەڵام هەرگیز مل کەچ ناکەم بۆ نەبوون
دڵ ئەکەمە مەشخەڵی گڕی زەبوون

گەر تۆسقاڵێ تروسکەش بەدی بکەم
ئەیکەمە مۆم بۆ شەوی ئازارو خەم

# کاروان هات ..

**عەلی پەژارە**

1982/10/20

ئەم کاروانەش بەخێر بێت سەرچاوی هونەر دۆستان
پشت لەتەم و تاریکی پیرۆزە لەگەڵ کۆچتان

ئێمەش بەدوای کاروانین گەر کاروان هەڵمان گرێ
لە کوڵەی سینگی ناوبار ئەبینە هیشکە گرێ

تا تووشی چەرخێکی گەش ، ڕۆژی ڕوون نەبینەوە
پەتی بن بار بشسووتێ لە کاروان نابینەوە

بەمەرجێ ئەم کاروانە دار بۆ «هەبرین»[1] بەگ نەینێ
خۆش بکات ئاگری کاوە لە نەورۆزی سبەینێ

بەڵام یەکەم ڕووپەری ساماڵێکی بێ هەورە
ناترسێ لە بەفری تووش ڕێبواری گیان گەورە

ڕەنگی کاروان دیارە کاروان کوژەی کاروانە
ڕێبواری کوردی قۆزبێت ئەنجا ئەڵێم کار وانە[2]

* * * *

(1) هەبرین : ناوێکە لە چیرۆکێکی ئەفسانەیی هاتووە گوایە ئـاگر خـۆشکەر بـووە کاتێ ویستیـان بـرایم پێغەمبەر بسووتێنن .

(2) کار وانە :کار بەم جۆرە ، یان کار ئەوهایە .

## کەژاوە..

ئازاد ئەحمەدمەلا

هەموو شەوێك ...
تا خەو دەبێتە میوانی ،
چاوانی من
هەزار خۆزگەو ، تاسەی شیرین
هەنگاو دەنێن
بۆ تەلاری ئەڤینی من
من دڵنیام ...
نەمن «زەنجی»م ،
نەتۆ خاوەن «کۆشکی سپی»
من دڵنیام ..
نەتۆ سوڵتانی «ئەیوب»ی
نەمن یەکم «خاچ پەرستی»

سنووری دوور ، لە نێوانمان
دەبەزێنم بەگوڵی سوور .

*

دەبێ کەی بێ ..
داری ئەگەرمان بێ بگات
[هەناسەم ، زولفەکەت لاداو
شەو رابووڕێت ،
دوو نێرگزیش لەخەو رابن](*)
دەستم بە لیمۆی کاڵ بگات .
دەبێ کەی بێ ..
لەبنارو ، لەسەر کانی
پرێسکەی پرسیار هەڵرێژین

(*) ئەم دێرە شیعرە هی «نالی»یە بەلام دەسکاریم کردووە ، شیعرەکە خۆی وایە !

هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگووت و شەو رابردو نیرگس هەر لەخەو دایە .

عباس صالح عبدالله



حەزم نەکرد ،
ئەو دڵە خنجیلە ناسکەت
بڕەنجێنم
حەزم نەکرد ؛
خەندەی لێوت ،
بە دوو ووشە بڕەوێنم .
هەر ئاوا زوو مەلی شادیت بتەرێنم

*　*

جا چیم لێ دەکەیت گیانەکەم
شیرازەی هەستم پساوە
رۆژگاری شێتی ماندوو بوون
وای لێکردووم
رۆژ لەدوای رۆژ بچمە دواوە

*　*

تۆ دڵت چەندە ناسك بێ
من ناسکتر
هەرچەند ئاواتی زۆر تیابێ
هی من پرتر
چەند ووشەی جوان لە هۆشتا بێ
هی من زیاتر
بەلام چی دەڵێی جوانە خان
هەندە جاری ووشەکانم
دەبنە ئاگر نەك دڵی تۆ ؛
تا لە دونیاش بەر ئەدەن گڕ .

## تەڤنێ دلێ مە نەخشێ ڤیناتێ

بێوار هروری
دهوك

بلا یارێ
بلا بێن مە بهەمی رەنگا
بلا درێکامەدا دانن

وا خەفك و داڤ و ئاستەنگا
بلا دلێ م بێت کوتن
ب کوفان و رەشە ژەنگا

*　*

ڤینا تە نەخشێ هیڤیا
ل سەر لاپەرێت دلێ من
ناگریت ئێدی چ رەنگا

سەر هەر بۆ گوری یە یارێ
بەلێ بلا بێ هیڤی بن
ئەز ژێرا بدەم دل و دەنگا

*　*

یارێ جیهان چەند غەریبە
لێ ڤێك کەفتن هیڤیا منە
یارێ ل خەلکێ چ بزاڤە
لێ باوەری رێکا منە

*　*

یارێ گەر رۆژ چوو نەهەلات
من هەردوو چاڤ
شڤانێن پەزکێ هیڤیا
یارێ گەر رێبوار تاری بن
من هەردوو چاڤ
خەتیر ل رێکا کاروانیا
بەلێ یارێ ..
رێکا ژینێ ..
هەر هیڤی یە
شڤانێ هیڤیاژی ..
یارێ د زانی ..
باوەری یە .
ئەزم ئەڤینداری خودان
سوز و هیڤی
ئەزم ئەز خودان باوەرم
ئەزم ئەز خودان دلبەرم



# شاعیرو ئەویندار

**له ئەنجامی خوێندنەوەی ژیانی ئەو کەڵە ئەدیبانەی دنیا ، ئەوانەی ئەدەب خو بە قەرزاریان دەزانیو بەشـــداریيەکی دیاریان لە بزوتنەوەو گەشـــە کردنیدا کردووە زۆر شـتمان لا روونو ئاشکرا دەبێو گـەورەیيو بەشکۆیی ئەوانمان چاتـر دێتە بەرچاو بەتایبەتی کاتێ ناسینەکە بەرادەیەك بێ شــتە نهێنيو پـەردە بەسەراکشـاوەکانی ژیانی وان بزانین ، ئـەو دەمیش کارەکە دەبێتە شتێکی نوێو زیندو ، دەکـرێ بلێین بۆنی هەناسەو رەنگی پیتو باڵەفڕەی شـــیعرەکان دیارنو هەستییان پێدەکرێ .. جاکاتێ هۆو نیـازی ئەو شـیعرانەمان زانین دەتوانین هەقی خۆشیان بدەینێ ، لە ئەدەبیاتی گەلانـدا ئەم لایەنە تارادەیەکی زۆر روونە ، ئەوەتا لە ناسینی کەسـێکی وەك پۆشکین کە ئەدەبی سۆڤیێتی جوانترو شیرینتر کـرد ، لە بەرامبەریا گۆگۆڵ دەڵێ : « خۆم بە قەبرزاری دەزانم » ئـەو ئافرەتانەی شیعری بۆ وتوون ئێمەی خوێنەر دەیان ناسـینو وامان دێتە بەرچاو قەفقاز گواستراوەتەوە بۆ شارەزوورو کچی ناو شیعرەکانی پۆشکین ناسیاونو ئێوارانە تووشیان دێین .. ئەم زانینەی بۆنەی شیعرەکان کاری رەخنەگر ئاسانتر دەکەن . لای خۆمان بەدەگمەن بۆنەی شیعرەکان دیارن مەگەر شـاعیر بۆ خـۆی لەی دوابێ وەك کلیـل لەپێشەکی هۆنراوەکـەیدا دابنابێ .. رێگە دەیان گەورە کچی کەڵەگەتو قیزمرد لـەو دیو دیواری گوڵێنی شـیعرەکانی گۆرانەوە بێ ، بـەڵام نـەك رەخنەگری کورد بەڵـکو هاوڕێیانی گۆرانیش نازانن کێن . با ئەوەش بوترێ ئەگەر پۆشکین ئاوا کوژراوی جواتان نەبایە ، گۆران ئاسا ــ ا هەر کوێیە گوڵێکی سـوـــووری بدیـایـە دوایئەکەوتایە ئەو دیمەنو وێنە جوانو لەدڵەوە هاتووانەی بۆ نەدەگیرا ..**

**« جـەزا »**

رۆژی شەشی حوزەیرانی 1799 پۆشکین هاتە دنیـاوە . وێرای ئەوەی تەگەبی سیو هەشت ساڵ بژی بەڵام شۆڕشێکی ئەدەبی وای لەوڵاتی شۆرەوی‌و لەدنیادا بەرپاکرد . تا دنیا بـە بێوە بودستێ ناوی وەك ڕابەرو پێشەنگ لەبەرچـاوی دڵانـەو ون نابێ .

پۆشکین لەســەر باڵای ئەدەبی خەمبـاری وەسـتاوەو گەرووی پڕە لە شادیو خۆشەویــستیو ژیان . لەهەرەتی ڕیالیزمی کاریکاتۆری گـۆگـۆڵو عەدەمییەتی ( ئەهلەستێتی ) تۆرجنێفو پەستی کوێرانەی تۆلـستۆی لـە شارستانیەت ، ئامادەیی دۆستۆفسکی بۆ ئازار کێشانی ســۆفیانە .. بەڵێ لەناو ئەو هەموو هەیتو هوتـەی خەمنـاکیو ئازارو خوێنو پەستییەدا پۆشکین بـەو دڵخۆشـــییە سەرسورهێنەرەوە دەبینین .

پۆشکین منداڵێکی لچ ئەستووری کورتـە بنەی خەمناكو چاوگەش و لەش گران بوو ، هەرگیز پێ نەدەکەنی . دایکێکی رۆح ساردو بابێکی تووڕەو تۆسنی هەبوو . زۆر دڵی بە ئەرینا رۆدنیوفای دەکرایەوە . ئەفسانەی پێکەنینـاویو گۆرانی کۆنی سـەیرو وشـەی دانســقەو خۆش ئاوازی لابوو مرۆ لـە گوێ گرتنیان بێزار نەدەبوو . ساڵی 1800 لە باخێکی بترسبۆرگدا بوون ( بۆڵ )ی ئیمپراتۆری رووســیا لایانەوە تێپـەڕی . فەرمان درا هەموو ئەوانەی لە ناوەن سەری خۆ رووت کەن ! بەڵام ئەرینا بەهۆی شپرزەییەوە بیری چوو کڵاو لەســەری پۆشکین بکاتەوە . ئیمپراتۆر گەیشـتە لایانو پێی هەڵشاخا . هەر ئەوەش بوو بە مایەی ئەوەی بترســــبۆرگ بۆ ماوەی دوازدە ساڵ بەجێ بێڵن بچن بۆ زاخارۆڤا .

لە هەشـــــت ساڵیدا فەرەنساوی وەك زمانی زکماکی دەزانی .. بۆ خوێندنەوە توانایەکی بێ ڕەزای هـەبوو . بـە ڕادەیەك لە یازدە ساڵیدا بە هۆی کتێبخانەکەی بابییەوە هەموو ئەدەبی فەرەنسی لەبەر بوو .

ساڵی 1812 چووە پەیمانگای لیسییە لـە بترسبۆرگ . لەوێدا وەك شاعیر ناوی دەرکەوت . گـەرچی مامۆستاکـانی دەیانوت : ئەو کوڕە لێو ئەستوورە بـە ئاســانی شـیعر دەنووسێ بەڵام شیعری جوانی لێنایە .

لە (8)ی کانوونی دووەمی ( 1815 ) چەند شــیعرێکی لە گۆڤـاری ( پەیامنێری ئەورووپا )دا بڵاوکردەوە . بـــەڵام بەناوێکی خواستراوەوە . پاشـان پەیمانگا کۆڕێکی بۆ شـیعر ڕێك خست پۆشکین شیعرێکی خوێندەوە .



( هاورێ گوێ ڕادێرە
ڕۆژی شادی هەڵدێ
ڕوسیاش بێدار دەبێتەوە ناومان
لەسەر وێرانەی زۆرو ستەم دەنووسن )

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ پۆشکین لەگەڵ تێکۆشەراندا بووە ، بەڵام مەسەلەکەیانی بەدڵ بوو بۆیە شیعری بۆ دەوتن .

دوا بەدوای خوێندنەوەی شیعری شاعیرە ئەویندارەکانی فەرەنسا بەتایبەتی بایرۆن ، بۆ دزەماچو زوانگەی خۆشەویستی ئاواتی دەخواست ! دوور نیە ئەم تێکەڵ بوونەی لەگەڵ ئەو شیعرە تەڕو بڕانەدا بووبێتە مایەی ئەوەی لەحەوت ساڵییەوە دڵی ببێتە ئاگردانی خۆشەویستیو تا مردنێ ئەو ئاگردانە لە کەلە پشکۆی ئەوینی جوانان بێ بەش نەبێ ، دیقی دەکرد بە ساردییەوە بەدیارییەوە دانیشێو پشکۆیەکی جوان تیایا نەگەشێتەوە .

لە 13ی مایسی 1917 پەیمانگای تەواو کردو لە وەزارەتی دەرەوە دامەزرا کاتێ تەمەنی گەیشتە هەژدە خۆی بە دیسکۆکاندا دەکردو بە پەرۆشەوە چاوەکانی دەبوونە دوو مەلی جادوییو لەسەر شەنگترین ئافرەت دەنیشتنەوە .. شازادە ئۆدیسکای نازداری بۆ ماوەی دوو ساڵ دوور بەدوور خۆش ویست . دەیویست ببینێو بیپەرستێ . زاتی ئەوەی نەبوو لێی نزیك بێتەوە ، هەر دووراو دوور !

خۆ بەزل زانین یەکێ لە ڕەوشتە ناشیرینەکانی پۆشکین بوو ، وای لێکدەدایەوە مادامەکی شاعیرە دەبێ هەموو شتێکی بەزمان درێژی بۆ بچێتە سەر .

لیبرالییەتی پوشکین لەم شیعرەیدا بەروونی دەردەکەوێو لە شاعیرە شۆڕشگێڕەکانی سەردەمی خۆی جوێ دەبێتەوە .

**[ یاسای بەندایەتی**
**بە ئامازەی قەیسەر نەما ! ]**

هاوەڵانی پۆشکین گەیبوونە ئەو ڕاستییەی هەرگیزاو هەرگیز زۆردارو زۆلێکراو دانوویان پێکەوە ناکوڵێ .. تەنیا

**جەزا عەلی ئەمین**
**کردوویە بە کوردی**

هێزە بتوانێ تەختو تاراجیان تێکداو پاکۆیان کا . بەڵام لای پۆشکین شتەکە واکەوتبووە پاشا دەبێ ڕێزی لێبگیرێ .

لە بیستەکاندا پوشکین بووبە سەرکردەی شیعری ڕووسی « ریلیف »ی شاعیری دیسەمبەریەکان وای پێ دەڵێ : « هەموو ڕوسیا چاوی لە تۆیە ، خۆشی دەوێیو لاسایت دەکاتەوە ، بۆیەکا شاعیرو هاونیشتمانی بە » .

ڕۆسلان لۆدمیلا یەکەم داستانی شیعری پۆشکینە .. بریتیە لە شەش سروود ، ئەوە جگە لە پێشەکیو سەرەتاو کۆتایی . چیرۆکی شا ڤلادیمیر دەگێڕێتەوە چۆن چۆنی ئاهەنگی بە شوودانی لۆدمێلای کچی ڕێكدەخا بۆ ڕۆسلان ـ ی سوارچاك بەڵام زەماوەندێکی سەیر ! بووكو زاوا دەچنە پەردەوە ، پاشان هەور دەگرمێنێ بەڵام چۆن گرمەیەك ، ڕووناکی دەکوژێتەوە ، هەموو شتێ هەڵدەلەرزێ ، تشیرنۆمۆری جادووباز بووکێ دەبا بۆ شوێنێکی نەدیو . دوای ئەوەی بابی دەستی لێ دەشوا گفت دەدا هەر کەسێ پەیدای کاتەوە بۆ خۆی بێ ! ڕۆسلان ئەم بەڵێنە وەردەگرێو سێی دیکەشی لەگەڵدا دەڕوا ... ماوەیەك بە سواری دەگەڕێن تەنیا ڕۆسلان دەمێنێتەوە ، کۆڵنادا بەر لەوەی بگاتە لۆدمیلا یەکێ لە پیاوانی جادووبازەکە دەکوژێ . جادووباز قەمووڕێکی ناقۆڵاو ریش درێژ پیاو بێزی نەدەهات بۆی بڕوانێ . پایزو زستان تێدەپەڕن ڕۆسلان دوای کەشمەکەشمێکی زۆر دەگاتە بەردەمی کۆشكو لۆدمیلا دەدۆزێتەوەو دەیهێنێتەوە .. لەم داستانە شیعریەدا زمانێکی شیرینو بێگرێوگۆڵ دەبینرێ . ئەم ڕەوانیو خوڕییە یەکێکە لە خاسییەتەکانی شیعری پۆشکین . زۆر دەستی بە شەوە دەگرت ، ئەگەر بیرێك لە پێنج دێڕدا جێی بایەتەوە ئەم ڕەنجی فەرهادی دەدا بۆ ئەوەی لە چوار دێڕدا دەریببڕێ .. بەیانیان قەڵەمو کاغەزی دەبردو ڕووەو دەرو دەشت دەڕۆیی ئەو کوڕە تەمبەڵەی منداڵی نەمابوو .. لەو سەردوە کاغەزە سپییەکان گوڵە شیعریان دەگرت .

لە دوورخراوەییدا گەیشتە قەفقاس . دیمەنی شاخو ڕەزو باخ سەرسامیان کردبوو . ڕووەو قرم ڕۆیی ( هیلین )ی حەڤدە ساڵەی دی شەیدای بوو . ئەوەتا ئاوا باسی ئافرەت دەکا !

**« کەمو زۆر ئاشقی هەموو ئەو شەنگو شۆخانە بووم کە دیومن ! بەڵام تەنها یەکێکیان نەبێ ئەوانی دیکە گاڵتەیان پێ کردووم » .**

ڕەنگبێ ئەو تاکە ئافرەتەش ماری رایفسکی بووبێ . کیژێکی حەڤدە ساڵ ، سەرگەرمی شاخەوانیو ڕاوکردنی شەپۆلی دەریا بوو . پۆشکین لە « دیلی قەفقاسی » دا کردوویەتی بە

کچە پالەوان ، ئەو شیعرە لە ئابی 1820موە تا شوباتی 1821 پێوەی خەریك بوو . کرۆکی ئەم شیعرە وەهایە :

پیاوێکی رووسی دەبێتە دیلی قەفقاسیان ، کچێکی چەرکەسی خۆش دەوێ‌و ئازادی دەکا ، بەڵام ئەم ناتوانێ هیچ شتی بۆ کچە بکا .

پۆشکین شێوەی شیعرەکەی لە بایرۆن وەرگرتووە ، کارتێکردنەکە لەو سنوورە تێناپەڕێ ، دەنا پالەوانەکانی بایرۆن کەسانی شەیتانن‌و هەموو شتێکی بەردەمی خۆیان وردوخاش دەکەن . بەڵام لای پۆشکین تەواو پێچەوانەیە . پالەوانەکانی پۆشکین لەسەر زەوی سایە سووکن ، لەناو تیشکی ئاسمان‌و جوولەی گەڵای لق‌و دارا دەتوێنەوە ، وێڕای ئەوە پۆشکین لە شارستانییەت‌و دواکەوتوویی دەدوێ‌و باسی دژایەتییان دەکا.

ئینجا شیعری ( قەرەجەکان ) دەنووسێ ، هەمان بیری دیلی قەفقاسی دەربڕیوە بەڵام بەشێوەیەکی فەلسەفیانەو قووڵتر بۆ مەسەلەکە چووە ناوەرۆکەکەی وایە :

( ئیلکۆ لە زیندانی شارستانییەتی نوێ هەڵدێ رووەو ئۆردوگای قەرەجەکان دەڕوا بەنیازی-تراویلکەی سەربەستی- ئیلکۆ بێ نیاز ، خەمناکی ، هیوا ، دەژی .. قەرەج خێرو شەڕو چاکە نازانێ .

**مانگ بەسەر هەموو سروشتا**
**بێ جیاوازی تێدەپەڕێ**
**تیشك دەڕێژێ**
**کەس ناتوانێ پێی بڵێ :**
**لێرە وەمێنە !**
**کێ دەتوانێ بە دڵی کچێ بڵێ**
**هەر پیاوێکت خۆش بوێ‌و هەرگیز**
**خیانەتی پێ مەکە .**

لای ئەلیکۆ ئافرەت دەبێ موڵکی پیاوێ بێ‌و بەس . جا هەر ئافرەتێ بێ. هەر بەو نیازە لە ژنە قەرەجێ نزیك دەبێتەوە، دەیەوێ ڕامی‌کا ! ئەلیکۆ لەوە ئاگا بۆیە تاوانێکی دووقات دەکا ژنەو مێردەکەی ویکڕا دەکوژێ . قەرەجەکان لەباتی ئەوەی تۆڵە لە ئا کۆ بکەنەوە ، نازانن چ بکەن ، شتی وایان نەدیوە ، بۆیە لە [illegible] هەڵدێن

**« ئێمە لە ناخەوە شەرمندەو دڵپاکین**
**تۆش بەستەو جەربەزەی**
**کەواتە کۆڵمان لێدە**
**ماڵ ئاواو بەخێر چی »**

ئیلیکۆی راکردو لە زیندانی شارستانییەت توانای ئەوەی نیە بگەڕێتەوە بۆ باوەشی سروشت .. جۆکۆفسکی دەربارەی ئەو شیعرە وتویەتی :

**« من هیچ شیعرێکی تۆم نەدیوە لە « قەرەجەکان » کاملتربێ ، بەڵام هاوڕێی خۆشەویست نیازت چی‌یە ؟**

**پێم نالێی بە هۆی ئەو پالەوانەتەوە دەتەوێ چی بسەلمێنی؟ نیشتمان پێویستی بە وێنەی نموونەیی‌و بەرزە ، ئەی ئەگەر پێچەوانەبێ چی لەوە خراپترە ؟ »**

پۆشکین وەك چۆن لەشیعردا هەوڵی رابەری دەدا لە نووسینی شانۆگەری یەفجینی ئۆنیجینن .. یشدائەو نیازەی هەبوو . بۆ ئەوەی بابەتەکەی وردو خورد بێ‌و کەلێنی تێدا نەبێ بەلگەنامەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدەی بەسەرکردەوەو لێکۆڵینەوەکانی خوێندنەوە . ئەم شانۆگەریە بەسەرهەڵدانی شانۆی سوڤێتی دەبژێردرێ .

ئەمیش شەکسپیر ئاسا گوێ ناداتە کات‌و شوێن‌و کار ئەم تراژیدیەی بیست‌و چوار دیمەنەو چەندین ساڵ دەخایەنێ . هەموو جەماوەری شۆڕەوی بەشدارن ، تەنانەت قەیسەریش! لە ئاکامدا جەماوەر بەسەر قەیسەردا زاڵ دەبێ .. رووداوی ئەم بەسەرهاتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1598) .

## شیعری پەیامبەر

ساڵی 1825 ئەلیکسەندەری یەکەم مردو نیقۆلای بووبە رابەر .. پیاوێکی تابلێی دەست رەش . فەرمانی‌دا کۆمەڵێ لەسێدارە بدرێن بەتایبەتی ئەوانەی لە جووڵانەوەی دیسەمبەریەکاندا بەشداریان کردبوو .

لەوانە ریلیف بەر سێدارە کەوت‌و هەندێکی دیکەش بۆ سیبریا دوور خرانەوە . پۆشکین بە ناوی پەیامبەرەوە شیعرێکی شۆرشگێڕی نووسی .. لای پۆشکین .. پەیامبەر نامەی پیرۆزی ئاسمانی پێیەو لای شاعیریش نامەی پیرۆزی ئیلهام هەیە بۆیە لەیەك دەچن !

بەڵام کاتێ قەیسەر شیعرەکە دەبیستێتەوە راشکاوی ( پۆشکین )ی بەدڵ دەبێ‌و داوای دەکا بێتە لای.. پۆشکین لەبەردەمی قەیسەردا دەکەوێ‌و لە شیعری پەیامبەر ژێوان دەبێتەوەو بەلایەکی دیکەدا سەرەکەی دەسوورێنێ ! ئەویش لێی خۆش دەبێ .. پۆشکین ئەو شیعرەی بۆ دەنووسێ .

**کام دەنگی خوا بانگی کردم**
**بوەستە ئەی پەیامبەر**

**گوێ ڕادێرەو بڕوانە**
**ورەت دەخەمە بەر**
**زەوی‌و دەریاکان ببڕە**
**بەوشەکانم**
**ئاگر لە دڵان بەردە !**

لە هۆڵەکانی دیسکۆی مۆسکۆدا وەك پیشـەی بوو دوای گوڵپەرییەکان دەکەوت ، نەیەکێك‌و نەدووان . کۆمـەڵێکی وێکڕا خۆشدەویست ! بۆ ئەوە نا بیانهێنێ ، بەڵکو بەو تەمایەی شەوانی تاریکیان پێ سوورکا ! لە نامەیەکیا بۆ فیازیمسکی ئاوا بیروڕا دەربارەی ژنهێنان دەردەبڕێ :

« ئافرەت وەکی کڵاوێکی گەرمە تا سەرو گوێ داپۆشێ، ڕەنگبێ ئەوە هەر تۆ نەگرێتەوە .. من لەو بڕوایەدام ئەگـەر تۆ دەساڵێکی دیکە بە ڕەبەنی مابایەوە گەورەترو زیرەکتـــر دەبووی .. ژنهێنان دەروون دادەماڵێ ! »

پۆشکین لە شیعرە بەناوبانگەکەیدا « بڵاوبوونەوە » بـــە هەموو دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەرەکان هەڵشاخاوەو کەســـی نەبواردووە ، بەڵام وەك مرۆڤ ڕێزی نیقۆڵای یەکەم دەگرێ . ئەم شیعرەی دەتوت درەختێکی ســـەوزە گەڵاکانی ژەهرێکی کوشندە دەتکێنن

پۆشکین تێکڕا ئەو پارەو پوولەی لەکتێبەوە دەســـتی دەکەوت لە هۆڵی دیسکۆکاندا دەرخواردی مێزی سەماکەرانی دەدا . کەچی هەست بە تەنیاییەکی کوشندە دەکا .. لـــە نامەیەکا بۆ فیازیمسکی دەنووسێ :

« شوێنێکم نیە لیێ بحەوێمەوە .. خۆ گەر ڤینۆسی کچە هاوڕێت نەبایە پەتۆم نەدەدا . » ئەو ڤینۆسەی خۆش دەوێ‌و پۆشکین لەمێزی قومار دوور دەخاتەوە ، بڕێ شیعریشی بـۆ نووسی . « لەم دنیایەدا لە هەموو شتێ پتر لە ئافرەتە بۆشناخ‌و بەسۆزەکان دەترسێم ، بژی ئافرەتە دەست بڕەکان ! » .

ئەوجا کەوتە داوی ( ئانیت )ی کچی سەرۆکی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانەوە ، کەنیزەی شازادەش بوو . ناردیـــە خوازبێنی بابی قایل نەبوو ، بەو بیانووەی پۆشـــکین دەم لەسیاسەتەوە دەداو نیگەرانی بۆ کیژەکەی پەیدا دەبێ . پۆشکین بۆ ئەو کچە ناوی خۆی لەبیر چووبۆوە ! بەڵام لە دوایدا بۆ ، خۆی پاشەکشەی لێ کرد . ئینجا بە کاترین ـەوە دەنووسێ ، ناوبراو دەیزانی پۆشکین کابرایەکی پەیمان شـــکێنە پێی ڕاگەیاند تا دەستی لێ بکێشێتەوە ..

کاترین هەر بە کچی مایەوە ، پۆشکین ئـەوەی بۆ بە ئاوات دەخواست .. تا شیعری بۆ بڵێ‌و ناو بەناو دیدەنی بکا .

**« ناتالی » کچی پیاوێکی فەرمانبەر بوو لـــە وەزارەتی دەرەوە ، پۆشکین دەربارەی دەڵێ : « ئافرەتی جوانم زۆر دیون، بەڵام هی ئاوا ، هەرگیز ! ئای لەو چاوو ددان‌و گوێیانـــەی ! پارچەیە بوو لە جادوویی ، هەر ئافرەتێ چەندە جوانبایەو لـە لای ئەم بوەستایە ناشیرینی دەنواند » .**

پۆشکین لەساڵی ( 1828 )دا ئەوی لە مۆســـکۆ بینی ، شەوانە کراسێکی سپی دەپۆشی‌و ئەڵقەیەکی زێڕی لەقژی دەدا هەر لە خۆی دەهات ! دوای لێکدابڕانێکی چەند مانگە دیبەوە لەجاران جوانترو پاکتر دەینواند ، بەڵام کەس‌و کاری کچە لـە پۆشکین لالووت بوون دەیانوت :

**« هەژارە ، باشی باس ناکەن ، ڕاستە شیعر دەنووســێ بەڵام شاعیری چاك هەمیشە مێردێکی خراپە ! ســەروکەللەی ناشیرینە ، نینۆکەکانی دەڵێی شفرەن ، سەمایەکی نـــاجوان دەکا » .**

دواجار بە پۆشکین ـ یان وت دان بەخۆدا بگـرە ، کچە هێشتا کەڵکی شووی پێوە نیە . پۆشکین ڕۆژی بە پەنجـــە دەبژارد ، دەیخواست ماوەیە ڕووەو قەفقاس بڕوا تـا بەهۆی زەوی گولین‌و جەنگەڵی چڕو شاخی پڕ کانییـــەوە ئاهێکی بێتەوە بەر . چوو ، لەوێ ناسکترین شـــیعری نووسی .. جەنەڕاڵ نەیدەویست پۆشکین بچێ بۆ شەڕو لەتەك جەنگاوەرە دڵ ڕەقەکانا بژی ، ئەو دەیوت جیێ پۆشکین پەنا کتێبە ، ژیانی شاعیر لەوە بەنرخترە ئاوا بە هەرزانی لەدەست بێتەوە .

ساڵی 1829 میر میشرسکی بیری لە خوازبێنی ناتالی کردەوە، جۆنتشارۆف لە خۆشیا هەر ئەوە بوو باڵی لێ نـــەدەڕوا : دەترسا پۆشکین بێتەوە ، تەگەرە بخاتە کارەکەوە ، زوو زوو بە دیدەنی درێژخایەن بۆژۆیان کا . یان نامەی چوار لاپەڕەیان بۆ بنووسێ‌و دەستە لەرزۆکەکانی ببینن ئەوســـاش ئەو هیواو ئاواتە با دەیبا .

لە ناکاوێکا پۆشکین وەك دڵۆپە ســـەری وەدەرنایەوە ، لەدوورەوە هەواڵی ناتالی پرسی ئاخۆ لەماڵە . دایکی بـــەرەو ڕووی‌چوو !

هەموو شتێکی لێ پرسی هەر لە جوانی ناتالی ـیەوە تا ئاوو هەواو باران . بەڵام بێ ئەوەی باسی خوازبێنی‌بکا . ناتالی لـــە هەموو کاتێ‌لە گەڵی ساردتر بوو .

بەناچاری چووە بەرپێی کاترین‌و کـــەوتەوە ڕابواردن‌و شیعر نووسین . پاشی بەینێ نامەیەکی بۆ دایکی ناتالی نووسی، وەرامیان دایەوەو دڵیان نەرم بوو ناتالی بدەنێ .. ئەو هەموو

دنیایە بەشی شادی پۆشکینی نەدەکرد . لە شەشی مایسی 1830دا شیرینی خورایەوە . پۆشکین لە گواستنەوەی بووکی بەپەلە بوو دایکی ناتالی‌ش بە پێچەوانەوە دەستی پێ دەکرد . پۆشکین گەڕایەوە بۆ بۆلدنیۆ لە نامەیەکا دەڵێ : **یەفجین ئۆنێجین دووبەشی مابوو تەواوم کرد، سێ شیعرو.. سوارەی پیسکە ، دۆن جوانو زۆری دیکەم .**

یەفجین ئۆنێجین حەوت ساڵی خایاند .. باسی گەنجێکی بێ کارە ، ژیانێکی بۆش دەژی رۆشنبیرەو جلو بەرگی جوان دەپۆشێ .. کتێبی کتێبخانەکی خوێندۆتەوە . تەواوی ئەو ئافرەتانەی دەورو بەری خۆش ویستوون . شانسی خۆی مامی دەمرێو پارەو پووڵەکە بۆ ئۆنێجین.جێ دەمێنێ .لووتی دەبێ بە لووتی تانیاناوە کچە دێتهاتییەکی ساکار ، جوان ، گۆشەگیر . نامەیەك بۆ ئۆنێجین دەنووسێ :

« نامەت بۆ دەنووسم ، ئایا لەوە زیاتر چی‌کە ؟ دەخوازم گوێم لە دەنگە شیرینەکەت بێ ، وشەیەکت پێ‌بڵێم بەڵام دەڵێن تۆ گۆشەگیری هەموو شتێکی ئەم دێیە پەستت دەکا .. ئێمە شتێکمان نیە شانازی پێوە بکەین ، بەڵام حەز دەکەین بتبینین» .

ئەو نامەیە کار لەئۆنێجین دەکا . ئافرەتەکەی نەدی تا بۆی روون کاتەوە .. جگە لەمەش ئەم زۆر بەتەنگ ژن‌هێنانەوە نەبوو ، کێ دەڵێ کەسێکی دیکەی خۆش ناوێو ئەمی بیر ناچێتەوە ؟ )

پایزو زستان تێدەپەڕن جەژنی لە دایك بوونی تاتیانا نزیك دەبێتەوە بەو بۆنەیەوە بەرەبابی لارین ئاهەنگ رێك دەخەنو ئۆینجین بانگ دەکەن ، ئەویش دەچێو هەر لەوێدا چاو دەگێڕێ دڵی دەچێتە ئۆلگای دەسبر ـ دەزگیرانی هاوەڵەکەی . لنسکی پەست دەبێ و لەگەڵ ئۆنێجین لێیان دەبێ بەکێشەو لنسکی دەکوژێ .. پاشان ئۆنێجین هەست بە تاوانباری دەکاو دەڕوا .. تاتانیاو ئۆلگا ئەو کارە . دڕندەیەیان بیر نەچۆوە . دایکی تاتانیا بۆ ئەوەی کچەکەی بدا بەشوو ناردی بۆ مۆسکۆ لەوێ دەبێ بەژیش جەنەراڵێکی پیرەوە .. دوای چەند ساڵێ ئۆینجین دەگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ .. ژنێکی گەنج سەرنجی رادەکێشێ :

**« ئافرەتان لێی نزیك دەبنەوە**

**پیران بە دەمییەوە دەخنێنەوە**

**پیاوان خۆشیان دەوێو**

**بەرێزیکی زۆرەوە**

**چاوی لێ وەرناگێڕن »**

لە جەنەڕاڵ دەپرسێ ئەرێ ئەوە کێیە ؟ ئەویش وەرامی دەداتەوە : تاتیانای خێزانمە ! ئۆینجین نامەیە بۆ تاتیانا دەنێرێو باسی دڵە کوتێی خۆی بۆ دەکا ! وەرامی ناداتەوە . ناچار هۆل بەهۆڵ بەدوای تاتیانادا دەگەڕێ ، بە ناچاری لە دەرگای ماڵەوەیان دەداو لەبەر پێیا دەکەوێ ئەویش ماڵەکەی بۆ بەجێ دێڵێ :



■ **شانۆگەری** ■

* پۆشکین لە « پیسکەسوار »دا لە کوڕو بابێك دەدوێ تەواو پێچەوانەی یەکدین ، کوڕە تا بڵێی دەست بڵاو بابیشی تا خوا حز بکا پیاوێکی چەرم پیس . شەوانە تا سندوقە داخراوەکانی بەسەر نەکردایەتەوە خەوی لێ نەدەکەوت ..

کوڕەکەی هەڵوەدای کەیفو رابواردن بوو ، بابیشی ئاوا بیری دەکردەوە : « هەموو شتێ لەژێر فرمانی مندایە ، ئارەزووم لێ بێ دەتوانم شەیتان ئاسا تاریکی بەسەر دنیادا بێنم » . ئەم وەك پیسکەی مۆلیر مایەی پێکەنین نیە ، چونکە ترسناکە دوای چەند هەنگاوێ دەبەوێ بکاتە ئەمرێتی .

ئەم ناوەرۆکە ـ دەست تەنگی‌و دەست بڵاوی ـ لە ( مۆزارتەو سالێری )دا بەشێوەیەکی دیکە دەبینرێ . سالێری ئاواز دانەرێکی باش بوو ، بەهێواشی‌و لەسەرەخۆیی گەیشتە ناوبانگ پەیدا کردنی . هونەرەکەی خۆش دەویستەو لەرێگای داهێنانەوە خزمەتی دەکرد . بەڵام ( مۆزارت ) ی دڵو دەست ئاوەدان کاری هونەری گرانی نەدەزانی بەڵام لەبەر ئەوەی عەبقەرییەتی هەبوو ئەو شتەی سالیری شکی نەدەبرد . سالێری ئەوەی بە لاوە نەڵگی بوو .. وای لێکدەدایەوە ئەم عەبقەرییەتە زوڵمە خوا داوێتێ . مۆزارت لەپۆشکینی دەکرد . سالێری بەناوی هەموو ئەوانەوە کە عەبقەری نین‌و ناگەنە مۆزارت ،چونکە مۆزارت کەس نایگاتێ بشمرێ شوێنەکەی پڕ نابێتەوە بۆیە وا باشە بکوژرێ ، ژەهری بۆ بکاتە شەرابەوەو دەرمان‌داوی بکا .

* **لە ( میوانی بەردین ) دا**

« دۆن جوان »یش وەك مۆزارتە ، پیاوێکی سەیرە سەرکردەیەك دەکوژێو بەزمانی لووس (دونا ئانا) ی خێزانیشی فریو دەدا .. بەڵام نازانێ مێردەکەی کوشتووە . خۆ لە ئافرەتەکە دەکا بە پاپایەکی دینی . ئەمە لە کاتێکا دۆن جوان دوور خراوەتەوە بۆ ئیسپانیا .. بەڵام گوێ ناواتە ئەو بڕیارەو دەبەوێ لەسەر کێشییەکی دیکە راچێ . دۆن جوان لەهیچ

سلی نەدەکردەوە لە مردنو سزاو ئابرووچوون بێ باك بوو.. بەلای پەیکەری سەرکردەدا دەڕوا ، داوای لێ دەکا سەرێکی ( دونا )بدا کەچۆن چۆنی لە بلوەشی دۆستی تازەبدایە . پەیکەر سەری رەزامەندی دەلەقێنێ ، دۆن جوان کاتێ ئەوە دەبینێ دلی دادەکەوێ ، بەلام گوێشی ناداتێو وەسەرخۆی ناهێنێ .. دۆن جوان دەچێتە لای ( دونا )و کوشتنی مێردەکەی بە دروستی بۆ دەگێڕێتەوە کەچی ( دونا ) بێدلی ناکا ! دۆن جوان دەیەوێ بەهیوای دیدار بەجێی بێلێ ، لەو کاتەدا بە پرتاو پەیکەرەکە دێتە ژوورێو دۆن جوان لە بەین دەبا ، بەدەم ناوی ـ دونا ـ وەگیانی دەردەچێ .

## ئیڤان بلیکین :

کۆمەلە چیرۆکێکی کورتە ، تۆلستۆی لە بارەیانەوە دەلێ : « لەمێژە ئەوچیرۆکانەتان نەخوێندۆتەوە ؟ تکا دەکەم لەبەر من بیانخوێننەوە .. هەموو نووسەرێ پێویستە ئەو چیرۆکانەی بلیکین بە وردو خوردی هەلبەنگێنێ » .

## ■ ژنهێنانی ■

پۆشکین دەیویست لە گەل ناتالی جۆنتشارۆف ببێتە هاوسەر ، ئەو کچەی پێشتر ناوی هێناو نەیاندایە ، سووراو سوور دەیزانی ناتالی دلی پێی ناکرێتەوە ، بەلام دەیوت وردە وردە ئەچمە دلییەوە ! ئەو دەمەی سەرگەرمی خواستنی ناتالی بوو تێکرا ئەو گەردن زەردانەی هاتەوە یاد کە ئێستا لە گشت کاتێ خۆشتری دەوێن ، چونکە سایەی ناتالی ناتوانێ بیانشارێتەوە . نامەیەکی لە مۆسکۆوە بۆ دێ ، ئاوای وەرام دەداتەوە .

**ڕێی بەردەمم خەمناکە**

**کارو ئازارەکان**

**شەپۆلە پڕ لە هاتنو هاوارەکان**

**ئایندەمی پڕ کردووە**

**بەلام هاوەلان**

**وێڕای ئەمانەش**

**نامەوێ بمرم**

پۆشکین لە بەندەری ئارامی دەگەڕا ، بەلام نە لە مۆسکۆو نە لای ناتالی ئەوەی وەگیر نەکەوت .

ڕۆژی 18ی شوباتی 1831 شاییو زەماوەندی پۆشکینو ناتالی رێکخرا، خۆ دیارە ئەوەش پارەو پوولی کەرەنە، ئەمیش لەدارای دنیادا شیعری هەیە ! شیعریش ژنی پێنایە ! نامەیەکی بۆ بیلیف نارد تا پارەی بۆ بنێری هەزار رۆبلی نەوو دوو هەزاریشی لێرەو لەوێ دەسکەوت ، کەوتە شیعر هەراج کردنێ بۆ جلو بەرگی بووکێ ، تامانگێ خۆشیان گوزەراند ، بەلام لە زۆر شتا بە یەکەوە نەدەسازان . ناتالی جلو بەرگو مالو سەما ئەویش لە خەودا دەژیا ، رێی خەویش درێژەو پر تەگەرەیە . پۆشکین پاش ژن هێنانی رۆسیتی » کەنیزەی ئیمپراتۆر دەناسێو ئەو چاك لەپۆشکین دەگا ، پێکەوە مشت ومڕ لەسەر ئەو کتێبانە دەکەن خوێندویانەتەوە ، لە شیعر دەدوێن ناتالیش قرو قپ دادەنیشت ، بەلام ( غیرە )ی دەبزوێت .

ئیمپراتۆر بەرێکەوت ناتالی دیو جوانییەکەی لە کەللەدا !
شابانووی قەیسەر داوای لێکرد بێتە مالێ ، کاتێ زانیان پۆشکین بێکارە ئیمپراتۆر لە وەزارەتی دەرەوە کارێکی بۆ دۆزییەوە ، پۆشکین نەیزانی ئەو ماستە بێ موو نیە .

ئەو کاتەی ئەوروپا دەنگی نارەزایی بەرامبەر نیقۆلای یەکەم دەردەبڕی پۆشکین دوو شیعری بۆ نیقۆلا نووسیو هاوەلانی شەرمەزارکرد ! ئەم دوو شیعرەو چوونی بەردەوامی ناتالی بۆ سەمای کۆشکی تایبەتی ئیمپراتۆر ، تا لە باوەشی ئیمپراتۆردا تاوێ سەما بکاو دلی پێ بکرێتەوە ، ئەمانە دوو لەکە بوون بە ژیانی پۆشکینەوە .

ماوەیەك ناتالی پێی لە کۆشك بڕی ، کاتێ زانییان بەهۆی ئەوەوەیە گوایە پۆشکین رێی نادرێ بێتە ئەوێ یەکسەر ئیمپراتۆر بڕیارێکی تایبەتی بۆ دەرکرد ، تا بێتو کەس دەست نەنێ بەروویەوە . کوڕو کچێکیان بوو ، ناتالی بەبێ سەمای کۆشك نەدەژیا ، پۆشکین لە جەنگەی ئەو ژیانە سەیرەدا « دۆبرۆسکی ، کچە ئەفسەر، دواجار برونز سواری نووسی» .
وێڕای ئەوەش لە دلتەڕی خۆی نەکەوت .
پۆشکین لە چوونە ( بارەگای ئیمپراتۆر ) کەمی کردەوە ، هەر جارەش بەهانەیەکی دەهێنایەوە . تا پۆلیس سانسۆری لەسەر نامەکانی دانا ، جارێ ، لەیەکێ لە نامەکانیا گالتەی بە دامو دەزگا کردبوو ، خەریك بوو بیپێچنەوەو تووشی گێچەلی کەن ، جۆکۆفسکی فریای کەوت .

قەیسەر لەبەر ( ناتالی ) دلی هاتەوە جێی خۆیو سێ هەزار رۆلو شەش مانگ پشووی دایە تا لە میخائیلۆفسکی بە سەری بەرێ . ناتالی نەچوو لەگەلیا ، پۆشکین کەوتەوە کوڕێنی ، هەولیدا یەفجینی ئۆنجین تەواوکا ، شەوانی میسری بنووسێ تا دلرەقی کیلۆپاترا لەمیانەی ئەویندا باسکا،

دوایی بە پەخشانە چیرۆك كۆتایی هات . بـــە خەمناكییەوە گەڕایەوە بۆ مۆسكو .. ناتالی تەنیا بۆ خواردنو نوستنو جـل گۆڕین دەكەوتەوە مالیّ .

ـ ئەلیكسـەندەرینـ ی خوشكی كاروباری مالی بـەڕێوە دەبرد . كار گەیشتە جێیە پۆشكین بیّ پێزانین جووتە خوشكی وێكڕا خۆش بویّ . ناتالی دوای سیّچوار مندالیش ئیمپراتۆر كۆلی لیّنەدەدا !

، ،

سالی 1836 ناتالی دۆستێكی دیكـــەی بە ناوی ( جۆرج شارل دانتس ) دیبەوە ، لـــە ئافرەت فریواندندا كەســـی نەدەگەیشتیّ ، بە تایبەتی كانیّ ریّ بۆ كرایەوە بۆ هۆلەكـــانی سەما بچیّ .

پۆشكین تەنیا دانسێكی دەزانی ئەویش سەمای شیعربوو، نەدەچووە كابارەكانەوە . ناتالی كەوتە داوی ( دانتس )ەوە . پۆشكین هەردووكیانی خستە ژێر چاودێرییەوە . لە مالیشەوە پشێوی دەركەوت. ناتالی بە پۆشكینـی دەوت لەتەك خوشكما نیۆانت هەیە ! پۆشكین وای وەڵام دەدایەوە : تۆش لەتـــەك دانتســـدا ڕووت خۆشە !

**« نهێنیەك لەو ئافرەتە نەرمو ناسكو سپییانەدا هەیـــە تاكە ڕوانینو ئاماژەیە بۆ پیاو دەبێتە مایەی نەگبەتیو مالكاولی. بەنرخترین نیازی پیاوان ڕام كردنی ئافرەتانە ، شیعر كارێكی ناسەرەكییە .. » .**

پەیوەندی دانتسیو ناتالی گەیە جێیە پۆشكین ناچارما ، نامەیە بۆ دانتس بنووسیّو تیایا بلیّ باروو بەڕوو بـەرمەیدانی یەكتر بین . بابی دانتس كەلەكێكی واهی سازدا تا كوڕەكـەی لە هەڕەشەو گوڕەشەی ئەو شاعیرە قوتاری بیّ . بەناچـاری دانتس ملیبۆدا لە 10ی كانوونی دووەمی 1837دا كاترینـی خوشكی ناتالی بهێنیّ . بەو نیازەی بتوانیّ پتر لە ناتالی نزیـك بێتەوە . بەڵام پۆشكین چارەی نەدەویستو نەیدەخواســـت ببینیّ .

دانتس نەخۆشییەكەی جاران ســـەری لێدایەوە ، دوای ناتالی دەكەوتو لیێ نەدەبۆوە . ئەم باسو خواسە بوو بە قاوو لێرەو لەویّ كەوتە بەردەمو گوێی خەلكی !

■ ■

ڕۆژیّ ژنە ئەفسـەرێكی ناسیاو نامەیەكی نارد بـۆ ناتالی تابچێتە مالیان . ئەمیش چوو . كەچی دانتس لـــەویّ دەبیّ بەزۆرو بەخوایشت دەیەویّ دلی نەرمكا . پێی دەلیّ : بیّ دلیم بكەی خۆم دەكوژم . ناتالی خۆ بەدەستەوە نادا میوانێك لـەو دەمەیدا پەیدا دەبیّو ناتالی رزگاری دەبیّ . ئەم هەوالە بـــەر گوێی پۆشكین دەكەویّ . ناتالی بانگ دەكاو ئەویش لەنووكەوە بۆی دەگێڕێتەوە . پۆشكین لەداخا هەر ئەوە بوو نەدەتەقی . نامەیەك بۆ دانتس دەنێریّ تا بە چەكەوە بێتـــە مـــەیدانی . دەولەت ئاگادار بوو بەڵام خۆی لیّ وەئاگا نەهێنا بەو بیانووەی دەیانوت پۆشكین بكوژریّ ئەوە دەها باشتر ، بـرینداریش بیّ بۆ سیبریای دەنێرین .. بەیانی لە خورێنی دەرپەڕییە دەریّ . لە ڕێگا تووشی ناتالی هات بەڵام ڕووی لیّ وەرگێڕاو ناتالیش نەیدی .. وا نەبوایە دەشیا بیدوێنیّو پەشـــیمانی بكاتەوەو كارەساتەكەش نەقەومیّ . ڕۆژێكی تۆف . كڕەباش دەباوڕاند . لەكاتو دەمی خۆیدا گەیشتە مەیدانەكە چەكەكەی پڕكرد لـە گوللەو ویستی لە حەشارگەدا خۆی ماتكا . بەڵام دانتس زوو دەستی لیّ وەشاند ، كەوتە سەر بەفرەكە ، بەهەر كەشـــمە كەشمیّ بیّ دەستی ڕاستەی دانتسی بریندار كـــــردو دوو پەراسووشی شكاند ..

پۆشكین بە سەریدا بوورایەوەو خۆینی زۆر لەبەر ڕۆیی . گەیاندیانە خەستەخانە . ناتالی بەقژی بژو ڕەنگی هەلبزڕكاوەوە دەگریاو دەیزریكاند « نامریّ .. وا هەست دەكەم ئەو نامریّ » .

پۆشكین بەو دلە گەرمو گیانە هەرزەكارەیەوە .. بارگەو بنەی . بۆ ولاتی خامۆشان تێكنا ، مابووی سیو هەشت سال تەواو كا .. زۆر بیرو لێكدانەوەی شیعری لەتەك خۆیدا بـردو كەسانی وەك ئیمپراتۆر ، دانتس ، تاتیانا ، ناتالی ، نامـــە ، ئابڕو ، خوێن نەیانهێشت نامە پیرۆزەكەی كامڵترو بیّگەرد تر بیّو بەگەنجی سەریان پیّنایەوە . دروود بۆ گیانی پۆشكین ، ئەو شاعیرەی بۆ زیاتر لە حەفتا زمانی بێگانە وەرگێڕدراوە .

**نا ، من بە تەواوی نامرم**
**گیانم**
**گیتارەكەم**
**دوای خۆلەمێشو نەمان**
**دەژینەوە**
**لە چوارقورنەی دنیادا**
**ناودێر دەبم !**

---

*** ئەم وتارە كورت كردنەوەی كتێبی ( پوشكين ـ تاليف هنری ترويا .. تلخيص د. فؤاد ايوب ـ ه )**
**هەروەها كەلك لە كتێبی پوشكين وەرگێڕانی د. جميـل نصيف وەرگیراوە .**

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

شوان : ئامادەی کردوە

* دلشاد مەریوانی شاعیرو چیرۆك نووس و نووسەرو فۆلکلۆرزان و هونەرمەندە .
* 1947/3/28 لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە
* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لە شاری سلێمانی تەواو کردوە .
* دەرچووی کۆلێژی ئەدەبیاتی کوردی یە لە زانکۆی بەغا .
* ئێستا مامۆستای ئامادەیی یە لە شاری سلێمانی .



**[ خولیای ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و تاقیکردنەوەی ژیانی ]**

بەو ناونیشانەی سەرەوە مامۆستا دلشاد محەمەد ئەمین رۆژی چوار شەممە رێکەوتی 1983/3/9 لە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری لە هەولێر کۆرێکی پێشکەش کرد .

سەرەتا مامۆستا ( عبدالغني علي يحى ) بەناوی بەرێوەبەرایەتی ناوبراوەوە خۆش هاتنی لە دلشادو میوانەکان کرد ، دوابە دوای ئەو مامۆستا محەمەد ئەمین پێنجوینی کۆرەکەی گێراو وتی : گەلی برادەرینە کاروانی رۆشنبیری کوردیمان لەبن قەلاتی هەولێری لەشارە سەرسەختە دێرینەکەی کوردستان ، لەو شارەی کە 500 سال پێش لەدایك بوونی عیسی میدیەکان لە کوردستانی ئێران لە بناری سابلاغ و سەقزەوەو لە گەرووی گەلی عەلی بەگەوە بەسەر رەواندوزی ئێستادا هاتنە خواری ، تەپیان دایە سەرقەلاتی لەو ساوە بوو بەشاری کوردان .

ئەوسا وتی : ئێستا لاوێکی هوشیارو روو خۆشی بناری ئەزمڕو گلە زەردەتان پێشکەش ئەکەم .

( دلشاد مەریوانی یان جەنابی قطب الدین )

ئەوسا دلشاد زۆر بەوردی باسی تاقیکردنەوەکانی ژیانی تایبەتی خۆیی و سەردەمی منالی کردو ڕاستەوخۆ لەتەك زمان و ئەدەبی فۆلکۆردا ڕای گرت بیرەوەری سەردەمی منالی لە گەڕەکی ئەسحابە سپی شاری سلێمانی گێڕایەوە کە بەچ جۆرێ هاتۆتە پێش چاوی و بیری تیژی منالی چۆن لە گەلیدا ژیاوە .

دلشاد لە دەروازەی فۆلکلۆرەوە وەسفێکی [ ڕۆمانتیکیانەی ] گەڕەکی ئەسحابەسپی و کانی ئاسکان و جۆری ژیان و نەریتی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی کرد .

دوا بە دوای گێڕانەوەی ئەو بیرەوەریانە ، ئەوسا ڕاستەوخۆ هەنگاوی بەرەو دنیای فۆلکۆر ناو وتی :

داستان و ئەفسانەو چیرۆك باوکن و سۆزو ئەندێشەو وەفا بەدەست دایکەوەیە ، کەچی لەو سەردەمی منالی یەمدا بەناوی کتێب خوێندنەوەوە لەگردی سەیوان گوێم لەلاواندنەوەی ئەو ژنانە ئەگرت کە بۆ خۆشەویستەکانیان ( باوك ، برا ، مێرد ) ئەگریان و گەلێ جاریش ئەو ژنەی بەسەر تەنیا گۆڕێکدا ئەگریاو ئەکڕوزایەوە سەرنجی بۆلای خۆی ڕائەکێشام ، ئەوەیان واتە تا تەمەنی [ 12, 13 ] سالان هەنگاوی یەکەمی خولیاکەم بوو .

## « پرۆژەیەکی فۆلکلۆری »

**ئەوسا دلشاد وتی : هەنگاوی دووەمی تاقیکردنەوەکەم لەو ساتەوە سەری هەلدا لەسەودا سەری فولکلۆرەوە بۆ دانانی نەخشەی پرۆژەیەکی فۆلکلۆری لە سالانی** 1962 — 1968 وە ناومان نا : کۆمەلی بوژاندنەوەی سامانی ئەتەوەیی کوردو پرۆگرام و پەیڕەومان هەبوو ، ژمارەی ئەندمانی نزیکەی (20) ئەندام ئەبووین ، ئەمە وەك کارێکی هەرەوەزی و کۆمەلی ... بەلام نی لە دوای سالامی 1968وە کاری پرۆژەکە پەرت و بلاوبوو ، کارەکە کەوتە سەر هەول و تەقەلای تاکە کەسی ، تا سالی 1972کەلە کۆلێژی ئەدەبیات دەرچووم . لەمانگی 1972/10وە دەستم بەپرۆژەکە کردو لە 1982/2/11 . دا تەواو بوو ، بەشی یەکەمی بریتی یە لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی واتا گۆرانی یە (10) برگەیی یەکان ، هەروەها پەنجەی بۆ ئەوکێشانە برد کە لە ئەنجامی



بەرهەمەکانی

---

1 — فرمێسك و زەردەخەنە .
2 — یەکەم هەنگاو .
3 — دلدارانی شۆڕش .
4 — پێشوازی خاوەن شکۆ .
5 — دێر یاسین .
6 — بە پەنجەکانم ئەتبینم .
7 — ببن بەتیشك .
8 — سەمفۆنیای وەنەوشە .

ئەمەو گەلێ وتاری ئەدەبیشی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بلاوکردوتەوە .

بەرلەوەی دلشاد لە بابەتەکەی بدوێ مامۆستا محەمەد ئەمین پێنجوینی وتی :

ئەوانەی فۆلکلۆریان خۆش ئەوێت گەلەکەشیان خۆش ئەوێت ، هەردی مەزن ڕاستی وتوە کە ئەلێ :

**نازانی کە هەر پەنجەیێ لەم خاکی زەمینە**
**کولمی دەهەزار لەیل و ڕوومەتی سەد مەمو زینە**

کۆکردنەوەی فۆلکلۆردا دووچاری بوو ، لەوانە گێرمەو کێشەی ئەو پیرەژنانەی کە ئامادە نەئەبوون لەرووی بابەتەکانی فۆلکلۆرەوە بدوێن و وایان ئەزانی لەتەلەفزیۆندا نیشان ئەدرێن ... ئەوسا لەو هەوڵو تەقەلایانە دوا کە بەرلە ئێستا لەبواری فۆلکلۆردا دراون ووتی :

ئەو کارانەی لەمەوبەر پێشکەش کراوە ناتەواون و هەتا ئەوانەی کە بە ناوی ئەکادیمیەوە نووسراونەتەوە (إستيراد) ن ، چوونکە فۆلکلۆر دراسەی مەیدانی ئەوێت و بەدوای ئەو بیروڕایانەدا کۆمەڵێ سەرنجی وردی دەربڕی لەوانە :

* تەلەفزیۆن یەکەم دوژمنی فۆلکلۆرە ، چوونکە کابرا بە منالەکەی ئەڵێت : تەلەفزیۆن هەیەو ئیتر پێویست بەقسەی من نی یە ... بەو هۆیەوە مۆڵەتی حیکایەت خوان نامێنێ .

* ئەدەبی نەتەوەیی بەغەیری کورانی نەتەوەکەی خۆی ناکرێت ، سا ئەگەرچی ئەوکەسە زمانیش باش بزانێ ، چوونکە ئەو کەسە بێگانەیە شارەزای داب و نەریتی کوردەواری نی یە ... دوا بەدوای ئەو سەرنجانە چەند نمونەیەکی شیعری گۆرانی فۆلکلۆری پێشکەش کردو ئامادەی خۆی دەرخست بۆ وەلامی هەر پرسیارێك کە روو بەرووی ئەکرێتەوەو هەڵوێستی خۆی بەم جورە نواند :

* لاوك بەشێکی گرنگە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیداو مەسەلەی بەیتی (10) پەنجەیی لەناوچەی سلێمانی بەهێزە ، کەچی لە هەولێر یان کە بەرەو ژوورتر تر دێت ؛ لاوازەو ئەمە تەنیا لای خۆمەوە حوکم بەسەر ئەو بەیتانەدا ئەدەم کەچنگ من کەوتون و لەوەشە هی بەهێز هەبێت و من دەستم نەکەوتبن .

* بەلای منەوە سەرەتای داهێنانی گۆرانی فۆلکلۆری هی کارکردن بووە نەك گۆرانی ئاینی ، چوونکی مرۆڤ بەرلەوەی رووی بیرکردنەوەی لە ئاین و ئاینزادە بکات لەپێناوی مان و ژیانیدا کاری کردووە .

دوای وەلام ئەو پرسیارانە مامۆستایان : کەریم شارەزا ، مومتاز حەیدەری ، صدرالدين خۆشناو ، عەباس عەبدوڵلا ، مەغدید حاجی قسەیان کردو باری سەرنجی خۆیان بری .

**[ دکتۆر مەعروف خەزنەدار رای خۆی دەردەبڕێ ]**

دوای ئەوەی چەند مامۆستایەك بیروڕای خۆیان دەربڕی دکتۆر مەعروف خەزنەدار بەم جۆرە هاوبەشی کۆرەکەی کرد :

... ئیلتباس هەبوو لەقسەکانی دلشادو ئەوانەی قسەیان کرد ، چوونکە دلشاد باسی هونەری شیعری گۆرای کرد کەبریتی یە لە :

دوو نیوە دێر 5 + 5 دە پەنجەیی

سێ نیوە دێرەو وەستانی تیا نی یە ئەمەش هەشت پەنجەیی یە دوو نیوە دێر یان سێ دێر حەوت پەنجەیی یەو وتا دوایی ئەوسادکتۆر وتی :

فۆلکلۆر هی میللەتی کوردەو هیچ پێویست بە جیاوازی نانەوەی نێوان هەولێری سلیمانی ناکات

لە سەدەی نۆزدەهەم دواکەوتووترین میللەت لەئەورووپادا رووس بوو ، پێشکەوتوترین میللەت ئەینگلیزبوو ، ئەگەر لەهونەرو ئەدەبی ئینگلیزو رووس بکۆڵینەوە ، ئینگلیز بەزۆرلە 50٪ [ 50 ٪ ] وەرئەگرێ وەرووس لە [ 100٪ ] وەرئەگرێ ، جالەبەر ئەوە ئەگەر هەولێر کەمی هەبوو ، سلیمانی زۆری هەبوو ئەمە شتێکی تەبیعی یە و لە هەموو دلیا وایە ، ئێستاش سلیمانی شاعیری لەهەموو جێگایەك زیاترە ، نووسەری لەهەموو جێیەك زیاترەو زۆر تەبیعی یەو ئەوەی ئەوێ هی ئێمەیەو ئەمەی ئێرەش هی ئەوێیە ... هەروەها سەبارەت کاری رۆژهەلات ناسان دکتور مەعروف بەم جۆرە رای خۆی دەربڕی :

سەبارەت بەرۆژ هەلات ناسەکان من بەپێچەوانەی ئەوەوەم ، پێویستە ئەوان ( رۆژهەلات ناسەکان ) بەکاری کۆکردنەوەی فۆلکلۆر هەلسن و سەرکەوتنیان بۆ دوو هۆ ئەگەرێتەوە :

یەکەم : بەحەرف لاتینی شتەکانیان تەسجیل کردوە ، لەرووی تەصویری دەنگو ئەو قسەیەی ئێمە ئەیکەین و تەسبیت کردنی وەك خۆی ، فۆنۆلۆجی وەتیپی لاتینی بۆئەم کارە بەجێیە .

دووەم : رۆژهەلات ناسەکان تەجروبەو پراکتیکیان لە ئێمە زۆرترە چوونکە زۆربەیان فۆلکلۆری زۆربەی گەلانیان وەك نەتەوەی عەرەب و تورك و نەتەوەکانی ئێرانیان کۆکردوتەوەو لەم رووەوە لە ئێمە زیاتریان تۆمارکردوە .

هەروەها دوای بیروڕاو سەرنجەکانی دکتۆر مەعروف خەزنەدار مامۆستا دلشاد بەشێوەیەکی تێژو بروسکەیی وەلامی پرسیارەکانی دایەوەو کۆرەکە بەسەرکەوتوی کۆتایی هات .



( ئەمڕۆو دوێنێی ڕۆژ نامە نووسیی کوردی )

ڕۆژی چوار شەممە ڕێکەوتی 16/3/1983 لە هۆڵی بەڕێوەبەریتی ی ڕۆشنبیریی جەماوەری لە هەولێر ، کۆڕێکی ڕۆشنبیری ی لەلایەن نەقابەی ڕۆژ نامە نووسەکانی لقی کوردستانەوە بۆ مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم سازکرا ، مامۆستا ( سعید یحیی ) کۆڕەکەی بەڕێوە بردو سەرەتا بەم جۆرە دوا :

[ خوشك‌و برایانی بەڕێز ، میوانە خۆشەویستەکان ؛ بەناوی دەستەی بەڕێوەبەری نەقابەی ڕۆژ نامەنووسان لقی ناوچەی کوردستانەوە بەخێرهاتنێکی گەرمتان دەکەین ، ئامادە بوونتان لەم کۆڕە کە لقی نەقابەکەمان بە بۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزەوە لە بواری ڕۆژنامەگەری‌و کاروانی ڕۆژنامەی کوردیدا سازی دەکات .

ئەوسا کورتەیەکی ژیانی مامۆستا محەمەدی پێشکەش کرد بەوەی :

* لە ساڵی 1931 لە دێ خنجیلانەکەی بیارەی سەر بە ناوچەی هەورامان لە پارێزگای سلیمانی چاوی بەڕۆشنای ژیان هەڵهێناوە .
* لە حوجرەی فەقیات فێری خوێندن‌و نووسین بووە .
* لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردەوەو تاکو ئێستاش هەر ئەندامی ئەو یەکێتی یە یە .
* ئەندامی کارگێڕی نەقابەی ڕۆژنامە نووسانی عیراقە .
* پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژنامە نووسیی یەوە ، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1953 لە ڕۆژنامەی ژین لە سلیمانی ، پاشان ڕۆژنامەی هیواو ئازادی‌و ( صوت الاحرار ) و گۆڤاری چارە سەر کردنی کشت‌و کاڵ‌و گۆڤاری توتن‌و ڕۆژنامەی (التآخي) و برایی . ئەوسا بیری نوێ‌و گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد .
* گەلێ باسی جۆراو جۆری ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاو کردوەتەوە .
* چەند لێکۆڵینەوەیەکی لە کتێب‌و دیوانی کوردیدا کردوە ، لەوانە : دیوانی مەحوی‌و شیرین‌و خەسرەو و کتێبێکی لەسەر حاجی قادری کۆیی‌و چەند بەرهەمێکی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری دی هەیە .

دوای ئەوە مامۆستا محەمەد باسەکەی پێشکەش کردو سەرەتا وتی :

ژیانی ڕۆژنامە نووسی پەیوەندیەکی بەتینی بە داهاتنی چاپەمەنی‌و سەرهەڵدانی چەرخی ڕاپەڕین‌و پەیدابوونی بۆرژوای ئەورووپاوە هەیە ، بۆیە لەسەرەتاوە لە ئەورووپاوە دەست پێ ئەکا .

ئەوسا مامۆستا محەمەد بە شێوەیەکی وردو قوڵ باسی جیاوازی تێگرایی ڕۆژنامەی وڵاتانی سەرمایەدارو سۆشیالیستی کردو وتی : [ ئەوەی بە ئاسانی ئەتوانرێ دەست نیشان بکرێ ، یەك‌ڕایی هەموو ڕۆژنامەکانی هەر وڵاتێکی سۆشیالستی یە بەتایبەت ، لە بابەتە بە بایەخەکاندا ، خۆقورس گرتنە لە ئاست هەندێ بابەتی‌وا کە لەڕووی پەروەردە کردنی گیانی مرۆوە لای باری سەرنجی سۆشیالستی وەك شتێکی جوزئی ئەوەندەی بایەخ نی‌یە ، با ئەگەر بلاویش بکرێتەوە سەرنجی خەڵکێکی فراوان ڕاکێشی ، پەلە نەکردن بۆ ڕادەربڕین بەرامبەر بەڕووداوە گەورانەی ڕوو ئەدەن‌و حوکم لەسەردانیان پێویستی بەهەڵسەنگاندنی هەموو سەرێکیانە ، بەلام ڕۆژنامەی وڵاتی سەرمایەداری یان بۆرژوازی لە وڵاتێکدا کە لەژێر سیسێمێکی فەرمانڕەوای دیموکراتی بۆرژوازیدا بێ ، بە مەیدان دانی تا ڕادەیەکی زۆری پیشاندانی بیروڕای جیاواز ، بلاو کردنەوەی هەر جۆرە بابەتێ کە خوێندەوار زۆرتر ڕابکێشێ بۆ کڕینی ، بێ گوێدانە ئەوەی سوودی ئەو بابەتە بۆ کۆمەل‌و جەماوەر چەندە . ]

دوا بەدوای ئەوە سەبارەت بەو جیاوازی‌یە سەرەکی‌و گرنگانە دوا کە لەبەراورد کردنی ڕۆژنامەی وڵاتە سەرمایەدارو سۆشیالسیە کاندا دەری خست بە تایبەت لەم لایەنانەوە :

1 — ئازادی دەربڕینی بیروڕا .
2 — هەریەك لەوڕۆژنامانە لە چ ئاستێکی لێپرسینەوەی



سیاسی و ئەخلاقیدان .

3 – هەریەك لەو رۆژنامانە لەلایەن چ بەرەو كۆمەڵێكەوە دەرئەچێ ؟

4 – لەرووی سەرچاوەی دەرامەت و دارایی رۆژنامەكەوە .

5 – ناوەرۆك و بابەت و مەبەستی سەرەكی رۆژنامەكە .

6 – تەعبیر لە بیروراو مەبەستی كام بەرەو دەستەیان دەوڵەت و رژێم ئەكات ؟

مامۆستا محەمەد وتی : رۆژنامە دەورێكی گەورەو كاریگەر دەبینێ هیچ حیزبێك نی یە لەم جیهانەدا بتوانێ بێ لای كەمی بەبێ رۆژنامەیەك بژی كە بیروڕایێ بە جەماوەر بگەیەنێ و پڕوپاگەندەی بۆ بكات و لەناویاندا شەڕی دوژمنی لێ دوور نجاتەوە .

## ( ژیانی رۆژنامە نووسی لە عیراقدا )

مامۆستا محەمەد بە شێوەیەكی هێمن باسێكی وردی جیاوازی نێوان رۆژنامەی (30) ساڵ لەمەوبەرو ئێستا كرد لەرووی ، جۆری نووسین و بەكارهێنانی وێنەو زەنگوغراف و كلێشەوە ، دیسان بەوردی باسی تەكنیكی تازەو هونەری رۆژنامە نووسی سەردەمی كرد لەڕووی بەكارهێنانی جۆری كاغەزو رەنگ و چۆنیەتی مانشێت و دروشم و سەرناوی بابەتەكان و قەوارەو چەندی لاپەرەوە ، موحازیرلەم رووەوە وتی :

گەلێ لەوتەكنیك و داهێنانەی ژیانی رۆنامەگەری رۆژنامەی كوردی ناگرێتەوە ، چوونكە رۆژنامەی سیاسیمان نەبوە .

هەروەها سەبارەت بەرۆڵی رۆژنامەی كوردی لە رۆشن كردنەوەی رێگای سیاسی نەتەوەی كورد بە درێژایی مێژو وتی : لەم ڕووەوە رۆژنامە دەورێكی باڵاو دیاری بینیوەو بەنمونە پەنجەی بۆ رۆژنامەی كوردستان برد كە مقداد پاشا لە ساڵی 1898 دەری كردو وتی دوابە دوای رۆژنامەی كوردستان كاروانی رۆژنامە نووسی دەستی پێكرد بەنموونە لە بزدتنەوەی سمكۆدا ( رۆژی كورد ) و لە حوكمڕانی و خەباتی شێخ مەحمودا ( بانگی كوردستان و رۆژی كوروستان وبانگی حەق و ئومێدی ئیستقلال ) و لەسەردەمی كۆماری مەهابادا ( رۆژنامەی كوردستان ) و لە چەرخی پاشایەتیشدا (نزار) و (گەلاوێژ) و لە سەردەمی پاش شۆرشی ساڵی 1958 رۆژنامەی ئازادی وخەبات و كوردستان و رای گەل و رۆژی نوێی و دەنگی كورد و لە ساڵی 1967 بەدواشەوە رۆژنامەی برایی و نووسەری كوردو هاوكاری و بەیان و رۆشنبیری نوێی و زانكۆو بیری نوێن ( فیزەو رۆژنامەی كوردی )

لە رووی سەربەستی رۆژنامەی كوردی و گەیشتنی بەگەلی كورد ماموستا محەمەد وتی : ئەو ولاتانەی كەبەشێكی كوردستانیان بەركەوتوە ، زیاتر لەرووی سیاسەوە دۆست و هاوری و هاوبیری یەك بوون ، نەیان ویستوە كوردی ئەم بەشانە پێوەندیان بەیەكەوەبێ ، بەلام هێشتا هەر كەم و زۆر گەمیشتوونەیەك ، بێ ئەوەی داوای فیزە لەو كاربەدەستانە بكەن .

## « قۆناغی نوێی گەشەكردنی رۆژنامە نووسی كوردی »

لەم رووەوە بیروڕای مامۆستا محەمەد وایە : كە ئەو قۆناغی گەشەكردنە لەساڵی 1967 وە دەست پێ ئەكا ، ئەوەبوو لەگەڵ دەرچوونی رۆژنامەی تەئاخیدا یەعەرەبی (برایەتی) یش بەكوردی دەرچوو ، ئەم رۆژنامە كوردی یە هەم لەڕووی سیاسی یەوە دەورێكی گەورەی لە بلاوكردنەوری هۆشیاری نەتەوەیی و دیموكراتیدا گێرا ، نەك وەك رۆژنامەیەكی كوردستانی بەڵكو وەكو رۆژنامەیەكی عیراقیش بەكوردی .

هەر لەرووی گەشە كردنی رۆژنامە نووسی كوردی ئەوەشی هێنایەوە یاد كە بۆ یەكەمجار لەسەر ئەركی میری رۆژنامەیەكی رێك وپێكی هەفتانەی كوردی دەرچوو وەئیستاش مەودایەكی باشی خزمەتی زمان و ئەدەبە كەمانە .

موحازیر بەرلەوەی كۆتایی بە بابەتەكەی بمێنێ لەپێناوی پەرەسەندن و گەشەپێدانی ژیانی رۆنامە نووسی كوردی چەند پێشنیازێكی كرد لەوانە :

1 – رۆژنامەیەكی سیاسی چوار لاپەرەیی لە یەكی لە شارەكانی هەولێر یان سلیمانی و دهۆكدا هەبێ .

2 – چاپخانەكەی ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان بخرێتەكارو رۆژنامەو گۆڤاری پێ چاپكری .



«عەلی لەتیف»

3 – بایەخ پەکادیری لێهاتوو بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی میری بدرێ .

4 – لەهەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا سەرپەرشتیکەری زمانەوانی دامەزرێنرێ .

5 – هەولی یەکێتی ڕێنووس لەڕۆژنامەوە گۆڤارەکاندا بدرێ .

ئەمەو بەرلەوەی کۆتایی بە کۆڕەکە بهێنرێ ، ماموستا محەمهد بە شێوەیەکی تەڕو پاراو وەلامی ئەوپرسیارانەی دایەوە کە لێکرابوو شایانی باسە کۆڕەکە بەسەرکەوتوی کۆتایی هات .

# لە سلێمانی

- ئاسۆس -
ئامادەی کردووە

**پیشانگەی هونەرمەند عەلی لەتیف :**

● نەقابەی هونەرمەندان لقی سلێمانی لە هۆلی مۆزەخانەی سلێمانی لە رۆژی 1983/3/12دا بۆ ماوەی هەشت رۆژ پیشانگای هونەرمەند عەلی لەتیفی پێشکەش کرد ئەم هونەرمەندە لە سالی (1946) لە شاری سلێمانی لەدایك بووە . بەشداری زۆربەی پیشانگەکانی هونەرمەندانی سلێمانیو هەروەها پیشانگە هاوبەشەکانی هونەرمەندانی کوردی کردووە . لە سالی (1972)دا بەهاوبەشی لەگەل هونەرمەندان عەتا قەزازو کامیل مستەفاو عەلی الودی لە هۆلی ئوتێل ئاشتی لە سلێمانی



پیشانگای کردوتەوە .

● لە سالی (1975)دا خەلاتی سەرکەوتنی لەسەر «پۆستەری رامیاری» وەرگرتوە .

● لە سالی (1976) مەدالیای سەرکەوتنی لەسەر تابلۆی [کوردستان] لەبەغدا وەرگرتوە .

● لە سالی (1977)دا خەلاتی سەرکەوتنی لە پیشانگەی ماموستایانی هونەردا لەبەغدا وەرگرتوە .

● لە سالی (1980) خەلاتی لەسەر پۆستەری سالی کۆچی – 1400 – لە ئەنبار وەگرتووە .

● بەشداری پیشانگەی هونەرمەندانی کوردی لە ئیتالیا بەدوو تابلۆ کردووە .

● لە سالی (1982)دا خەلاتی سەرکەوتنی لە پیشانگەی ماموستایانی هونەردا لە بەغدا وەرگرتووە .

هونەرمەند «عەلی لەتیف» ئێستا ماموستای هونەرە لە قوتابخانەی گوێژەی کوران لە پارێزگای سلێمانی . لەم پیشانگەیەدا (23) تابلۆی پێشکەش کردبوو . ئەوانەیان کە سەرنج راکێشەر بوون ئەمانە بوون : کۆچ ، ئاوازێکی خەمگین ، دەربەدەری ، دایکایەتی ، شەوێکی زستان ، دلنەوایی . زۆربەی تابلۆکان ئاوێنەیەکی بێگەرد بوون کە بە روونی ژیانی نەتەوەکەمانیان تێدا دەبینرا . لە لاپەرەکانی دەفتەری تێبینی ئەم پیشانگەیەدا بینەرێ نووسیبووی : ئاواتم وایە چاوەڕوانیەکانت بێ هوودە نەبێ ، دایکان لە باوەشی گەرمو گوڕیانا کۆرپەکانیان پێبگەیەنن ، دەستو پەنجەی هونەرمەند سل لە «شالاوی ترسناك» نەکاتەوەو هەردەم لە برەو دابێ .

لەکاتێکدا کە پیشانگەیەکی هونەری وا لە شارێکدا دەکرێتەوە بینەرە ئاساییەکان چاوەڕوانی رای هونەرمەندە شارەزاکانن تا رێنماییان بکەنو سەرنجیان بۆ لایەنە رووناکەکانی تابلۆکان رابکێشن ، بەلام بەداخەوە کاتێ کە چاومان بە دەفتەرەکەدا گێرا رایەکی ئەوتۆمان تێدا بەدی نەکرد کە شیاوی هەلبژاردن بێ ، لەبەر ئەوە داوامان لە هونەرمەند «عەلی جولا» بەرێوەبەری پەیمانگەی هونەرە جوانەکان کرد کە ئاخۆ ئەم پیشانگەیە چۆن هەلدەسەنگێنێ .

لە وەلاما وتی : «لەکاتێکدا هونەرمەند باوەش بۆ جیهانێکی خۆش ئەگرێتەوە ، جیهانێك کە مرۆڤ تێیدا بە

